بەرگی ١

# ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان

## کۆمەڵە وتارێکە بۆ ڕۆژانی هەینی و بۆنە ئاینییەکان

لەنووسینی
عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز



چاپی دووەم
پوختە کراو و زیاد کراو

2012

# ئامۆژگاری
# بۆ خاوەن باوەڕان

## کۆمەڵە وتارێکە بۆ (جومعەکان)
## واتە ڕۆژانی هەینیو بۆنە ئاینیەکان


لەنووسینی

عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز


بەرگی یەکەم


چاپی دووەم

(پوختە کراوو زیاد کراوە)

٢٠١٢

# ناسنامەی کتێب

**کتێب : ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان**

**نووسین و ئامادەکردن : عبدالرحمن مەلا طە عبدالعزیز**

**نەخشەسازی : کۆمپیوتەری هیوا**

**چاپی دووەم ( پوختە کراوو زیاد کراوە ) ٢٠١٢**

**بەرگ: بەرگی یەکەم**

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٨٩ )ی

ساڵی ٢٠١٢ی پێدراوە

# (كورتە باسێك بۆ چا پی دووەم )

جا هەروەها سوپاس بۆ خوای گەورە و مەزن من خۆم بە بەختەوەر ئەزانم کە خوای پەروەردگار یارمەتی دام هەردوو بەرگی (کتێبەکە) بنووسمەوەو ئامادەی بکەم بۆ چاپ کردن چوونکە پێشتر (بەرگی یەکەمم) چاپ کردبوو لەچاپخانەی (الحوادث) لەبەغدا لەرێکەوتی سالآنی ١٩٨٦/٧/١ ی زایینی هەروەها (بیست و دوو) ووتارم نوسیبۆوە بەچاپم گەیاندبوو ئێستاش بەیارمەتی خوای مەزن (چل و هەشت ) ووتاری دیکەم نووسی کە (کۆی سەرجەمی) ئەکاتە (٧٠) حەفتا ووتاری تەواو بۆ (وەعظ) و ئامۆژگاری بۆ ووتاری هەینی ئەیکەمە دیاری بۆ بەردەستی ووتار بێژان و مامۆمستایانی بەرێزو (فەقیێ یە) خۆشەویستەکانم کە زۆربەیان ئەوەی من بناسیێ بەرگی یەکەمی خوێندۆتەوەو پەسەندی کردووە ، ئینجا داوایان لیێ کردووم کە بەرگی دووەمیشیان بۆ بنووسم و بەچاپی بگەیەنم بۆ خوێنەرە بەرێزەکان ئیتر منیش لە کانگای دڵمەوە داواکاریەکانم پەسەند کردووە .

خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەکمان بداتەوە ، ئینجا جگە لەمەش ئەوەی زۆر دڵخۆشی کردم ئەو فەرمایشتە بەرزو پیرۆزەی پێغەمبەری ئازیزمانە (ﷺ) کە ئاماژەی داوە: ( بەزانستێکی سوود بەخش کە دەبێتە خێرو سەدەقەیەکی هەتا هەتایی) یان باشترین دیاری کە دۆست بۆ دۆستی خۆی بنێریێ ئەم فەرموودە پیرۆزەیە کەوا عەبدوللآی کوڕی حەزرەتی عومەر (رەزای خوایان لێبێت ) ئەگێرێتەوە لە حەزرەت (ﷺ) کە فەرموویەتی ( مَا أهْدى مُسْلمٌ لأخيهِ هَدّيةً أفْضَلَ مِن كَلِمَةِ حِكمْةٍ يَزيدهُ الله

بها هُدىً أوْ يُرَدُّهُ عَنْ رَديءٍ) رواه البيهقي في (شعب الإيمان ) ، واتـه: ( لـەو دیاریانەی کە موسلْمان بینێرێ بۆبرای خۆی دیاریەکی وەها نییە بەنرخ تر بێت لە ووتەیەکی سوود بەخش کە خودا زیاتر ڕێی پێ (ڕۆشـن ) بکاتـەوە یا ببێتە هۆی لادان و پاراستنی لە زیان و گومراهی ) بـەلاّم ئـەوەش لـەیاد ناکەین و هەندێ ووتارەکان (باسەکانیان) زۆر درێژە بە (سێ ووتار یا چوار ووتار) ئـەبێ بخوێندرێتـەوە ئینجا (خطیب) واتـە ووتـار بێـژ خـۆی ئـەبێ (تەصرِوفاتی تێدا بکات چوونکە وتـاری کـورت و پـڕ مانـا پێغەمبـەریش (ﷺ) پەسەندی کردووە ، هەروەکو لە پەنـدێکی عەرەبیـشدا حوکـەمایان ئامـاژەیـان بـۆ کـردووە و ئەفـەرموون : ( خَـيرُ الكَـلامِ مـا قَـلَّ وَ دَلْ) وە داواکاریشم لەتۆی خوێنەری بەڕێز لە دوعای خێرو باشە بێبەشمان نەکەیت و(والسلام عَلَيكُم وَرَحمَةَ اللهِ وَبَرَكاتُهُ ، وَاللهُ مِن وراء القَصدِ – وَهوَ حَسبي الله وَنِعمَ الوكيل).

خزمەتکاری ئیسلام و موسڵمانان

بەندەی فەقیر

عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز

ئیمام و ووتار خوێنی ناحیەی دارەتوو قەزای بەردە ڕەش

٢٠١١/١٢/٧

# التقريظ

**بەناوی خودای گەورە**

سوپاس و ستایش بۆ خودای خاوەن دەسەلاتو کاربەجێ. درودو ڕەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەری پێشەوا دەست خۆشی لەمامۆستای ماندو خەمخۆر دەکەم، کەخەمخۆری ئەم ئیسلامەیە شەوو ڕۆژ خزمەت دەکات. دەست خۆشی بۆ هەموو (نوسینەکانی) بەتایبەتی ئەم (کتابە) بەناوی ئامۆژگاری بەرگی یەکەم و دووەم بۆ خاوەن باوەڕان، کۆمەڵە وتارێکە بۆ ڕۆژانی هەینی. وەئەم زاتە ماندوەو بەرێزە لەلای ئێمەو لای خوای گەورەش (انشاءالله) خوای گەورە دەفەرمووێ **﴿والَّذينَ أُوتوا العِلْمَ درجات﴾** (سورة المجادلة/١٣) وەپێغەمبەر (ﷺ) (**فضلُ العالم على العابد كفضلي على أدناكُمْ**) رواه الترمذي..

بۆیە دەڵێم تەنها ئەوەی بۆ خودا دەیکەی پەشیمان نی، بەلام ئەوەی بۆ غەیری خودا ئەیکەن پەشیمانی، خوایە ئەم پەرتووکەو نوسراوە بیکەیت بەزەخیرە قیامەت بۆ دوا ڕۆژی..

**خزمەتکاری ئیسلامو موسڵمانان**

**ملا مسعود ملا صديق كانى كوردەیی**

**٢٠١١/٩/٢١**

**پێش نوێژ و وتارخوێنی مزگەوتی**

**محمد فوزی لەهەولێر**

## بسم الله الرّحمن الرّحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله قد خلق عبادة متفاوتين في العلم والفهم وسائر شؤونهم قالَ تعالى ﴿ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَوٰةِ الدُّنْيَا ۚ وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ ﴾ الزخرف: ٣٢.

ولاشك أن الاستاذ السيد الملا عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز (الدزه‌يى الهرمزياري) أنّ كتبه يمتاز بكثرة المصادر أنما يدلّ على سعة فكره وإطلاعه على الاراء والفتاوي المرجحة وذوقه السليم في اختياره لكم والكلمات والنثر والشعر والمواضيع الحكمة والقصص المؤثرة قال تعالى (وَمَنْ يُؤتِ الحِكمة فَقَد أوتيَ خَيراً كثيراً).

وارجو من الله تعالى أن يكون كتابه هذا (ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان) صدقة جارية الى يوم الدين والميعاد وسائر أعماله الصالحة قال تعالى (وَمَنْ أحسن قولاً ممّن دعا إلى الله وعمل صالحا وقال إنني من المسلمين) اللّهم اجعله من خير الداعين الى الله برحمتك يأرْحم الراحِمين وصلى الله عَلىَ سيدنا محمدو على آله وصحبه وسلم آمين.

**(والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته)**

**كتبه الفقير**

**ملا يعقوب ملا عبدالرحمن حمد الهُرمزياري**

**إمام و خطيب جامع ابوبكر الصديق في اربيل**

**تاريخ ٢٠١١/٨/١٥**

بسم الله الرحمن الرحيم

(الحَمْدُ لله الـذي أحْـسَنَ الإنْـسانَ وَالْهمَـهَ الرَشْـدَ وَالبيـانَ وَمَنَحَـهُ العلـمَ وَالعرفان وَالصَلاةُ وَالسَلام علىَ سَيدِنا وَمَولانَا مُحَمدٍ الَذي أرسَلَهُ الله إلى كَافة الإنسِ والجان وَعلىَ آلهِ وَأصحابهِ البَرَرَة الكِرامْ أمَا بَعدُ فَقَدْ طَلَعْتُ عَلَىَ هـذا الكِتـاب الـوجيز (ئامۆژگـارى) تـأليف الأخ الـصالح وَالمُرشِـدُ الناصِـح (مـلا عبدالرحمن ملا طه) أيدَهُ الله بالعزِ وَالحَنانْ وَالـسَماحَةْ وَالغُفـرانِ فَوَجْدتُـهُ في غَايـة الحُـسْنِ وَالإتقـانِ وَالبَلاغـةِ وَالبَيـانِ سَـهْلُ المَـرامِ دقيـق الأحكـام يُـثلِج لِفوائِده الصدوُرَ وَيمْلئو بِهِ القَلْبَ الفَرَحَ وَالسروُرَ أَرْجُـو مِـنَ الله العَزيـزِ العَلـيم الرؤوفَ الـرحيم أنْ يَجعْـلَ سَـببُ الايمـانِ وَالإحْـسانِ وَالحيـاةِ وَالعُمْـرانِ لِكـلَ مَنْصَف مُوقِنٍ وَعَاقِلٍ مُؤمِنٍ).

كَتَبَهُ الفَقير الفاني

**عبدالله وسومليـاني**

الخطيب في جامع قرني في أربيل

١٩٨٨/٨/٢٠

بسم الله الرحمن الرحيم

((الحَمدُ لله رَب العَالَمينَ وَالصَلاةُ وَالسَلام عَلىَ مَنْ أصْطَفى مِنْ عِبادِه المُكْرَمينَ وبعدُ فَإن هَذا الكتاب (ئامۆژگاری بۆ خاوەن باوەڕان) جَديرٌ بأنْ يَنالَ إعجاب ذوي الالباب والبصائرِ لَمَا بَين دَفَتيهِ مِنْ حوارٍ وَعظيةٍ إرشادية وَالخُطَبُ المِنْبرية لِلْمُجتَمَعِ الحَالي فَضْلاً عَنْ حُسْنِ تَبْويبِهَا وَسَلامَةِ عبارَتِهَا وَرَصافَةِ أسلُوبِها وَجَزالَةِ ألفاظِهَا وَجَودَةَ أدائِها وَسهُولَةَ تَطْبيقِهَا حَقيقٌ بالمُؤَلف أنْ يشادَ بِذكْرِه كَثَرَ اللهُ مِنْ أمْثالِه وَجَعَلَهُ في عِدادِ المُحْسنينَ/ أمين)).

العبد الفقير

**عبدالعزيز حسين علي**

**امام وخطيب جامع شيخ كاك**

**في أربيل/ محلة آزادي**

**١٩٨٨/٨/٣٠**

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمْدُ للهِ الذّي جعل الموعِظَ تزكيةً لـقلُوب المُتّقينَ وايقـظ بالتّـذكير همـمَ العارفينَ.. قال تعالى لِنّبيه الأمـين ﴿ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ وأشـهد أنْ لاَ إلـه الاّ الله وَحـدهُ لا شـريك لَـهَ جَعَـلَ الـدّعوة إلى الهُـدى والنـصيحة للمسلمين من أفضْلِ القُربات وأرفعُ الدرجاتِ وأهم المُهمّاتِ في الـدّين وأشـهدُ اُنّ سَيّدنا محمداً عبدهُ وَرَسولُه الذّي بَشّر من أطاعهُ بالجنّة وأنذَر مَنْ عصاهُ العذاب المهين اللّهم صَلِّ وَسَلِّم عَلىَ سيّدناَ مُحمدٍ وَعَلَـى آلـهِ وأصـحابِهِ وَمَـنْ تمسك بهديه المُبين.

لـەپاش سـوپاس و ستایـشی خـوای گـەورە و میهرەبـان وەدروودوو (صلوات) لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرا بۆو لەدوایی هەندێ (ئەی برایـانی خاوەن باوەڕان) ئەمەوێ چەند ئامۆژگارێیەك بخەمە بەرچـاوی موسـڵمانان ئەگەرچی خامەکەی من شایانی ئەوە نییە هەروەك نووسـەرێك لەپەندێکدا بەعەرەبی دەڵێت.

(ولكـن أردتُ التـشبّه بالوعّـاظ والمُرشِـدينَ الاعـلام فـان التـشبه بـالكرام فلاح).

واتە (بەڵام ویـستم لاسـایی پەنـدارەکان و ڕابـەران و زاناکـان بکەمـەوە چـونکە بەڕاسـتی لاسـایی بـەڕێزان گـەورەکان ڕزگـاری و بەختەوەرییـە هەروەها پێویستە لەسەر هەموو خاوەن باوەڕان فـەرمان بەچـاکە بکـەن و قەدەغە لەخراپە بکەن بەتایبەتی مامۆستایانی ئاینی چونکە خوای گـەورە

فـەرمان بەپێغەمبـەر (ﷺ) ئـەکات وەپێـی ڕائەگەیـەنێت و دەفـەرمووێت لەقورئانی پیرۆزدا.

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَـٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ﴾

سـورەی النحـل ئایـەتی ١٢٥ واتـە (بانگـەوازی خـەڵك بکـە بـۆ ڕێگـەی فەرمان بەرداری خوا بەووتار و کرداری باش و ئامۆژگاری جـوان و پەسـند وەموناقەشـەیان لەگەڵدا بکـە بەچاکترین شـێوە) هـەروەها پێغەمبـەریش (ﷺ) لەبارەی ئامۆژگارییەوە دەفەرمووێت:

(الدينُ النصيحةُ قُلْناَ لِمَن؟ قـالَ للهِ وَلِكتَابـِهِ ولِرَسُـولهِ والأئمـةُ المُـسلمِينَ وَعامتِهِمْ).

رواه مـسلم واتـە: (ئـاین بریتییـە لـەوە کـەئامۆژگاری خـەڵك بکـەیت و وەدڵسۆز بیت بەرامبـەر بەخـەڵك وە خـەڵك بخەیتـە سـەر ڕێگـای ڕاسـت و دروسـت هەواڵـەکانی پێغەمبـەر (ﷺ) غـەرزیان کـرد بـۆ کـێ؟ فـەرمووی بەرامبەر بەخوا و قورئـان و پێغەمبـەر و پێـشەوانی موسـڵمانان و تێکـڕای موسڵمان) سوود و کەڵکی ئەم فەرموودە پیرۆزە ئەمەیە بەکورتی (یەکەم) ئامۆژگاری بەرامبـەر بـەخودا (ئەوەیـە) واتـە سـاغی و دڵـسۆزی بـۆ خـودا ئەوەیـە کـەبڕوات وابێـت ئـەو تـاك و تەنیایـە و بـێ هـەواڵ و هاودەمـە وەفەرمانـەکانی بـەجێ بهێنێـت وەلەفـەرمانی کردنـی دوور بکەویتـەوە (دووەم) ئامۆژگـاری و سـاغی موسـڵمانان بەرامبـەر بـە (قورئـان) ئەوەیـە باوەڕی پێ بکەی کەووتەی خودایە وەخوا ناردوویە سەر پێغەمبـەر (ﷺ) وەلەفەرمانی قورئان دەرنەچێ وە لەفەرمانی بکەی وەبەخەڵکی ڕابگەیەنی

(سـێهەم) ئامۆژگـاری و سـاغی موسـڵمانان بەرامبـەر بەپێغەمبـەر (ﷺ) ئەوەیە کەباوەڕت هەبێ خوای گەورە ڕەوانەی کردووە بۆتەمێ و (تەربیـە) کردنـی گـشت ئـادەمیزاد بـەتێکڕایی وەلەفـەرموودەکانی دەرنەچـیت و بەخـەڵکی ڕابگەیـەنیت وەلەڕەوشـتی ئـەو ڕەوشـت وەربگـری وەبەچـاوی (قـەدروو) ڕێـزەوە بڕوانیـە یـاران و (ئـال) و (بـەیتی) بکـەیت (چـوارەم) مەبەست لەساغی و دڵسۆزی بۆ فەرمانڕەوایانی ئیسلام ئەوەیە فـەرمانیان بەجێ بهێنێت یارمەتیان بدەیت لەسەر ڕاستی و ڕێگایان پیشان بدەیت بۆ کـردەوەی چـاك مـادام بـەگوێرەی فـەرموودەی خـوا و پێغەمبـەری خـوا بجولێنەوە (پێنجەم) مەبەست لەساغی و دڵسۆزی بـۆ گـشت موسـوڵمانان ئەوەیـە کـەدەبێت ڕێگایـان پیـشان بـدەیت و ئامۆژگارییـان لەسـەر چـاکە بکەیت کەسوود و قازانجی ئاین و دنیای هەیە هەروەها پێویستە بۆ هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینە تێبکۆشێ بۆ قازانجی گشتی بەتایبەتی ئامۆژگاری بەکەڵك بەگوێرەی زانیاری خۆی وەهەروەها پێویستە بۆ ئەو کەسەی کـەوا ئامۆژگـاری ئەکـەیت وەری بگرێـت و نـەی خاتـە پـشت گـوێ هەرچـەندە ئەگەرچی مرۆڤی ئامۆژگاری کەر کەم و کورییەکی هەیە لـەبارەی خۆیـەوە چونکە هەروەکو لەم بارەیەوە شاعیریش دەڵێت:

(اعْمَلْ بِقَولي وإن قَصرَتُ في عَمَلي)

(يَنْفَعُكَ قَوْلي وَلاَ يضرُكَ تَقصيرِي)

واتـە: (کـار بکـە بەووتـە باشـەکانم ئەگەرچـی کـەم و کـوڕیم هـەبێ لەکردەوە و کارم چونکە بەڕاسـتی ووتـەی بەکـەڵك و باشـم قـازانجی تـۆی هەیـە وەهـیچ زیـانی نییـە بۆتـۆ کـەم و کـوڕیم) ئومێـدەوارم لـەدەرگای

میهرەبانی خوای گەورە ئەم چەند ئامۆژگاریە ببێت بەمای (سعادەت) و بەختەوەری بۆ گشت موسڵمانان وەببێت بەچرای ڕووناکی بۆ هەردوو جیهان (آمین) خوایە گیرایی بکەیت.

والله أسال الباري عَز وجَل أنْ يَجْعَلهُ خالصاً لوَجهه الكَريم وَأنْ يَنْفَعَ بهِ المُسْلمينَ النفعَ العميم كَما أسألهُ تعالى أنْ يَجعَلهُ سَبَباً لفوزي ووَالدي وَإخواني وَجَميعَ المُسْلمينَ وَمَنْ يَسْعى بطَبعهِ وَنَشرهِ بالدرجاتِ العُلى في دارِ النعيم وَآخرُ دَعْوَانا أن الْحمدُ لله رَب العالَمينَ وَسلامٌ عَلى المُرسَلينَ).

تأليف العبد الفقير إلى رَحمة رَبه القَدير

**عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز**

امام و خطيبي ناحيەی دارەتو قەزای بەردە ڕەش

ناحية عشائر السبعة– قضاء عقرة

المصادف ١٩٨٦/٧/١ م

# ئامۆژگاری یەکەم

## باسی گەورەیی ( فەزائیلی ( سورەی ) الاخلاص )

(الحمدُ للهِ حَمْداً يوافي نِعَمَهُ وَيكافِىءُ مَزيدَهُ وَأشهَدُ أنَ لا إله إلا الله الواحدُ الأحَد الغَنيُ الصَمَدُ الذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولد وَلَمْ يَكُنْ لَـهُ كُفواً أحَـد وَأشـهَدُ أنَ سَيدنا مُحَمداً عبدهُ ورَسولهُ وَحَبيبَهُ صلى الله عليه وعلى آلهِ وَصَحبه وَسَلَمْ وَعَلى سائر أخوانـهِ مـن الأنبيـاء وَالمُرسَـلينْ ولآلِ كـل وَصَـحب كـل وَجَميـعَ المؤمنينَ الى يَوْم يُبعَثُونَ).

(بسم الله الرحمن الرحيم)

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان.

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ﴾

لە (صفوە التفاسیر)دا[1] ئەڵێت هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەمە بوو هەندێ لەبێ باوەڕەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەر (صلی الله علیـە وسـلم) پرسیاریان لێی کرد گوتیان (یا محمد) پێمـان بڵـێ خـودای تـۆ لەئاڵتوونـە لەزیوە لە (یاقووتە) لەدارە لەبەردە لەچییە ئینجا لەوەڵامی بێ باوەڕەکان خوای گەورە ئەم سورەتەی ناردە خوارەوە.

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾

---

(1) بڕوانە (صفوە التفاسیر) دانراوی (محمد علی الصابونی) لاپەڕە ٦٢ بەرگی سێهەم.

هەتا دوایی سورەتەکە (پوختەی مانای سورەتی).

﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾

واتە ئەی محمد (صلی الله علیە وسلم) تۆ لەوەلامی پرسیاری ئەو (کافرانە)دا بلّێ ئەو کەسە کەئێوە پرسیاری لەچۆنێتی دەکەن زاتێکی وایە تاك و تەنیایە (ئەحەدە) واتە یەکێکە وەکو (موشریك و) بێ باوەڕەکان ئەلّێن، دوو یا سێ نییە (الله)یە ئەو خوایەی کەبوونی پێویستە دوورە لەهەموو ژمارەیەك لەخۆی و لەهاوڕێدایانی بێ (شەریکە) وەنەهاوڕێی هەیە لەذاتا یا لە (صیفاتا) یا لەکردەوەدا ئەو زاتە کەناوی (الله) یە (صەمەدە) واتە گەورەیە کەچی لەکائیناتایە بێجگە لەخۆی بۆلای ئەو ئەگەڕێنەوە پەنای بۆ دێنن لەبەجێ هێنانی هەموو (موحتاجیەك) واتە پێویستییەکدا و ئەو نیازی بەهیچ کەس نییە کەسی لێ نەبووە وەلەکەس نەبووە وەنەش بووە بۆ ئەو یەکێك بەئەو بچی وێنەی وی بێت لەخوایتی و پەروەردگارا (حاشا ثم حاشا).

(**ئاگاداریەك**) هذه السورة تعدل ثلث القرآن.

واتە ئەو سورەتە ئاوتایی سێیەکی قورئانە هەروەك حەزرەت (ﷺ) لەفەرموودەیەکا (بەیانی) کردووە.

(عن ابي سَعيد الخدري (رض الله عَنهُ) أنَ رَجلاً يقرأ (قُلْ هُو اللهُ أحدٌ) يُرَددُها فلما أصبَحَ جَاءَ إلى رَسول الله (ﷺ) فَذكر ذلكَ له وَكانَ الَرجل يَتقالَها فَقاَلَ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) والذي نَفْسي بيدهِ انها لَتعْدل ثُلثَ القرآن) رواه البخاری واتە: ئەبوو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) ئەفەرموێت پیاوێ گوێی لەپیاوێ ئەبێ کەسورەی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ

﴿ أَحَـدٌ ﴾ ئەخوێنـد هـەر دووبـارەی ئـەکردەوە کـەڕۆژی لێ بـووە و (ئـەبو سەعید) هاتە خزمەت پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) عـەرزی کـرد لای وابـوو کەتـەنها خوێنـدنی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ کەمـە حـەزرەت (ﷺ) فەرمووی سوێند بەو (زاتە)ی کەگیانمی بەدەستە ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ ئاوتای سێیەکی قورئانە لە (جامع الاحکام القـرآن)دا[1] ئیمـامی (قـورطبی) دەفـەرموێت پاداشـتی خوێندنـەوەی سـورەی (الاخـلاص) بەقـەد خێـری سێیەکی قورئانە چونکە قورئانی پـیرۆز بـەش کـراوە بەسـێ بـەش بەشـی یەکەم (ئەحکامە) و بەشـی دووەم (وەعـدە و وەعیـدە) سـێیـەم (ئـەسما و صـیفاتە) وەسـوورەی ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ بەشـی سـێهەمی بەتـەواوی تێدایە لەسەر ئەم (تأویلە) وەرگیراوە لە (حەدیسی) ئـەبوو درداوە (خـوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(أنَ الله جَلَ وَعز جزأ القرآنَ ثَلاثةَ أجزاءٍ فَجَعَلَ (قُـلْ هُـو اَللّهُ أحـدٌ) جُزْئـاً مِنْ أجزاءِ القرآنِ)

رواه مسلم: واتـە: بەڕاسـتی خـوای گـەورە قورئـانی پـیرۆزی کـردووە بەسێ (جزئەوە) واتـە بەشـەوە وە ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَـدٌ ﴾ ی کـردووە بـە (جزئی) لەئەجزای قورئان.

قالَ الإمامُ القُرطبي هَذا نَصٌ وبِهذا المعنى.

(سُمَيتُ سورة الإخـلاصِ) واتـە پێـشەوای بـەڕێز (قرطبـی) دەفـەرموێت ئەمـە (نەصـە) وەلەسـەر ئـەم مانـا و (ئەساسـە) ئـەم سـوورەتە نـاونراوە

---

(1) بڕوانە تەفسیری ئیمامی (قرطبي) لاپەڕە ٢٤٧ بەرگی بیستەم.

بەسورەتی (الاخلاص) هەزار (ڕەحمەت) لەمامۆستا (مەولەوی) بێت[1] لەعەقیدەی مەرضیە دا دەفەرموێت.

بێ ئەمری مەناس حوضور کەمەناص

خاس بگرە ئەدڵ تەفسیری ئیخلاص

ئیجمالی دەویێ بۆ قەلبی سەلیم

لە (بسم الله الرحمن الرحيم)

وَصَلَى الله عَلى سَيدنا مُحمدٍ وَعلَىَ آله وَأَصْحابه وَالتابعِينَ إلى يَوْمِ الدين أمين.

---

(1) بڕوانە (العقیدە مەرضیە) دانراوی (عبدالرحیم مەولەوی) لاپەڕە ٥٧.

# ئامۆژگاری دووهەم
## باسی گەورەیی قورئان ئەکات

(الحَمدُ لله الذي أدبنا بالقُرآن الكريم وَهذب أخلاقنا بسنة صَاحب الخُلـقُ العَظيم وَدَعانا إلى مَكارم الأخلاق بالمَوْعظَة الحَسَنة وَالأسلوب الحَكيم فَقَال تَعالى (إن هَذا القرآن يَهْدي لِلتي هـيَ أقـوُم وَيبَـشر المُـؤمنينَ الـذين يَعْلمُـون الصالِحات أن لَهُمْ أجراً كَبيراً) وَصلى الله عَلَى سَيدنا مُحمَدٍ وآلـه وَصَحبه أجْمَعينَ).

ئەی برایانی خاوەن ئیمان بەڕاستی قورئانی پیرۆز دوایی (کتێبـەکانی) خوایـه یـانی دوایـی ئـەو قورئانـە (کتێبێکـی) تـر نایەتـە جێگـەی چـونکە پێویست نییە تاکتێبێکی تر بنێرێت واتە هەرچی پێویستی ژیانی مرۆڤ بێت هەمووی تێدایە لەهەموو بابەتێکەوە چونکە بەڕاستی ئەم قورئانـە بـەیانی هـەموو شـتێکی کـردووە وەك (حـووکم) و (ئـەحکام) و حـەڵاڵ و حـەرام و تەربیـە و (تـەعلیم) و چـاکە و خراپـە..هتـد.. وەهـەروەها (حـوکم) هـەر (حـوکمی) قورئانـە هـەتا دونیـا دونیایـە چـونکە زۆر لـەبێ باوەڕەکـان و (فەلاسفەکان) و موستەشرقەکان ویستیان کە (غەش) و خیانـەت بەرامبـەر قورئانی پیرۆز بکەن یان زیاد و کەمی بکەنەوە ناویەوە بەڵام ئامانجەکەیان سەرنەکەوت و وەسەریش ناکەوێ چونکە

بەڕاستی خوای گـەورە لەسـورەی (الاسـراء)دا دەفـەرموویت: قَالَ تَعَالَىٰ:

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ

﴿هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا﴾ ئايـــەتی ٨٨ واتە: تۆ بڵێ ئەی (محمد) صلی الله علیه وسلم ئەگـەر هـەموو ئـادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەوەی کـەوەکو ئـەم قورئانـە شـتێك دروسـت بکـەن و بیهێنن هەرگیز بۆیان ناکرێ با ئەگەر هەندێکیشیان پشتی هەندێکیان بگرن و بڵـێن واهێنامـان (سـەرنجێك) پێویـستە ئێمـە باوەڕمـان هـەبێ بـەو (کیتابانەی) کەخوا ناردوونی بۆ پێغەمبـەران (درودی خوایـان لەسـەربێت) ئەم کتێبانەش عیبـارەتن واتـە لـەم جۆرە پەڕاوانـە هـەروەکو پـەرتووکی (عەقائدا) نوسراوە[1].

(قالَ الامام النسفي في شرح العقائد (وَالكُتُب المنزلَـةُ مِـنَ اللهِ تَعـالى عَلـى رُسُله أربعة كُتبٍ وَمائةَ صحيفةٍ:

١- التوراةُ أُنزلَت على سيدنا مُوسى (عليه السلام).

٢- الأنجيل أنزل على سيدنا عِيسى (عليه السلام).

٣- الزبور أنزلَ عَلى سَيدنا داوُدَ (عليه السلام).

٤- القرآن أنزل عَلَى سَيدنا مُحَمدٍ (عليه الصلاة والسلام).

واتە ئەو (کیتابانە)ی خوارەوە پەروەردگار ناردوونی بۆ پێغەمبەرەکان (ﷺ) سەد و چوار (١٠٤) کیتابن یانی پەڕاون یەکـەم هـاتووە تـەورات بـۆ موسا پێغەمبـەر (ﷺ) هـاتووە سـێهەم زەبـوور بـۆ داود پێغەمبـەر (ﷺ) هاتووە چوارەم قورئانی پیرۆز ڕەوانە کـراوە بـۆ سـەر گـەورە و بـەرێزمان حەزرەتی (محمد المصطفی)ی نازدارمان (دروودی خوای لەسەربێت).

---

(1) بروانە (شرح النفسية في العقيدة الاسلامية) لاپەڕە ١٩١ دانراوی (الدكتور عبدالملك عبدالرحمن السعدی) وەبروانە (العقائد الاسلامية) لاپەڕە ١٦٠ (تأليف السيد سابق).

أما (الصحفُ) فهي مائة:

١٠- انزلت على آدم -ع-

٥٠- انزلت على شيت - ع-.

٣٠- انزلت على ادريس- ع-

١٠- انزلت على ابراهيم (عليهم الصلاة والسلام).

واته ئەم سەد (١٠٠) كتێبانەی تر مشهورن بە (صوحوف) هاتوونەتە خوارەوە بۆ ئەم پێغەمبەرانە (دروودی خوایان لێ بێت) دە سەحیفە لەوان بۆ حەزرەتی آدم (ﷺ) دە ١٠ بۆ حەزرەتی ئیبراهیم (درودی خوایان لەسەربێت) هاتوونەتە خوارەوە (ئاگادارییەك) ئەو سەد (سەحیفەی) کەبەیانمان کرد فەوتاون وە (تەورات)و زەبور و ئینجیل بەساغی نەماونەتەوە چونکە لەپاش وەفاتی (پێغەمبەرەکانیان) (علیهم السلام) زاناکانیان تێکیان داون لەسەر ئارەزووی پوچی خۆیان گۆرییان بەلآم لەراستیدا هەموویان هەر (کەلامی) خوان ئەوەندە هەیە کەقورئان لەهەموان گەورەترە چونکە هەروەکو پێغەمبەری ئێمە دوایی هەموو پێغەمبەرانە لەهەمووان گەورەترە قورئانیش دوای هەموو کتێبێکی (سەماویە) لەهەموان گەورەتر و هەموویان بەقورئان (نەسخ) کراونەتەوە بێ گومان (عەلەمیان) پێ ناکرێ هەروەك شاعیرێك لەعەقیدەی کوردیا ئەلێت:

قورئان و انجیل و تورات و زبور

صحف هەرچی بوو گەر کەم و گەر زۆر

مجموعیان بێ شك کەلامی خوان

بەڵام هەموویان نەسخن بەقورئان[1]

(سەرنجێك) بەڕاستی قورئان پیرۆزترین و گەورەترینی كتێبەكانی خوایە وەپێویستە تەنها ئەو بكرێ بەفەرمان ڕەوا و بەرنامە و یاسای گەلان و میللەتان چونكە هیچ زیادە و كەموكوڕێكی بەسەرا نەهاتووە نەووتەێك نە (جوملەیەك) هەرگیز بە (قەطعي) هەروەك لەم ئایەتە پیرۆزە دەرئەكەوێ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴾

سورەتی (الحجر) ئایەتی ٩ واتە ئێمە ئەو (زیكرەمان) یانی ئەو قورئانەمان (نازڵ) كردووە بۆ سەر پێغەمبەری خۆشەویست ئێمەش ئاگاداری ئەو قورئانە ئەكەین و لەوە كەبەدەست بۆ بردنی بێ باوەڕان و ناپاكان بفەوتێ و بگۆڕێ هەروەها پێویستە ئێمەی خاوەن باوەڕان ئەم قورئانە پیرۆزە بكەین بە (ئەساس) و بناغەی ئاین و ئیسلامو كاری پێی بكەینو خۆزگە بۆ ئەم كەسانە بزانن كە ئەم قورئانە (كەلامی) خوایە ئینجا ئەكەین بەسەر (مەشق) وریێرەوی خۆیانو چونكە راسترین وتەیە هەزار (ڕەحمەت) لەم كەسەبێ كەدەفەرموێ:

كتابُ الله أصدَقُ كلّ قيلٍ

رواه المصطفى عن جبرئيلِ

عَن اللوح المحيط بكل (شيءٍ)

عَن القَلم الرفيعِ عن الجليلِ

(وصلى الله على سيدنا مُحمدٍ وعلى آلهِ وأصحابه وأتْباعهِ إلى يَوم الدين)

---

(1) بڕوانە (عەقیدەی كوردی) لاپەڕە ٨ دانراوی شیخ (عبدالسميع).

# ئامۆژگاری سێیەم
## باسی نیەت و اخلاص ئەکات

(الحَمدُ لله أمرَ بالإخلاصِ واشهد أنْ لا اله الا الله وَحدَهُ لاشريكَ لَهُ جَعَلَ الاخلاص أمارة الايمان وَدليلُ التقوي اللهم صَلِ وَسلم وَبارك عَلى سَيدِنا مُحَمدٍ وَعَلى آله وأصحابهِ الذينَ اعتصموا بالله واخلَصوا دينهم لله السعادة في الدنيا والآخِرة) قال الله تعالى في القرآن الكريم)

واتە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ﴾

(سورەتی الزمر ئایەتی ١٤) واتە: بلّێ من هەتا لە ژیانـدابم هـەر خـوای پەروەردگارم دەپەرستم وە ئـەو پـەڕی دڵسۆزی دەنوێنم بۆ ئـەو دیـن و ئاینەی کە ئەو زاتە لای پەسەندە) (پوختەی) ماناکـەی ئەمەیە واتـە ئـەو کـردەوە و خواپەرسـتیانە کەئەیکـەن و پێویـستە زۆر بــە (اخـلاص) و دڵـسۆزییەوە بکرێـت وەکـردەوەی خـۆت لەهــەموو تـۆز و گــەردێ پــاك بکەیتـەوە وەلـەجێی بـەجێ کردنـی ئـیش و کـاری ئاینیـدا کـەس مەهێنـە بەخەیاڵتا کەلەگەڵ خوا بەرامبەری بکەیت چـونکە پێویستە کردەوەکانـت هەموو بۆ خوا بێ و بێ (عەیب) بێت).

وەلەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ﴾

سورەتی (البینـة) ئایـەتی/ ٥ واتــە فـەرمانیان پــێ نـەکراوە مەگـەر بـە

(عیبادەتی) بێ ڕیایی نەبێ بۆ خوا و (دینی) بەڕاستی هەر دینی ئیسلامە هەروەها حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(إنَما الأعْمالُ بِالنيات وأنَما لِكل امْرِىءٍ مَا نَوى) رواه الشيخان....هتد

واتە هەموو کردەوەیەك بەنیەت دروست ئەبێ هەر پیاوێ لەو ئیشەی کەئەیکا نیەتی چی بێ و (قەصدی) چی بێ ئەوی بۆ هەیە پێویستە ئێمە موسوڵمانان هەر کردەوەیەك و خواپەرستییەك کەئەیکەن و هەر بۆ خوا و ڕەزا بوونی خوا بێ چونکە ئەگەر بۆ خوا نەیکەن خوای گەورە لێمان (قەبوڵ) ناکات هەروەك لەفەرمودەیەکی (قودسیدا) و دەفەرموێت:

(أنَا أغني الشُركاْ عَنِ الشرك فَمَنْ عَمِلَ لي عَملاً أشْرَكَ فيهِ غيري فأنا بريٌ وفي روايةٍ (تَرَكْتهُ وَشِرْكةُ).

رواه مسلم واتە من بێ (ئیحتیاجم) لە (شەریك و هاوبەش) وەکردەوەیەکم ناوێ کەبە (ڕیایی) بکرێ و (غەیری) من لەوەدا بکرێ بەشەریك وەبەشێوەیەکی تردا دەفەرموێت هەر (عەمەل) و کردەوەیەك ئەو کەسەی کەبە (ڕیایی) ئەیکا گیرا نابێت چونکە (مەردوودە) لەتەرەف جەنابی (باریەوە) [1] چونکە لە (شەرحی) ئەم فەرمودە پیرۆزەدا دەفەرمووێت خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا دەفەرموێت بەو کەسانەی کەڕیایی واتە بەرچاوی ئەکەن.

وە پێیان ئەفەرموێت : (إذهَبُوا إلى الذينَ كُنتُمْ تُراْ ُ ونَ في الدُنيا أنظرُوا هَلْ تَجِدونَ عِندَهُمْ جزاً ٌ)

---

(1) بروانە (الاتحافات السنية بالاحاديث القدسية) دانراوی (عبدالرؤف) (المناوي) ل ٨١/٨٠ بەدرێژی باسی (شەرحی) ئەم فەرمودەیە ئەکات.

واته برۆن بۆ لای ئەو کەسانەی کەئێشتان بۆ دەکردن لەدونیادا ئایا ئەوانە (ئەجر) و پاداشتان پێ دەدرێتەوە هەروەها ئەبوو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت گوێم لەپێغەمبەر بوو (صل الله علیه وسلم) دەیفەرموو:

(إنَ أول الناسِ يُقضي يَومْ القيامةِ عَليه رَجلٌ إستَشهَدَ فأتى به فعرفة نعمته فعرفها قالَ فَما عَملتَ فيها؟ قال قاتَلتُ فيكَ حَتى إستَشهَدت قالَ كَذبْتَ وَلَكِننَكَ قاتَلتَ لُيقُل جرَيء فَقَد قِيلَ ثُمَ أمرَ به فَسُحَب عَلىَ وَجهِهِ حتى ألقي في النّارِ).

واته یەکەم کەسێ کەخودا لەڕۆژی دوایی پرسیاری لەگەڵ دەکات پیاوێکە شەهید کراوە لەشەڕی گاوراندا خوا پێی دەڵێ وەرە بزانم بەو (نیعمەتەی) کەبەئێوەم بەخشی چیت کردووە؟ دەڵێت خوایە لەڕێی تۆدا شەڕم کردووە هەتا شەهید کراوم خودا دەڵێ درۆت کرد بەڵکو شەڕت کرد بۆ ئەوەی بڵێن پیاوێکی ئازا و زیرەکی پاشان خودا دەفەرموێت بیگرن و لەسەر دەم و چاو ڕایبکێشن بیبەن بۆ دۆزەخ ئەی فریشتەکان) وەدەفەرموێت:

(وَرَجلٌ تَعَلمَ العِلمَ وعلمهُ وَقرأ القُرآن فأتى به نِعَمَهُ فَعَرفَها قالَ فَماذا عَمِلْتَ فيها؟ قالَ تَعلمتُ العلمَ وعملتهُ وقَرأتُ فيكَ القرآنَ قالَ كَذبْتَ وَلكنكَ تَعلمتَ العِلمَ ليقالُ عالمٌ وَقرأتَ القرآن لِيُقال هُوَ قاريء فَقَد قيلَ ثُمَ أمرَ بِهِ فسَحبَ علىَ وَجهِهِ حَتى ألقْي في النّارِ).

واته پاشان پیاوێك خوا پێی دەڵێ وەرە بزانم چۆن ئیشت بەو (نیعمەتەی) خوا کردووە ئەویش دەڵێت من فێری زانیاری و خوێندنەوە

قورئان بوومە خەڵکیشم فێرکردووە تەنها بۆ ڕەزامەندی تۆ وەبەرزی ئاینی ئیسلام خواش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت درۆ دەکەی بۆیە قورئانت خوێند تابڵێن قورئان خوێنێکی باشە و دەنگی خۆشە بۆیە فێری زانیاری بوویت تا بڵێن زانایەکی چالاك و زیرەکە پاشان خوا فەرمان بەفریشتەکان دەکات دەفەرمووێت لەسەر ڕوو ڕابکێشن بۆ دۆزەخ وەدەفەرمویێت:

(وَرَجلٌ وَسعَ الله عَليه وَأعطاهُ مِنْ أصناف المال كُلّه فَأتَى به فَعَرفةُ نِعَمهُ فَقالَ فَماذا عَملتَ فيها؟ قالَ ما تَركْتُ مِنْ سَبيل تُحب أن ينفق فيهاَ إلا انفقت فيها قالَ كذبتَ ولكنكَ فَعْلتَ لِيُقالُ هو جَوادُ فَقَد قيلَ ثُم أُمرَ به فَسُحبَ عَلىَ وَجهة ثُمَ أُلقيَ في النّار).

رواه مسلم والترمذي والنسائي: واتە پیاوێکی تریش دێنن کەخودا ماڵێکی زۆری پێ داوە پاشان بانگی دەکا و دەڵێت چۆن ئیشت بەو (نیعمەتەی) من کردووە؟ ئەویش دەڵێت خوایە لەڕێی تۆدا بەخشیم ئەوەی تۆ حەزت پێ کرد من بەخشیم پاشان خوا وەڵامی دەداتەوە وەدەڵێت درۆت کرد بۆ ئەوەی ماڵت بەخشی تابڵێن پیاوێکی سەخی و نان دەرە لەپاشان خوا دەفەرمووێت لەسەر ڕوو ڕایکێشن بۆ دۆزەخی سوتێنەر.

لە (کۆتایی) دا ئەی برایانی خاوەن (ئیمان) بەڕاستی بەندە فەرمانی پێ کراوە کەبەندایەتی خوای تاك و تەنیا بکا و بەڕاستی و بەدڵسۆزییەوە بەندایەتی و خواناسی ڕاستەقینە ئەوەیە کەبەتەواوی هەر بۆ (ڕەزامەندی) خوابێ و هیچی تری تێکەڵاو نەبێ و بەس، هەروەها مامۆستا (نامی) لەکتێبی (بەهار و گوڵزار)دا لەلاپەڕە ٤٧دا دەڵێت:

ڕۆڵەم کردەوە بەمەبەستی پاك

پایەت بەرز ئەکا لای خودای بێ باك

بێ نیازی پاك واتە بێ ئیخلاص

مەحاڵە بۆ تۆ ڕزگاری و خەلاص

کردەوە وێنەی شیرێکی خاوە

شیری بێ هەوێن قەت نەگیرساوە

سەد ساڵ تێکۆشی بەکرداری خۆت

ئیخلاصت نەبێ سودی نابێ بۆت

(وصَلی الله عَلی سَیدِنا مُحَمدٍ وَعَلی آلهِ وَصَحبه وَسَلَم).

# ئامۆژگاری چوارەم
## باسی فەزڵ و گەورەیی زانست و زاناکان
## واتە فضل العلم والعلماء ئەکات

(الحَمدُ للهِ الذي عَلمَ الإنْسانَ مالَم يَعْلَم نَحمدَهُ وَنَشكرهُ وَنَتوبُ إليه وَنستَغفرَهُ وَنَسألَهُ أنْ يُعَلمَنا مالَم نَعلَمُ وَأن يَجعَلَنا مِن العالَمينَ العاملينَ وَرَفَعَ دَرَجةَ العُلَماءِ وَجَعَلَهُم كالغَيْثِ يَنفَعُونَ العباد اللهم صل عَلَى سَيدنا مُحَمدٍ خَاتَم النَبينَ وَإمام الناصحينَ وَأصدَقُ الواعظينَ وَأفصَحُ القائلينَ وَعَلَى آلهِ وَأصحابهِ الذينَ اهتدوُا بِهَديهِ وَتَمَسكوا بِشرعهِ وَسَلمْ تَسليماً كثيراً).

قال الله تعالى في القرآن الكريم:

واتە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُاْ﴾

سورەی (الفاطر) ئایەتی ٢٨) واتە ئەوانەی کەبەڕاستی ئەترسن لەخوای گەورە و بەس هەر زاناکان و (عولەماکانن) وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ سوورەی (الزمر) ئایەتی ٩) واتە ئەوانەی زانان وەئەوانەی نەزانن وەك یەکن؟ واتە (وەك یەك نین).[1]

وە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

---

(1) بڕوانە (شەرحی) (تاج الاصول) دانراوی (الشيخ منصور علی ناصف) بەرگی یەکەم لاپەڕە ٦٠.

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴾

سورەی (العنكبوت) ئايەتی ٤٣) واتە ئـەم وێنانـەی نـاو قورئـان بـەيان دەكـەين بـۆ خـەڵكی ئـەوانيش تێـی ناگـەن مەگـەر زاناكـان نـەبێ وەلەجێگايەكی تردا دەفەرموێت:

﴿ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ﴾

سورەی (المجادلة) ئايەتی ١١) واتە خوای گەورە پلـەی ئـەو كەسـانەی (ئيمانيان) هێناوە لەئێوە بەرز ئـەكات وەئـەوانی خـودا (علمـی) پـێ داون زۆرتر پلەيان پێ ئەدات.

(وَعَن معاوية (رض الله عنه) قال: قال رسول الله– صلى الله علية وسلم–

لەمعاويە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە پێغەمبەر (درودی خـوای لێ بێت) دەفەرموێت:

(مَنْ يُريدُ الله به خَيراً يُفقهُ في الدين).

متفق عليە واتە ئەو كەسەی كەخوا بيەوێ بيخاتـە سـەر ڕێگـای خێـر و چاكە كارێكی وای بۆ دروست ئەكات كەشارەزای بكا لە (دين) و ئاينا.

عَن ابي هريرة رض الله عنه عن النبي (ﷺ) قال:

واتە لەئەبوو هورەيرە وە (خوای لێ ڕازی بێـت) دەگێڕدرێتـەوە دەڵێـت حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَن نَفسَ عَنْ مؤمنٍ كَربةً مِن كُرُبِ الدُنيا نَفس اللهُ عَنهُ كُربةً مِنْ كُربِ يَومَ القيامةِ)

واتە هەر كەسێك خەم و ناخۆشييەكی (دنيا) لەسەر موسڵمانێك لاببـات و پشووی پـێ بـدات خـوا خـەم و ناخۆشـييەكی ڕۆژی (قيامـەتی) لەسـەر

لادەبات و پشووی پێ دەدات.

(وَمَن يَسرَ عَلى مُعسرٍ يَسرَ اللهُ عَليه في الدّنيا وَالآخرة).

واتە هەر کەسێکیش سەختی بار بەسەردا کەوتوویەك لابدات خوا کاری (دونیا) و دوواڕۆژی ئاسان دەکات.

(وَمَن سَتر مسماً سَتَرهُ اللهُ في الدّنيا وَالآخرة)

(وَاللهُ في عَونِ العَبد ماكانَ العَبدُ في عَوْنِ أخيه)

واتــە هەرکەسـێك شـتێك بـۆ موسـڵمانێك بپۆشـێت خـودا (لـەدونیا) و (ئاخیرەتدا) شتی بۆ دەپۆشێت تا بەندە یاریدەی بـرای خـۆی بـدات خـوا یاریدەدەری ئەو بەندەیە دەدات.

(وَمَنْ سَلَكَ طَريقاً يَلتَمس فيه عِلماً سَهَل اللهُ لَهُ طَريقاً إلى الجنّة).

واتە هەر کەسێکیش ڕێگەیەکی وابگرێت کەپێی بگاتە (زانـستێك) واتــە (عیلمێك) خوا بەوە ڕێگەیەکی بەرەو بەهەشت بۆی تەخت دەکات.

(وَما إجتَمَعَ قَومٌ في بيتٍ من بيوتِ الله يَتلونَ كِتابَ اللهِ وَيَتَدارسونَهُ بَيَـنَهُمْ إلا نَزَلَتْ عليهُم السَكينَةُ وَغَشيْتهُم الرّحمةُ وَحفتُهم الملائكة وَذَكَرَهُم اللهُ فـيمَن عندَهُ).

واتە هیچ کاتێك نەبووە دەستەیەك لەماڵێك لەماڵەکانی خـودا کۆببنــەوە و (کتێبی) خوا (واتە قورئان) بخوێننەوە و دەوری بکەنەوە و فریـشتە دەورەی نەدابن و خوا ئەوانەی لەناو ئەو کەسانەدا ناوبردووە کەنزیکی خۆین.

(وَمَنْ بطأ بهِ عَمَلهُ لَم يُسرِعْ به نَسَبَهُ، أي لَمْ يَنْفعهُ نَسَبهُ الشريف العالي).

رواه المسلم والترمذي وابو داود) واتە کەسێکیش کرداری خـۆی پێـشی نەخات (واتە سستی لەکردەوە بکات) ئەوە نـاوی بـاو بـاپیرانی (بـەهانای) نایێت و خێرای ناکاتەوە و پێشی ناخات.

عَنْ أبي الدرداء قالَ سَمعتُ رَسولَ الله (صلى الله عليه وسلم)..

يقـولُ لـهُ ئـهبوو (درداوه) خـواى لێ ڕازى بێـت) دهڵێـت بيـستم لـه پێغهمبهرهوه (ﷺ) دهفهرموێت:

(مَنْ سَلَكَ طَريقاً يبتغي فيهِ علماً سَهَلَ اللهُ لَهُ طَريقاً إلى الجنّة).

واته ههر كهسێك ڕێگايهك ببرێـت بـۆ دهسـت خـستنى هـهر زانيارييـهك خواى گهوره ڕێگايهكى بۆ بهههشت بۆ خۆش دهكات.

(وأنَ الملائِكةَ لَتَضَعُ أجنِحَتَها لِطالب العِلمِ رضاءَ بِما يَطلبهُ)

واته فريشتهكان باڵى خۆيان لهژێر پێى خوێندهوارانى ئـاينى ڕائهخـهن لهخۆشى ئهو شتهى كهدواى كهوتون كهخوێندن و زانيارييه.

(وأنَ العالَمَ يَستَغفِرُ لَهُ مَنْ في السَموات وَمَنْ في الأرض حَتى الحيتان– أي السَمَك– في الماء).

رواه ابو داود والترمذي..هتد واته مرۆڤى زانا (ئههلى) ئاسمـان و زهوى داواى لێ خۆشبوونى بۆ دهكهن جگه لهمانه بهڵكو ماسـيهكانى نـاو ئـاويش داواى لێ خۆشبوونيان لهخواى گهوره لێ ئهكـهن هـهروهها بهتايبـهتى ئـهو زانايانـهى كهخـهڵك فێـره خوێنـدن و خوێندنـهوه ئهكـهن وه (دهرس) بـه (فهقێيان) و قوتابيان ئهڵێن ئهمانه شايانى ڕهحمـهتى خـوان هـهروهك لـه (حهديسا) حهزرهت (ﷺ) دهفهرموێت:

(إن الله وَملائِكَتَهُ وَأهل السَموات وَالأرض حَتى النَملةُ في جُحرِهـا وَحَتـى الحُوتَ لِيُصَلونَ[1] عَلَى مُعَلِم النّاس الخَيْرَ).

---

(1) وَصلاة الله عَليه وَرَحمتَهُ وَصلاةُ الملائِكَة إستِغفارُهُمْ لَهُ وَصَلاةُ أهل الأرض دُعاؤُهم لَهُ، بڕوانه (شهرحى التاج الجامع للاصول) تأليف (الشيخ منصور على الناصف) لا٦٥ ج١.

رواه الترمذي واته خودا و فریشتەکانی و خەڵکی (ئاسمانەکان) و خـەڵکی زەوی و هەتا مێروستان لەشارەکەیدا و (ماسی) واته نەهەنگ لەدەریادا تکا و نزا دەکەن بۆ ئەو کەسەی کەخەڵك فێری زانین و زانیاری دەکەن.

وفی (سنن ابن ماجة) عن عبدالله بن عمرو (رض الله عنه)

واته لەسونەنی ئیبن و (ماجة) وەدەگێڕێتەوە لەعەبدوڵڵا کوڕی (عـەمر) خوای لێ ڕازی بێت فەرموویەتی:

(خَرَجَ رسُولُ اللهُ (ﷺ) ذاتَ یومٍ مِن بَعض حجرة فَدَخَل المَسْجد فإذا هُوَ بِحَلْقَتَين أحَدَهُما يَقرَأونَ القرآن وَيدعوُنَ الله وَالأخرى يَتَعلمُونَ وَيُعَلمونَ)

واتـە ڕۆژێـك لـەڕۆژان پێغەمبـەر (ﷺ) لەماڵـەوە تەشـریفی چـوو بـۆ مزگـەوت کەسـەیری کـردوو (جماعـەت) واتـە دوو کۆمـەڵ دانیـشتوون لەمزگەوتدا کۆمەڵێکیان قورئان دەخوێنن و دەپاڕێنەوە لەخوا کۆمەڵەکەی تریـان فێرکـەری فێرخـوازان بـوون واتـە خـەڵکیان فێـری خوێنـدن و خوێندەواری ئەکرد.

(فَقالَ النَبي (ﷺ) كُل عَلَى خَيرٍ هؤلاء يَقـرأون القـرآن وَيَـدعُونَ الله فـإن شاء أعطاهُمْ وإنْ شاءَ مَنَعَهُم وهؤلاءِ يَتَعَلمُـون وَيعلَمـون وَإنَمـا بُعثـتُ مُعَلمـاً فَجَلَسَ مَعَهُم).

رواه ابن (ماجە) واته حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت هـەردوولایان لەسـەر چاکەن ئەوانـەیان کـەقورئان دەخـوێنن و دەپاڕێنـەوە لـەخوا ئەگـەر خـوا ئارەزووی لێ بێـت لێیـان وەرئـەگرێت وەئەگـەر ئارەزووشـی لێ بێـت لێیـان وەرناگرێت وەهیچ سوودێك ناکەن بەڵام کۆمەڵی دووەم خـەریکی فێرکـردن و فێربوونی زانیارین من ڕەوانـە نـەکراوم بـۆ مامۆسـتایەتی نـەبێت لەگـەڵ کۆمـەڵی دووەمـدا دانیـشت). (سـەرنجێك) ئـەی برایـانی خـاوەن بـاوەڕ

بەڕاستی ئاینی ئیسلام پێویستی کردووە لەسەر هەموو کەسێك بخوێنێ چونکە خوێندن ئەرکی سەرشانی هەموو کەسێکە هەروەك حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(أطلُبُوا العِلمَ وَلَو بالصين فأن طَلَبَ العِلمِ فَريضةٌ عَلى كُل مُسلِمٍ).

رواه (البيهقي والخطيب والديلمي) واتە داوای زانست بکەن یان بگەڕێن بدوای (عیلم)و زانست با لە (چین)یش بێت چونکە بەڕاستی فێربوونی زانست (فەرزە) لەسەر هەموو موسوڵمانێك هەروەها حەزرەتی (عەلی)یش (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

مَا الفَخرُ إلا لأهلِ العِلمِ أنّهم
عَلىَ الهُدى لِمَن إستهدى أدلاّءُ
وَقَدرُ كل امرىءٍ ماكانَ يُحْسنهُ
وَالجاهِلونَ للأهْلِ العِلم اعداءُ
فَفُزْ بِعلمٍ وَلا تَجْهَل بهِ أبَداً
فَالناسُ مَوْتى وَأهلُ العِلمِ أحياءُ[1]

(اقولُ قوْلي هذا واستغفر الله لي ولسائر المسلمين والمسلمات والاحياء منهم والاموات نبهنى الله واياكم من نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لِواء سيّد المرسلين)

---

(1) بڕوانە کتێبی (جواهر العقدين فى فضل الشرفين) للشيخ عبدالله الحسين (السمهودى) لاپەڕە ١٢٧ ئەم هۆنراوەیە گوتراوە حەزرەتی (على) بە (حسين) کوڕی گوتوە (خوایان لێ ڕازی بێت) وەبڕوانە کتێبی (مصباح الظلام وبهجه الانام) للشيخ الجردانى بەرگی دووەم لاپەڕە ٥٧.

# ئامۆژگاری پێنجەم

## باسی (تقوى) واتە پارێزگاری لەخوا ترسان ئەکات

(الَحمدُ للهِ وَليُ المُتَقين وَناصر المُؤمنين أستغفرهُ وَأشهَدُ أن لا إله إلا الله يُعز الصالحين وَأشهدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً رَسولَ الله شَفيعُ الأوائـل وَالأواخـرَ وَالصَلاةُ وَالسَلام عليه وَبارِك عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ الأتقياء الأكابر)

(أما بَعدُ أوصيكُم أيها المُؤمِنُونَ بِتَقوىَ اللهِ وَطاعَتهِ)

واتــە لــەدوای هەنــدێ ئــەی خــاوەن بــاوەڕان ئامۆژگاریتــان ئەكــەم بەپارێزگاری و لەخوا ترسـان وەبـە پـەیڕەوی كـردن لـەخوای پـەروەردگار بەهەموو شێوەیەك هەروەها خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾

سورەی (الحشر) ئایـەتی ١٨) واتـە ئـەی ئەوانـەی كـەبڕواتان هێنـاوە لەخوا بترسن وەهەموو كەسێك باوورد بێتەوە (بزانێ) چی پـێش خـستووە بۆ پاشەڕۆژی وەلەخوا بترسێ و بەڕاستی خوا ئاگـادارە بـەوە كەئەیكـەن، وەلەجێگایەكی تردا دەفەرموێت:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ﴾

سوورەی (الحجرات) ئایـەتی ١٣) واتـە ئـەی ئادەمیزاد ئێمـە ئێوەمـان دروست كردوە لەپیاو و ژنێكا واتە (لەئادەم و لەحەوا) وەكردمانن بەچـەند

گەل و نەتەوە و تیرەیەکەوە بۆ ئەوەی بەیەکا بژین و یارمەتی یەکتری بدەین بەریزتان بەلای خواوە ئەو کەسەتانە کە (تەقواو) خۆپاراستن و لەخواترسانی زیاتربێ هەروەها حەزرەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەفەرموودەیەکا دەفەرموێت:

(أكرمُ الناسِ أتقَاهُمْ)

رواه البخاري ومسلم/ واتە بەرێزترینی ئێوە ئەو مرۆڤەیە کەپارێزگاری و (تەقوای) زیاتر بێت وەلەفەرموودەیەکا دەفەرموێت (ئەنەسی کوڕی مالك) (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێت: پرسیاریان لەحەزرەت (ﷺ) کرد کێین؟ (ئالی) (محمد) فەرمووی هەموو کەسێکە لە (ئوومەتی مُحَمَد) کەپارێز لەگوناه ئەکات ئەمەش (دەقی) فەرموودەکەیە:

(عن أنس (رض الله عنه) سُئِلَ رَسَولُ الله (ﷺ) مَنْ آلُ مُحَمَدٍ فَقَالَ كُل تَقيٍ مِنْ أُمة مُحَمَد)

(رواه الديلمی) هەروەها (ریوایەت) کراوە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) گوتی بەحەزرەت (صلی الله علیه وسلم) ئەی پێغەمبەری خوا ئامۆژگاریم بکە حەزرەت (ﷺ) لەوەلاما فەرمووی تۆ پارێزگاری خوا بکە لەو بترسە چونکە پارێزگاری خوا سەرچاوەی (هەموو خێر و چاکەیەکە) سەرەتای فەرموودەکە ئەمەیە:

(عَلَيْكَ بتقوى الله فَأنهاَ جِماعُ كلّ خيرٍ...الخ)

رواه ابو یعلی...هتد) بەڵێ تەقوا و پارێزگاری سەرچاوەی هەموو خێر و بەش و بارەیەکی (دینیە) بەڕاستی تەقوا) پارێزە لە (کوفر) واتە بێ باوەڕی تا ئیسلامیەت بێتەجێ و (تەقوا) پارێزە لەتاوانی مەزن تاپلەی

ڕاستی و (عەدالەت) بێتەجێ بەم مانایە هەموو بارەیەکی بەر ئەکەوێ و لەکتێبی (النصائح الدينية والوصايا الايمانية[1]) دا دەفەرموێت:

(التقوى وَصية الله رب العالَمين للأولينَ وَالأخرينَ).

واتە پارێزگاری ئامۆژگاری پەروەردی گارە بۆ چینی پێشووی ئادەمیزاد وەبۆ چین دوایی ئادەمیزاد هەتا هەتایێ.

قَالَ ٱللَّهَ تَعَالَىٰ: ﴿وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ سورەی (النساء) ئایەتی ١٣١ واتە بەڕاستی ئێمە ئامۆژگاری ئەوانەمان کردووە کە (کیتابیان) پێ دراوە لەپێش ئێوەدا وەئامۆژگاری ئێوەیشمان کردووە کەلەخودا بترسن و خۆتان لەنافەرمانی بپارێزن هەروەها خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەگەلێك شوێندا باسی (تەقوای) واتە پارێزگاری کردووە هەریەکە بەشێوەیێك و چەشنێك هەروەك لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ﴾

سوورەی (التغابن) ئایەتی ١٦) واتە هەتا بۆتان دەکرێ لەخوا بترسن و پارێزگاری بکەن، وەلەجێگایەکی تردا دەفەرموێت:

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُ﴾

سوورەی (البقرة) ئایەتی ٢٨٢) واتە بەو چەشنەی خوا پێی خۆشە خۆتان بپارێزن وەلەخوا بترسن و خوای گەورە زانیاری ئەخاتە دڵ و

---

(1) بڕوانە کتێبی (النصائح الدينية والوصايا الامانية) دانراوی (الشيخ بركة الانام عبدالله باعلوى الحداد) لاپەڕە ٤٣.

دەروونتانەوە و پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت (أنا أعلَمَكُمْ بـالله وَاشـدُكُمْ لَـهُ خشيةً) وفی روایە:

(أنا أعرفُكُمْ باللهِ وَأخوَفكُم منهُ).

رواه البخـاری بالفـاظ مترادفـه[1] واتـه مـن لـەئێوە باشـتر خـوا ئەناسـم وەلەهەمووتان زیاتر لەخوا ئەترسم بەڕاستی ئەی برایانی خـاوەن (ئیمـان) خوای گەورە ئەو کەسانەی زۆر خۆش دەوێ کەپارێزگاری و (تەقوای) خوا ئەکەن وەلەخوا ئەترسن و وەخۆ ئـەپارێزن لەهـەموو گونـاه و خەراپەیـەك چونکە بەڕاستی چاکترین تۆشە (الزاد) پارێزگارییە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ فَإِنَّ خَيْرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقْوَىٰ ﴾

(سورەی البقرة ئایەتی ١٩٧).

(سەرنجێك) ووشـەی (تـەقوا) بـەمانا خۆپاراسـتن یـان پارێزگـاری وەك (سەید شریف) لەکتێبی (تعریفاتە)[2] دەفەرموێت هەروەها هەندێ زانایـان فەرموویانە (تەقوا عبارەتە) لەمە (گوێی ڕایەڵی فەرمانی خوای گەورە جێ بەجێ بکەیت وەخۆت بپارێزی لەنافەرمانی گەورە بەئاشکرا و نهێنی وەهەر لەو بترسێ و پەیڕەوی ئەو بکەیت) هـەروەك پرسـیاریان لەحـەزرتی (علـی کوڕی ئەبو تالب) (خوای لێ ڕازی بێت) کردووە لەبارەی (تەقواوە) ئـەویش فەرموویەتی:

---

(1) بڕوانە کتێبی (کشف الخفاء) دانراوی (شیخ ئیسماعیل عەجلوونی) بەرگی یەکەم لاپەڕە ٢٣١.

(2) بڕوانە کتێبی (التعریفات) دانراوی (السید الشریف علی بن محمد الجرجانی) لاپەڕە ٥٧.

(التَقوى الخَوْفُ مِنَ الجَليلِ وَالعَمَلُ بِالتَنزْيل وَالقَناعَةُ بِالقَليـلِ وَالإسـتِعدادُ لِيَوْم الرَحيل) [١] .

واته پارێزگاری ئەوەیە ترست ببێ لـە (جلیـل) یـانی خـاوەن جـەلال و گەورەیی واتە خوای مەزن وەکـار بکـەی بـەوەی هەناردوویەتیـە خـوارەوە ئەویش کە (قورئانی) پیرۆزە وەقەناعەت بەو (رزقەی) خوا پێی داوی واتـە (قەناعـەتت) ببـێ بەکـەم وەخـۆت ئامـادە و (موهـەیا)بـە کـەیت بـۆ رۆژی (قیامەت) واتە رۆژی دوایی هەزار رەحمەت لەم کەسەبێ کەفەرموویەتی:

تَـــزَوَدْ مِـــنَ التُقـــى فإنـــكَ لاتـــدري
إذا جَـــنَ الليّـــل هَـــلْ تَعـــيشَ إلى الفَجـــرِ
فكَـمْ مِـنْ فَتـىً أمـسى وأصـبَحَ ضـاحِكاً
وَقَـــد نُـــسِجَتْ أكفانـــهُ وَهـــوَ لا يـــدري
وكَـمْ مِـنْ صَـحيحٍ مَـاتَ مِـنْ غـيرِ عِلـةٍ
وَقَـــدْ قُبِـــضَتْ أرواحُهَـــا لَيلَـــة القَـــدْرِ
وكَـمْ مِـنْ صـغارِها يَرْتجـي طُـولَ عُمْـرِهِم
وَقَـــد أدْخلَـــت أجْـــسادَهُمْ ظُلمـــة القَـــبرِ [٢]

وَصَلى الله على سَيدنا مُحمدٍ وَعَلى آلهِ وأصحابه أجمعـين وَبـارك إلى يَـومْ الدين.

---

(1) بروانە کتێبی (الواعظ والارشاد) دانراوی (زین العابدین التونسی) لاپەرە ٣٩.
(2) بروانە کتێبی (انیس المؤمنین) دانراوی (صفوك سعدالله المختار) لاپەرە ٦٧.

# ئامۆژگاری شەشەم

## باسی ( خووڕەوشتی ) ( الأخلاق الحسنة ) ئەکات

(الحَمْدُ لله ميزَ مَن أحبهُ بِحُسنِ الخُلقِ أستغفرهُ وَأشهَدُ أنَ لا إلـه إلا الله خَلَقَ الإنسانَ مِنْ نُطفَةٍ ثُمَ مِنْ عَلَقَةٍ فَأبدعَ مَاخَلَقَ وَأشهَدُ أنْ سَيِدَنا مُحَمَداً رَسُولُ اللهِ بَعَثَهُ اللهُ بِشريعةِ الحُبِ وَالسَلام اللهم صَلِ وَسَلم وَبارِكْ عليهِ وَعَلى آله وَأَصْحابهِ نجومُ الهُدى وَمصابِيحَ الظَلامِ).

(ئـەی برایـانی خـاوەن بـاوەڕ) خـوای گـەورە لـەقورئانی پـیرۆزدا دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾

سورەی (الاحزاب) ئایەتی (٢١) واتە بەڕاستی هەیە بۆتان وەدەستان ئەکەوێ لەشوێن کەوتنتان بۆ پێغەمبەر خوا بکرێ بەسەر (مەشقی) خووڕەوشتی جوان و مامۆستای بەڕێز و پێشەوای شیرین و ڕاست. هەروەها (شێخ عبدالوهاب شعرانی) [1] لەکتێبی (تنبیە المغترین) دا ئەفەرموێت:

(وَمِنْ أخلاقِهِم (رضي الله عَنهُم) حسنُ خُلقِهم تَخَلُقاً بأخلاقِ رسول الله (ﷺ) وَعَمَلاً بِقَولهِ وَخالِقُ الناسِ بِخُلُقٍ حَسَنْ).

(رواه الترمذي) واتە یەکێك لەخووڕەوشتی بەرزی هەواڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) وەچینی دوای و پیاوکان ئاوابوونە چاویان لەخووڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) کردووە چونکە زۆر ڕووخۆش بوونەوە بەگوێرەی خووڕەوشتی

---

(1) بڕوانە کتێبی (تنبیة المغترین) دانراوی (الشیخ عبدالوهاب الشعرانی) لاپەڕە ١٣٤.

حـەزرەت (ﷺ) هەڵسوڕاونەتەوە وەكاریـان كـردووە بەووتـەی حـەزرەت (ﷺ) كەدەفەرمووێت: (خووڕەوشتتان باش بێـت لەگـەڵ هـەموو خـەڵكا) هـــەواڵێكی پێغەمبـــەر (ﷺ) بـــەناوی (نەواســـی) كـــوڕی (ســـەمعانی) دەفەرموێت:

سَأَلْتُ رسولُ الله (ﷺ) عَنْ البر وَالإثم.

واتە پرسـیارم كـرد لەحـەزرەت (ﷺ) چاكە و خراپـە كامـەن و چۆن دەناسرێن.

(فَقالَ البِر حُسْنُ الخُلقِ وَالإثْمُ ماحَـاكَ في صَـدرِكَ وَكرِهـتَ أنْ يُطَلـعَ عَليـهِ الناسُ)

رواه مـــسلم) واتـــە پێغەمبـــەر (ﷺ) دەفـــەرمووێت چـــاكە ئەوەیـــە لەخووڕەوشـتی بـاش و بەكـەڵك بەرانبـەر بەخـەڵك یـان چـاكە بریتییـە لەخووڕەوشتی باش و ڕووخۆشی و كردەوەی جـوان وەتـاوان و گومـانیش ئەوەیە گوناه بێ بەدڵتا و پێت ناخۆش بێ كەخەڵك بـەو كردەوەیـە بزانـێ ئەی برایانی خاوەن باوەڕ لەئاینی ئیسلامدا خووڕەوشتی جوان زۆر گرنگـە و ڕووخۆشیە ئەبێ بەمایـەی سـەربەرزی هـەردوو (جیهـان) دەگێردرێتـەوە لەئەبوو هورەیرەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

(سُئِلَ رَسولُ اللهِ (ﷺ) عَنْ أكثرِ مايَدخُلَ الناس الجنة؟ فَقـالَ تَقْـویَ اللهِ وَحُسنْ الخُلقِ)

واتە پرسیاریان كرد لەحەزرەت (ﷺ) زۆرترینی چـوونە نـاو بەهەشـت لەخـەڵكا كامـەن؟ حـەزرەت (ﷺ) فـەرمووی لـەوەڵاما ئەوانـەی (تـەقواو) پارێزگاری خوا ئەكەن وەئەوانەی ڕوویان خۆشـە یـان خووڕەوشـتی جـوان

بەکاردەهێنن.

(وَسُئِلَ عَنْ أكثَرِ مايَدخُلَ الناس النارَ؟ فَقالَ (الفَمُ وَالفَرجُ))

(رواه الترمذي) واتە پرسیاریان لەحەزرەت (ﷺ) کرد لەزۆرترینی چوونە ناو ئاگری دۆزەخ کامەنە؟ حەزرەت (ﷺ) فەرمووی لەوەلاما ئەمانەن بە (دەموو بەداوێن) ئازاری خەڵك ئەدەن بەواتای زۆرترینی لەخەڵکا گیرۆدەی ناو ئاگری دۆزەخ ئەبن و بەهۆی زمان پیسی و داوێن پیسیەوەیە (ئیتر خوای گەورە پنامان بێت) حەزرەتی (عەلی) (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت خووڕەوشتی باش بەسێ پلە ئەبێت خۆت بپارێزی لەشتی (حەرام) واتە ناڕەوا وەتێ بکۆشی بۆ شتی (حەلال) واتە ڕەوا وەسەخاوەت بەکاربهێنی بەرامبەر بەماڵ و منداڵەکانت[1] هەروەها (عەبدولای کوڕی عەباس) خوایان لێ ڕازی بێت دەفەرموێت هەموو خانوێك (بناغەیەکی) هەیە وەبناغەی ئیسلام خووڕەوشتی باش و بەکەڵکە چونکە هەر خووڕەوشتی جوان و باش و بەنرخ پلە و پایەی (یەکیەتی) و کۆمەڵ بەرز ئەکاتەوە[2] خواناسی بەڕاستی (شێخ جنید) خوا (نهێنی پیرۆز) بکات دەفەرمووێت چوار شت هەن پلەو پایەی پیاوی موسوڵمان بەرز ئەکاتەوە با کەمیش بن یەك نەرمی بەکاربهێنێ و دووهەم خۆ بەکەم زانین و سێهەم سەخاوەت و چوارەم خووڕەوشتی جوان[3] . (سەرنجێك) هەروەها

---

(1) بڕوانە کتێبی (الوعظ والارشاد) دانراوی (زين العابدين التونسي) ص ١٧ بەرگی دووهەم.

(2) هەمان سەرچاوە.

(3) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت لە (حەدیسدا).

(خِیارُکُمْ أحاسنکم أخلاقاً) متفق علیه.

واتە باشترینی ئێوە ئەوانەتانن کەخووڕەوشتیان لەوانی ترتان باشترە.

لەعەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەڵێت حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(خَیرُ الناس أحسَنَهُم خُلقاً)

رواه الطبراني. واتە چاکترینی مرۆڤ ئەو مرۆڤەیە کەخووڕەوشتی خۆشتر و باشتر بێت، بەڕاستی هەر کەسێك چاوی بەئینسانی (ئەخلاق) بەرز و ڕووخۆش و گەش بکەوێت دڵی فێنك ئەبێت و وەك گوتراوە.

(بشاشة وجه المرء خیر من القری)

واتە ڕووخۆشی هەندێ کەس باشترە لەبایکی فێنك.

(وَصَلی الله عَلی سَیدِنا مُحمدٍ وَ عَلیَ آلهِ وَأصحابةِ أجمَعینْ)

# ئامۆژگاری حەوتەم

## باسی خووڕەوشتی خراپ (الخُلُقُ السَيءْ) ئەکات

(الحَمْد لله الذي جَعَلَ الحِلْمَ وَالأخلاقَ الحَسَنَة شَعائر الصالحين وَجَعَلَ الغَضَب وَالأخْلاَق السيئَةَ سِمةُ الحُمْقى ونعت المُفسِدينَ وَاشْهَدُ أنَ لا إلـه إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ذو القُوة المَتين وَأشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً عَبدَهُ وَرَسُولَهُ صادِقَ الوَعدِ الأمين اللهم صَلِ وَسَلم عَلى سَيدَنا مُحَمدٍ وَعَلى آلـهِ وَأصحابهِ وَالتابعينَ).

خـوای گـەورە لەسـورەتی (الاعـراف)دا دەفـەرموویت بەحـەزرەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت).

﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾ واتـە ئـەی پێغەمبـەر وەربگـرە (عـەفوو) چاوپۆشی و لێ بـوردن کەهەرچـی ئاسـانە لەخووڕەوشـتی بـاش و بەکـەڵك وەفـەرمان بەشـتێك بکـە لـە (شـەرعدا) ناسـرابێ بـەباش ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ ئایـەتی ١٩٩) واتـە چاوپۆشـی و ڕوو وەرگێـر بـە بەرامبـەر بەنەفام وەڕقی خۆت لەنەزانان مەکەوە، بەڕێز پێشەوای نامدار (قـورطبی) لەتەفسیرەکەیدا دەفەرموویت هەرچەندە ئەم ئایەتـە فـەرمان بەپێغەمبـەر (ﷺ) دەکـات بـەڵام لـە (واقعـدا) هـەموو خـەڵك ئەگرێتـەوە [1] چـونکە ئەدەبێکە بۆ هەموو مرۆڤ هەروەها لەهەمان سەرچـاوەدا ئیمـام جەعفـەری صادق (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموویت:

---

(1) بڕوانە تەفسیری (ئیمامی قرطبی) بەرگی هەفتەم لاپەڕە ٣٤٧.

(أمرَ اللهُ نَبيَهُ (ﷺ) بِمَكارِمَ الأخلاقِ وَلَيسَ في القرآن آيـة أجمـعَ لِمَكـارِمِ الأخلاقِ مِنْ هذهِ الآية)

واته خوای گەورە فەرمانی کردووە بەحـەزرەت (ﷺ) کەخووڕەوشـتی جوان بەکاربێنێت و وەدەفـەرمووێت لـەقورئانی پـیرۆزدا ئایـەت نییـە لـەم ئایەتە ڕەساتربێ هەموو ڕەوشت و کردەوەیەکی باش بگرێتـەوە وەك ئـەم ئایەتـە[1] هـەروەها وادەگێڕنـەوە کەهـەرجارێك لـەجاران (عەبدێکی) واتـە بەندەیـەکی (جەعفـەری صـادق) خـوای لێ ڕازی بێـت ئـاوی بەدەسـتیدا دەکردوو لەناکاو (مەسینەکەی) لەدەست کەوتە خوارەوە هەندێ بروشـکی ئاوەکە بەدەم و چاوی (ئیمام) (جەعفەر)دا هەڵپڕژا و سەری بەرزکردەوە و بەتووڕەییەوە سەیرێکی بەندەکـەی کـرد ئـەویش یەکسەر ووتـی گـەورەم (وَالْكاظِمينَ الغَيْظَ) واتە خودا لـەو کەسـانە خـۆش دەبێت کـەڕقی خۆیـان دەخۆنـەوە. (ئیمـام جەعفـەریش) فـەرمووی وا ڕقـی خـۆمم خـواردەوە بەندەکە ووتی (وَالعافِينَ عَنِ الناسِ) واتە خودا لەو کەسـانە خـۆش دەبێـت کەلەگوناهی خەڵك دەبوورن (ئیمام جەعفەر)یـش فـەرمووی وا لێـت خـۆش بووم بەندەکەی ووتی (وَاللهُ يَحِبُ المُحْسنِينَ) واتە خوا چاکە کەرانی خـۆش دەوێـت (ئیمـام جەعفـەریش) فـەرمووی دەبـڕۆ وا لـەڕێی خـودادا ئـازادم کردی[2].

(سەرنجێك) ئەی خاوەن باوەڕان هەرکەسێك بەجوانی وردبێتەوە و بـیر

---

(1) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(2) سەیری (احياء علوم الدين) بکە دانراوی پێشەوا (محمدی غزالی) بەرگی شەشەم لاپەڕە ٥١.

بكاتەوە لەزیانی خووڕەوشتی خراپ باش بۆی دەرئەكەوێ كەوا زیانی و زەرەری یەكجار زۆرە چونكە بەڕاستی خووڕەوشتی خراپ بەهەزارەها ماڵ و خانەدانی كوێر كردۆتەوە و بەتایبەتی چەندەها ژن و پیاو و خێزانی لێك پچڕاندووە و پەیوەندیان لەگەڵ یەك نەما هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەگەلێك فەرموودەی خۆیدا باسی (خووڵقی) چاك و ڕەوشتی خراپی كردووە لەفەرموودەیەكا عەبدوڵڵای كوڕی (ئیمامی عەباس) خوایان لێ ڕازی بێت لەپێغەمبەرەوە (درودی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە حەزرەت (ﷺ) دەفەرمووێت:

(إنَ الخُلُقَ الحَسَن يُذيبَ الخَطايَا كَما تَذيبُ الشَمسُ الجَليدَ).

واتە خووڕەوشتی جوان گوناه و تاوانی ئینسان دەتاوێنێتەوە هەروەك چۆن ڕۆژ (شەختە) ئەتاوێنێتەوە.

(وان الخلق السيء يفسد العمل كما يفسد الخل العسل)

رواه الخرائطي[1]. واتە بەڕاستی خووڕەوشتی خراپ كردەوەی خراپ كردەوەی باشی ئینسان تێك ئەدات هەروەك چۆن سركە هەنگوین تێك ئەدات، بەڕاستی ئەی برایانی خاوەن باوەڕان حەزرەت (ﷺ) پەنای گرتووە لەخوا و تكای كردووە كەبیپارێزێ لەڕەوشت و كردارە خراپەكان وەك ئەپارێتەوە و دەفەرمووێت:

(اللهُمَ إني أعُوذُ بِكَ مِن مُنْكراتِ الأخْلاقِ وَالأعمالِ وَالأهْواءِ والأدْواءِ)

رواه الترمذي والطبراني والحاكم

---

(1) بروانە كتێبی (ربيع الابرار) دانراوی (محمود بن عمر الزمخشري) بەرگی دووهەم لاپەڕە ٤٩.

واته خوایه پەنات پێ ئەگرم لەڕەوشتو کرداره خراپەکان وەئارەزووی بیری ناپەسەند وەك دەردی (حەسوودی) و خۆ بەگەوره زانین و ناپاکی و دەست درێژی و وەلەکردەوه خراپەکان وێنەی (قەتل) و زینا و دزی و (شەراب) خواردنەوه لەهەوا و ئارەزووه پیسەکان وەلەنەخۆشی و دەرد و بەلاّ وەك گوریەتی بەلّەك و (سل و سەرەطان) واته هەموو نەخۆشیەکان[1] بەڕاستی هەر (قەومێك) واته هەر گەلێك وەهەر میلەتێك کەبیەوێ بەرز بێتەوه با (اخلاق) و ڕەوشتی جوان بەکاربێنێت وەدوور بکەوێتەوه لەڕەوشتی خراپ چونکه مانەوەی (میللەت) بەئەخلاقەوەیە هەزار (ڕەحمەت) لەم شاعیره کەگوتویەتی:

وَإنّما الأُمَمُ الأخلاقُ ما بَقِيَتْ

فَإنْ هُمْ ذَهَبَتْ أخلاقُهُمُ ذَهَبوا[2]

(وَصلىَ اللهُ عَلىَ سَيدِنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلمْ)

---

(1) بڕوانه کتێبی (فیض القدیر شرح الجامع الصغیر) دانراوی (عبدالرؤوف المناوی) ج٢ ص ١١٠.

(2) بڕوانه کتێبی (الوعظ والارشاد) دانراوی (زین العابدین التونسی) لاپەڕه ١٢ بەرگی دووەم..

# ئامۆژگاری هەشتەم

## باسی (برُّ الوالدْينِ) واتە چاكە لەگەڵ دايك و باوك ئەكات

(الحَمدُ للهِ الكريم الذي أمرَ ببرِ الوالدينِ وَحَضَ عَلى مَكارِمِ الأخْلاق لا إلـه إلا هو سُبْحانَهُ وَتعالى أرحَمُ الراحِمينَ أسْتَغْفِرهُ وَأشهَدُ إن لا إلـه إلا الله جَعَلَ في رِضائِهِمَا سَعَادَةُ الدارين وَأشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً رَسُولُ اللهِ أوجَبَ مَحَبَتـه اللّهُمَ صَلِ وَسَلِم وَبارِك عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ نَالُوا رِضوانَ اللهِ وَرَحْمتَهُ).

أما بَعْدُ. لەدوای هەندێ (إخوانی المُؤمنِينَ) برايانی بڕوادارانم.

قالَ اللهُ تَعالىَ في القرآن العَظيم

واتە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا﴾ سـورەتی (الإسراء) ئايەتی ٤٣)

واتـە خـوای گـەورە فـەرمانی بەسـەردا داويـن دوو شـت پێويـستە هەردوكيان بـەجوانی و ڕێـك و پێكـی جـێ بـەجێ بكـەين يەكـەم پێويـستە ئێمەی بڕواداران لەخوا زياتر كەسـی تـر نەپەرسـتين و بێجگـە لـەو خوايـە كەشايستەی خوايـەتی هەيـە كەسـی تـر بـەخوا نـەزانين و كووڕنوشـی بـۆ نەبـەين و دووەم پێويـستە چـاكە بكـەين لەگـەڵ دايـك و بـاوك و دڵيـان نەشكێنين و ئازاريان نەدەين چوونكە زۆر مافيان بەسەرمانەوە هەيە.

(عَنْ أبي عَبْدالرحَمن عَبْدالله بِن مَسعود (رَض الله عنهم) قال سألتُ النَبي

(ﷺ)).

واتــه دەگێڕنــەوە لــەباوکی (عەبــدوڕەحمان) واتــه عەبــدوڵڵای کــوڕی (مەسعود) خوایان لێ ڕازی بێـت) دەفــەرمووێت پرسـیارم کـرد لەحـەزرەت (ﷺ).

(أيُ العَمَلِ أحَبُ إلى الله تَعالى؟ قَالَ الصَّلاةُ عَلى وَقتِها).

واته کام کردەوە لای خودا خۆشەویسته فەرمووی (نوێژ) لەکاتی خۆی بکرێت.

(قُلْتُ ثُمَ أيّ؟ قَالَ بِرُ الوالدَيْنِ).

لەدوای هەندێ گوتم چی تر فەرمووی چاکه لەگەڵ دایك و باوکدا.

(قُلْتُ ثُمَ أيّ؟ قالَ الجِهادُ في سَبيلِ الله) متفق عليه.

واتــه لــەدوای هەنــدێ گــوتم چــی تــر فــەرمووی (غــەزا) لــەڕێی خــوادا وەلەفەرمودەیێکی تردا هاتووە دەفەرموێت:

(جاءَ رَجلٌ فَسْتَأذَنَهُ في الجهادِ فَقالَ أحي والداكَ؟ قـال نعَـم قـالَ فَفيهِمـاً فَجاهِد) رواه البخاري.

واته مرۆڤێك هات بۆلای حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) عـەرزی کـرد ئەچـم بـۆ غـەزا پێغەمبــەر (ﷺ) فــەرمووی دایـك و باوکـت مـاوون گـوتی بـەڵێ فەرمووی خزمەتی ئەوان بکە بۆ تۆ خێـری (غـەزای) هەیـە بەڕاسـتی ئـەی برایـانی خـاوەن بـاوەڕ لـەم فەرموودەیـە پـیرۆزەدا وادەرئەکـەوێت کـەوا خزمەتی دایك و باوك زۆر زۆر خێرە.

(وَقالَ مالك بن رَبيعة (رض الله عنه) بَينَما نَحْـنُ جلـوسٌ عِنـدَ رَسُـول الله (ﷺ) إذْ جاءَهُ رَجلٌ مِنْ بَني سَلمة).

واتــه (مــالكى كـورِى رِەبيعــه) (خــواى لىٚ رِازى بيّــت) ئــەلّيّت كاتيّــك لەخزمەت پيّغەمبــەر (ﷺ) دانيـشتبوين پياويّـك لـەتيرەى (بـەنى سـەلمە) هاتە لاى پيّغەمبەر (ﷺ)

(فَقالَ يارَسُول الله هَـل بَقـىَ عَلـى مِـن بِـرّ أبـوي شـيءٌ أبرهُمَـا بِـهِ بَعـدَ وَفاتهمَا؟)

واته ووتــى ئايــه لــەدواى مردنــى بـاوك و دايكـم چـاكه لەگـەلاّ كردنيـان ئەميّنىّ؟

(فَقالَ نعَم الصلاةُ عَليهْما[1] وَالإستغفار لَهُمَـا وَإنفـاذ عَهْـدهِمَا مِـنْ بَعـدهِما وَصِـلةُ الَـرحِمِ التّـي لا تُوصَـل إلا بِهِمـا وَإكْـرامُ صَـديقِهَما).رواة أبـو داود في سُنَنة).

واته پيّغەمبەر (ﷺ) فەرمووى بەلّىّ بۆيـان بپـارِيّرەوه لـەخوا و داواى لىّ بوردنيــان بــۆ بكــەى (وەســيەتيان) بــەجىّ بيّنــه چــاكه بكــه لەگــەلّ خزمەكانيانا رِيّز لەدۆستو بـرادەروو هاودەميـان بگـره (سـەرنجيّك) ئـەى برايانى خاوەن بـاوەرِان) ئەگـەربيّت و ئيّمـه وورد بينـەوه لەفـەرمودەكانى حەزرەتى پيّغەمبەر (ﷺ) لەبارەى (بِرُّ الَوالدَيْن) واته چاكه لەگەلّ دايـك و باوكدا به (كتيّبيّك) و دوو كتيّب كۆتايى نايّت بەلاّم (ئوميّدەوارم) ئەم چەند فەرمودەيــه ببيّتــه رِووناكـايى بـۆ (خـاوەن بـاوەرِان) تكايــه گـوىّ بگـره لەهەنديّك هۆنراوەى خۆم نووسيوومه بۆ بـرادەران ئەگـەر كـەم و كـورِيّكى تيّدا هەبىّ ليّم ببووره چونكه هەر ئەوەندەم لەدەست ديّت.

---

(1) (اي الدعاء لهما) واته بۆيان بپارِيّرەوه و وەنزا و تكايان بۆ بكه.

بەهەشـــت لـــەژێر پێـــی دایکاندایـــە بـــرام[1]

مـــاچ بکـــە دەســـتی تـــا بگەیـــە مـــەرام

دڵـــــی ڕابگـــــرە وەکـــــوو ئاوێنـــــە

دەخیـــل ســـەد دەخیـــل دڵـــی مەشـــکێنە

دڵـــسۆزیان تۆیـــە دایـــك و بـــاوکی هـــەژارت

هـــەردەم ئەیانـــەوێ ڕێـــك بـــێ ئـــیش و کـــارت

مـــافی دایـــك و باوکـــت لەســـەرت زۆرە

خزمـــەت و ڕێزیـــان یـــەکجار زۆر خێـــرە

ئەگـــەر نـــەمابوون لـــەکاتی ژیانیـــان

خێـــرو چـــاکەیان بـــۆ بکـــە لـــەدوای مردنیـــان

ئەگـــەی بـــەمراز بەووتـــەی ڕەهبـــەر

نـــابێ شـــەرمەزار لـــەڕۆژی مەحـــشەر

کۆتـــایی ووتـــەم (خـــەلاص) بـــوو کـــەلامْ

بـــەخوات دەســـپێرم بـــاقی وَالـــسّلامْ

(وَصَلى اللهُ عَلىَ سَيِدِنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَبارِك إلى يَومِ القيامة).

نبهني الله واياكم من نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لیواء سيد المرسلين

---

(1) ئەم هۆنراوەیە (ئیشارەتە) بۆ ئەو فەرمودەیە کەحەزرەت (ﷺ) دەفەرمووێت: (ألجَنَةُ تَحتَ أقدامِ الأُمَهاتِ) واتە بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە.

# ئامۆژگاری نۆیەم

## باسی ( صلة الرحم ) ئەکات واتە سەردان لەخزم و کەسوکار و چاکە لەگەڵ کردنیان پێویستە

(الحمدُ للهِ عزَ مَنْ قائل ﴿ وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴾[1] وأشهدُ أنَ لا إلـه إلا الله جَعَلَ صِلةَ الرَحمِ مِن أفضَلِ القُربات وأشهدُ أنَ سَيدَنا مُحَمداً رَسُولُ الله أبَر الناس برحمته وأشَدَهُم صِلَةً لَها إذ يَقُولُ أسْرَعُ الخيرِ ثواباً البر وَصِلَةَ الرحِمِ وأسرَعُ الشرّ عُقُوبَةُ البَغي وَقَطيعةَ الرَحِمِ) اللهُمَ صَلِ وَسَلمَ وَبارِك عَلى سَيدَنا مُحَمَدٍ وَعَلى آله وَأصحابه الذينَ كَانُوا لأرحامِهِمْ واصِلِينَ وَعلَى رَبِهم متوكلينَ أما بَعْدُ أيّها المُسلِمُونَ الكِرام).

لەدوایی هەندێ برا موسوڵمانە بەڕێزەکان وەلەپاش (حەمدو) سوپاسی خودادا خوای گەورە فەرمویەتی (مافی خزم و نزیکانی خۆت بدەرە دەستیان هەروەها مافی هەژار و ئینسانی بێ ماڵ و بێ دەس و ڕێبواری لێ کەوتوو بەجێ بێنە بەلام ماڵی خۆت زیاد لەئەندازەی پێویست سەرف مەکە وەخوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ قُل لَّآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا إِلَّا ٱلْمَوَدَّةَ فِى ٱلْقُرْبَىٰ ﴾[2]

واتە ئەی پێغەمبەر بەبێ باوەڕەکان بڵێ من لەسەر ئەم ئامۆژگاری

---

(1) سورەی (الاسرا) ئایەتی ٢٦.

(2) سورەی (الشوری) ئایەتی ٢٣.

کردنەم بۆ ئێوە هیچ کرێ یەکەم لێیان ناوێ ئـەوە نـەبێ کەلەگـەڵ خزمـی خۆتاندا دۆست بن.

(أيّها المُؤمنُونَ الكرام)، واتە ئەی خاوەن بـڕواداره بـەڕێزەکان (يَأمرنَـا الله سُبحانَهُ وتَعالَى بالبِر وَالإحسان بِذَوي القُربى).

واتە خوای گەورە فـەرمانمان پـێ ئـەکات بەچـاکە کـردن لەگـەڵ (صـیلەی رەحم).

فەرمانمان پێ ئەکات بەچاکە و (ئیحسان) کردن لەگەڵ (صیلەی رەحم) وەبەتایبەتی ئەو کەسانەی کەزۆر نزیکن یانی. (ذوي القُربَى أوْ أولو القُربى) مَنْ تَصلُنا بِهم صلة الرَحمِ كالآباءِ والأبناءِ وَالأعْمامِ وَالخالاتِ وَأبنـائهِن وَكُـلّ منْ بيننا وَبَينَهُمْ وَشيجة وَصِلة قرابة مَهْمَا بَعُدَتْ)[1]

واتە ئەوەی پەیوەندی زۆر بەهێزبێت وەك باوك و كوڕ و مام و ئـامۆزا و پوور و پورزا و خوشك و خوشكەزا و برا و برازا وە (صیلەی رەحم) لەگـەڵ ئەمانە زۆر خێرە وەهەموو ئەو کەسانەی کەئەگەنەوە یـەك وەپەیوەنـدیان لەگەڵ یەکا هەیە با دووریش بێت پێویستە (صیلەی رەحم) بەجێ گەیاندن و سەردانیان بکرێت ئەی برایانی خاوەن باوەڕ بەڕاسـتی (صـیلەی رەحـم) وەکو سـوودی هەیـە بـۆ ڕۆژی دوایـی بـۆ دونیـاش زۆر بەسـوودە هـەروەك (ئەنس) (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لەحەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَنْ أحَب أنْ يَبْسِطَ لَهُ فِي رزقهِ وَينْسألَهُ فِي أثرهِ[2] فَليَصِلْ رَحِمَهُ). متفق

---

(1) بڕوانە کتێبی (الارشاد والخطابة) دانراوی (محمد محمد بن یوسف) لاپەڕە ١٥.

(2) ای (یۆخرە لە فِي أجَلِه وعمره) واتە (ئەجەل) دواخرێ وەتەمەنی درێژ ئەبێت بڕوانە (منهاج الصالحين) دانراوی (عزالدین بلیق) لاپەڕە ٣٦٨.

عليه.

واته هەر كەسێ ئەیەوێ ڕزقی فـرەوان بێـت وە (ئەجـەلی) دوابخـرێ بـا (صلەی رەحمی) بـەجێ بێنـێ (سـەرنجێك) ئیمـامی (نـەوەوی) (خـوا لێـی ڕازی) بێت دەفەرموێ دواخستنی (ئەجەڵ) پرسیارێكی (مـشهوری) تێدایـە وەك دەفەرموێت:

(وَهـوَ أن الآجـالَ وَالأرزاقَ مُقَـدرَةٌ لا تزيـدُ وَلاَ تَـنْقُصْ) : واتـە بەڕاسـتی (ئەجەڵ )و ڕزق خوا تەقدیری كردووە نەزێدە ئەبێ نەكەم هـەروەك خـوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت:

﴿فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ﴾

سورەی (النحل) ئایەتی (٦١) واتـە ئەگـەر هـات كـاتی مـردن وە دیـاری كراو نەسەعاتێك دوا ئەكەوێ نـەوەپێش دەكـەوێ (ئیمـامی نـەوەوی) خـوا لێی ڕازی بێت) دەفەرمووێت زانایـان وەڵامـی ئـەم پرسـیارەیان داوەتـەوە مەبەسـت لەدواخـستنی (ئەجـەل) و زیـادبوونی تەمـەن ئەوەیـە پیـت و (بەرەكـەت) ئەخاتـە تەمەنیـەوە بەخۆشـی و شـادی ئـەژێت وەسـەربەرزی ئەكات لەهەردوو جیهان[1] .

عَن أبي ذَرٍ (رض الله عَنهُ) قالَ أوْصاني خَليلي رَسُولُ الله (ﷺ) بِخِصالٍ مِن الخَيرِ.

لەئـەبوو (ذرەوە) (خـوای لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت خۆشەویـستم حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) ئامۆژگاری لێ كردووم بەشەش شت لەچاكە.

(1) ئەم باسەم وەرگرتووە لەكتێبی (دروس من الوعظ الارشاد) دانراوی (زین العابدین التونسی) لاپەڕە ٣٢.

(وَأوصْاني أنْ لا أنظُرَ إلىَ مَنْ هُوَ فَوْقي وَأن أنظُرَ إلى مَنْ هُوَ دُوني).

واتە ئامۆژگاری کردووم کەتەماشای لەخۆم دەوڵەمەندتر نەکەم هەر تەماشای کەمتر لەخۆم بکەم.

(وَأوصاني بِحُبِّ المَساكِين وَالدَنو مِنهُم).

واتە ئامۆژگاری کردووم کەهەژارم خۆش بوێن و وەلێیان نزیك بکەومەوە.

(وَأوصْاني أنْ أصِلَ رِحِمي وَأنْ أدبرتُ)

واتە ئامۆژگاری کردووم (سیلەی ڕەحم) بەجێ بێنم.

(وَأوْصاني أنْ لا أخافَ فِي اللهِ لَوْمَةَ لائم).

واتە ئامۆژگاری کردووم لەخزمەتی خوادا لەکەس نەترسم. واتە ئامۆژگاری کردووم وەهەر قسەی هەق بکەم باتاڵ بێ و زەرەری خۆشمی هەبێ.

(وَأوْصاني أنْ أكثرَ مِنْ لاحَولَ وَلا قوة إلا باللهِ فإنَها كَنزٌ مِن كنُوز الجنةِ).

(رواه الطبراني وابن حبان) [1] واتە ئامۆژگاری کردووم کەزۆر.

(ذکری لاحَولَ وَلاقوةَ إلا بالله).

بڵێم چونکە ئەم (دووعایە) گەنجینەیەکە لەگەنجینەکانی بەهەشت.

(عَن أبي هُريرةَ (رَض اللهُ عَنهُ) أن رَجُلاً قال يا رَسُولَ اللهِ إنَ لِيَ قَرابةً أصِلُهُمْ وَيَقْطَعُونَ)

واتە لەئەبو هورەیرەوە (خوای لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت پیاوێ عەرزی پێغەمبەری (ﷺ) کرد گوتی ئەی پێغەمبەری خوا من هەندێ خزم

---

(1) بڕوانە کتێبی (ڕابەری بەندەکان) دانراوی مامۆستا مەلا (عبدالله ی گناوی) لاپەڕە ٩٥.

هەیە (صیلەی ڕەحمیان) بەجێ ئەهێنم ئەوان لەگەڵ منا بەجێ ناهێنن.

(وَأحْسِنُ إلَيهِم ويُسيئُونَ إلي رَحِمَهُمْ عَنهُمْ وَيَجْهَلُونَ عَليّ).

واتە من چاکەیان لەگەڵ ئەکەم ئەوان خراپەم لەگەڵ ئەکەن من قسەی نەرمیان لەگەڵ ئەکەم ئەوان قسەی خراپم پێ ئەڵێن.

(فَقَالَ لَئِنْ كُنتَ كَمَا قلت فَكأَنَما تَسفهم المَل (الرّماد الحارّ) وَلا يَزال مَعَكَ مِنَ الله ظَهيرٌ عَلَيْهم مَادمُت عَلَى ذَلكَ). رواهُ مسلم

واتە حەزرەت (ﷺ) فەرمووی ئەگەر وەکو ئەڵێی وابێ (کأنە) خۆڵەمێشی گەرمیان دەرخوارد ئەدەی لە (تەرەف) خواوە لەسەر ئەوان بەردەوام پشتیوانێکت هەیە تاوابی لەگەڵیانا[1] .

(نَسأل الله تَعالى أنْ يَجعَلَنا مِنَ القائمِينَ بِما أَمَر وَأنْ يوفقَنا إلى العَمَل بِأحكام الدّين وان يهيئَ لَنا مِن أمرنا رَشَداً وَصَلى الله عَلى سَيّدنا مُحَمَد وَعلَى آلهِ وَصَحبهِ أجمَعين).

---

(1) بڕوانە (اقتران النيرن مع التصرف) واتە لەگەڵ دەست لێدان دانراوی مامۆستا مەلا ڕەشید بەگی بابان لێکۆڵینەوەی (محمد علی قەرەداغی) ص ٨١ بەرگی پێنجەم).

# ئامۆژگاری دەهەم

## باسی ( حُسنْ الجوار ) ئەکات چاکە لەگەڵ دراوسێ

(الحَمدُ لله الذَي أمَرَنا بِالبرِ وَالصلة وَنَهانا عَنْ العُقوقِ وَجَعَل لِلْجارِ حَقاً عَلى جارِه وَإنْ كانَ مِن أهل الكُفر وَالفسُوق وَنَشهَدُ أنَ لا إلـه إلا الله وَحـدَهُ لاشَريكَ لَهُ هُوَ الخالِق وكُلَ شَيءٍ سواهُ مَخْلوقٌ وَنَشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً عَبْدهُ وَرَسولَهُ الصادِقُ المَصْدوق وَالـصَلاةُ والـسَلام عليـهِ وَعَلـى صَحبه المُؤدينَ لِلحقُوقِ وَعَلى التابعين لَهُم بإحْسانٍ مِنْ سابقِ وَمسبوق).

برایانی موسڵمان خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَٱلۡجَارِ ذِی ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾

سورەی (النسا) ئایەتی (٣٦) واتە چاکە بکە لەگەڵ دراوسێی نزیکدا چ بەخزمایەتی نزیک بێ یا بەماڵ لەگەڵ دراوسێی دووریشدا خواه بەخزمایەتی دوور بێ یا بەماڵ.

(عَنْ أبي شُريح الخُزاعي (رَضيَ اللهُ عَنهُ) أنَ النَبي (ﷺ) قالَ:

واتە لەئەبی (شووڕەیحی) خوزاعیەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت بەڕاستی حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی:

(مَنْ كَانَ يُؤمنُ بالله وَاليَوم الآخر فَلْيُحسنْ إلى جارِه)

واتە ئەگەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و ڕۆژی دوایی پێویستە چاکە لەگەڵ دراوسێی بکات وەرێزی بگرێ.

(وَمَن كَانَ يُؤمنُ بالله وَاليَومْ الآخرِ فَلْيُكرم ضَيْفَهُ).

واتە ئەگەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەرۆژی دوایی پێویستە چاکە

لەگەڵ دراوسێی بکات وەڕێز و (احترامی) بگرێ.

(وَمَنْ كَانَ يُؤمن باللهِ وَاليَوم الآخِر فَليُكرمْ ضَيفَهُ)

واتە ئەگەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی بارێزی میوانی بگرێ.

(وَمَنْ كَانَ يُؤمن باللهِ وَاليَوم الآخر فَليَقُل خيراً أو لِيَسْكُتْ).

رواه مسلم بهذه اللفظ[1] واتە ئەگەر کەسێك باوەڕی هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی (قیامەت) با قسەی باش بکا یا بێ دەنگ بێت.

وَعَنْ أبي هُرَيرةَ (رضي الله عَنهُ) أنَ رَسُولَ الله (ﷺ) قال:

واتە ئەبی هورەیرە (ڕەزای خوای لێ بێ) دەفەرموێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(مَنْ كانَ يُؤْمِنْ بِالله وَاليَومِ الآخِرِ فَلا يُؤذِ جارَهُ)

رواه البخاري: واتە هەر کەسێ باوەڕی بەخوا و بەڕۆژی دوایی هەیە با ئازاری دراوسێی نەدات. ئەی برایانی خاوەن باوەڕ پێویستە بەپێی توانا ڕێزی دراوسێ بگرین و کردەوەی چاکیان لەگەڵا بکەین و بەهیچ شێوەیەك ئازاریان نەدەین و وەڕێگەی منداڵمان نەدەین کەئازاری دراوسێمان بدا و چونکە دراوسێ زۆر هەقە و مافی بەسەر دراوسێ وەهەیە.

عَنْ مَعاوية بنْ جُنْدب قُلْتُ يا رَسُولَ الله (ﷺ) ما حَقُ الجارِ عَلى جارهِ؟

واتە لەمعاویەی کوڕی جوندبەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت

---

(1) بڕوانە کتێبی (منهاج الصالحين) مِنْ أحاديث وَسُنة خاتَمُ الأنبياء وَالمُرسَلين دانراوی (عزالدين بليق) لاپەڕە ٣٧٨ وەبڕوانە کتێبی (رياض الصالحين) دانراوی (ئیمامی نەوەوی لاپەڕە ١٥٤ چاپی دمشق).

عەرزی پێغەمبەرم (ﷺ) کرد هەق و مافی دراوسێ لەسەر دراوسێ چییە؟

(قَالَ إنْ مَرِضَ عُدتَهُ وَإن ماتَ شَيعتَهُ وَإنْ إستَقرَضكَ أقرضهُ وَإنْ أعْوزَ سَتَرتَهُ).

واتە هەق و مافی دراوسێ ئەوەیە ئەگەر نەخۆش کەوت بچییە لای وەئەگەر مرد لەگەڵی بچی بۆ سەر (قەبران) وەئەگەر داوای قەرزی لێ کردی قەرزی لەگەڵ بکەی وەئەگەر ڕووت بوو بەرگی بۆ بکەی.

(وَإن أصابَهُ خَيرٌ هَنَأتَهُ وَإنْ أصابَتهُ مُصيبَةٌ عَزَيتَهُ وَلا تَرفَعْ بِناءَكَ فَوقَ بِنائِهِ فَتَسُدَ عَلَيْهِ الرِّيحَ وَلا تُؤذِهِ بِريحِ قِدْرِكَ إلاّ أنْ تُغْرِفَ لَه مِنْها).

رواه الطبراني والخرائطي[1] . واتە ئەگەر قازانجی دەست کەوت پیرۆزبایی لێ بکەی وەئەگەر تووشی ناخۆشییەك بوو سەرەخۆشی لێ بکەی وەبەرزمەکەوە خانووی خۆت بەسەر خانووی دراوسێدا نەبادا ڕێگای بای لێ بگرێ وەئازاری مەدە بەبۆنی چێشتی خۆت مەگەر بۆی ڕەوان بکەیت و بەشی بدەیت.

عَنْ أبي ذَر (رَضي الله عنه) قال قَالَ رَسُولُ الله (ﷺ) يَا أبا ذَرّ إذا طُبْختَ مَرَقةً فَأكْثِرَ ماءَها وَتَعاهَدَ جيرانَكَ).

رواه مسلم في صحيحه/. واتە لەئەبوو (ذرە)ەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی پێم ئەی ئەبوو (ذرە) هەرکاتێك ئەگەر ئاو و گۆشتت لێ نا (هەر جۆرە چێشتێك بێت و ئاوی زۆری تێ بکە و بەشی دراوسێکانی لێ بدە لەبیریان مەکە).

---

(1) بڕوانە کتێبی (الترغیب والترهیب) دانراوی (الحافظ المنذری) بەرگی سێهەم لاپەڕە ٢٥٧.

رُوِي الإمامُ الترمذي في سُنَنه عَنْ مُجاهِد أنْ عَبْدالله بِن عَمرو (رضي الله عنه) ذُبِحَتْ لَهُ شاةٌ في أهْله)

واته ئيمامى (ترمذي) لـه سونەندا ڕیوایـەتی کـردووه لـه (موجاهیدی تـابعی) ئـەویش لەعەبـدوڵلاى كـوڕی عومـەرەوه )ڕەزای خوایـان لیّ بیّـت) دەفەرمووێت مەڕێکیان سەربڕی و لەماڵی (عەبدوڵا) بۆ ماڵ و منداڵەکانی.

(فَلَما جاْءَ قالَ أهْدَيْتُم لِجارَنا اليَهودي؟ أهدَيتُم لِجارِنا اليهودي؟)

واته کەعەبدوڵای کوڕی عومەر هاتەوه فەرمووی بەماڵ و منداڵەکانی ئایه بەشی ئەو جولەکەتان داوه کەدراوسێمانه؟ دوجار لەسەر یەك وای گوت ئەمەی دووباره کردەوه لەپاشان فەرموی:

(سَمِعتُ رَسولَ اللهِ (ﷺ) يَقُولُ مازالَ جبرائيلُ يُوَصيني بِالجارِ حَتى ظَنَنتُ إنَهُ سَيَورِثُهُ)

واتـه گـوێم لەپێغەمبـەر بـوو (ﷺ) دەیفـەرموو حـەزرەتی (جبرائیـل) ئەوەنده زۆر لەبارەی دراوسێ و دۆستیەوه ئامۆژگاری و قسەی بۆ کردووم هـەتا وام ئـەزانی کەدراوسـێ مـرد دراوسـێکەی میراتـی لیّ ئـەگرێ[1] بەشێوەیەك و ڕیوایەتێکی تردا (موجاهید) دەفەرموێت من خۆم لەخزمـەت عەبدوڵای کوڕی عومەر دابوم (خوایان لیّ ڕازی بێت) مەڕێکیان سەر بڕیبوو بەندەیەکیان هەبوو مەڕەکەی (کەوڵ) ئەکرد واته پارچه پارچەی ئەکرد.

(فَقال يا غلام إذا سَلِخْتَ فأبْدأ بِجارِناَ اليَهودي حَتى قال ذَلِكَ مِراراً فَقال لَهُ كَمْ تَقُولَ هذا).

---

(1) بڕوانه کتێبی (الجامع الصحيح للامام الترمذي) بەرگی سێهەم لاپەڕە ٢٣ (بَابُ مَا جَاءَ فِي حقِ الجِوارِ).

واتە عەبدولا بەبەندەکەی فەرموو ئەگەر مەڕەکەت کەوڵ کرد یەکەم جار بۆ دراوسێیەکەی جولەکەمان بنێرە تا چەند جار (عەبدوڵای کوڕی عومەر) ئەمەی دوبارە کردەوە تا بەندەکەی گوتی باشە تێگەیشتم تۆ چەند جار ئەمە دووبارە ئەکەیتەوە وەعەبدولا پێی فەرموو.

(أن رَسُولَ اللهِ لَمْ يَزَلْ يوصينا بالجارِ حَتّى خَشينا أنَه سَيُوَرِثُهُ) [1].

ئەم فەرمودەیە لەپێشەوە (تەرجەمە کراوە) پێویستی بەدووبارە کردنەوە ناکات برایانی خاوەن باوەڕانم حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکا (هەق) و مافی دراوسێتی بەیان کردووە هەروەك دەفەرموێت (دراوسێ کەخزمیش بێ و موسوڵمانیش بێ و سێ مافی بەسەر مرۆڤەوە هەیە مافی دراوسێتی و مافی خزمایەتی و مافی موسوڵمانەتی دراوسێی (کافریش) مافێکی هەیە کەبریتییە لەتەنها مافی دراوسێتی[2] (ئاگاداریەك) عن عائشة (رضی الله عنها) واتە لەدایکی ئیمان دارانەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی.

(حَقُّ الجوارِ أربَعونَ دَاراً)رواه ابو داود.

واتە مافی دراوسێیەتی چل ماڵە زانایان فەرموویانە مەبەست لەم فەرمودەیە ئەوەیە چل ماڵ بەهەر چوار لادا[3].

(جَعَلني اللهُ وإياكُمْ مِنْ خيارِ خَلقهِ وَأجارَني وَإياكُمْ مِن أذيةِ الجَارِ وَالتَهاوُنُ بَحقهِ آمين). (وصلى اللهُ عَلى سَيدنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ أجمَعين).

---

(1) بڕوانە کتێبی (احیاء علوم الدین) دانراوی (ئیمام محمدی غەزالی) ب ٦ ل ٤٠.

(2) رواه البزار وابو نعیم عن جابر بن عبدالله (خوایان لێ ڕازی بێت).

(3) بڕوانە کتێبی (دروس من الوعظ والارشاد) لاپەڕە ٦٥ (تألیف زین العابدین التونسی).

# ئامۆژگاری یازدەهەم

## باسی (الصبر) واتە خۆڕاگرتن ئەكات

(الْحَمدُ لله أعَدَ للصابرينَ أجراً عَظيماً وَهَداهُمْ صِراطاً مُستَقيماً وَمَنَحَهُمْ فَضلَهُ وَأشهَدُ أنَ لا إله إلا الله جَعَلَ الصَبرَ سِلاحاً يَتَقي الخطُوبَ وَالمحَنَ وَيَتَغلَبْ بِهِ عَلى الشَدائدِ وَالْمَلْمات وَوَفى الصابرين أجرَهُم بغيرِ حِسابٍ اللّهُمَ صَلِ وَسَلم عَلى سَيدِنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبهِ الذّينَ نَالُوا بالصَبرِ المُنى (أُولئكَ يُجْزَونَ الغُرْفَةَ بِما صَبرُوا وَيُلقَونَ فيهَا تَحيةً وَسلاماً خالدينَ حَسُنَتْ مُسْتَقَراً وَمَقاماً).

أما بَعدُ أيها المُسلمُون الكِرام:

واتە لەدوای هەندێ ئەی موسوڵمانە بەڕێزەكان.

فقد قال الله تعالى:

واتە بەڕاستی خودای گەورە فەرمویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾

واتە ئەی ئەو كەسانەی كەبڕواتان هێناوە (استعينُوا) واتە یارمەتی داوا بكەن لەسەر چاودێری ئایین و باسكردنی وەلەسەر ئەو ناخۆشییانەی كەلەم پێناوەدا تووشتان ئەبێ.

﴿بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ﴾

واتە بەخۆ ڕاگرتن و نوێژكردن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴾

سورەی (البقرە) ئایەتی (١٥٤) بەڕاستی خوا لەگەڵ خۆڕاگرانە) ئەی برایانی خاوەن باوەڕ ئەمەوێ لەم گۆلەدا برێك باسی سەبر و خۆڕاگرتنتان بۆ بکەم بەکورتی بەڕاستی سەبر و خۆڕاگرتن لەئاینی ئیسلامدا شتێکی زۆر گرنگە و هەر لەبەر ئەم هۆیانەیە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا نزیکەی لەحەفتا شوێندا (ناوی) سەبر و خۆڕاگرتنی هێناوە لەهەر شوێنەی بەجۆرێك فەرمانی پێ داوە هەروەها حەزرەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەزۆربەی فەرمودەکانی خۆیدا (باس) سەبروو ئارامی کردووە بەهەموو جۆرێکەوە بۆ نموونە هەندێك لەفەرمودەکانی دەخەینە بەرچاو و وەك حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(الصَبرُ نِصفُ الإيمانِ)

رواه الطبراني/ واتە ئارام و خۆڕاگرتن نیوەی باوەڕە وەدەفەرموێت:

(الصَبرُ ضِياءٌ)

رواه مسلم واتە خۆڕاگرتن چرا و ڕووناکییە بۆ خاوەنەکەی (لەهەردوو جیهان) بەتایبەتی لەناو قەبرا وەحەزرەت (ﷺ) لەفەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت:

(الصَبرُ كَنْزٌ مِنْ كنُوزِ الجَنة)[1]

واتە خۆڕاگرتن خەزنەیەکە لەخەزنەکانی بەهەشت وەدەفەرموێت پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکی تردا.

(الصَبرُ عِنْدَ الصَدْمةِ الأُولى)

---

(1) بروانە پەرتوکی (نُزهةُ الناظرين) لە نووسینی بەڕێز الشيخ تقى الدين عبدالملك الحلبى ، لاپەڕە /٢٤٦.

متفق عليه) واته نرخی خۆڕاگرتن و ئارام گرتن لای خواوه قازانجی زۆر هەبێ بۆ ئینسان لەوەدایە لەسەرەتای هاتنی (مەینەتدا) خۆی ڕابگرێ و ئارامی هەبێ وەدەفەرموێت لەفەرمودەیەکی تردا.

(مَنْ يُرِدِ اللهَ بِهِ خَيْراً يُصَبُّ مِنْهُ)رواهُ البخاري.

واته: ئەگەر خوا ویستی یەکێك بخاتە سەر ڕێگای ڕاست خوای گەورە ئەو کەسە تووشی دەردی ئەکا و ئازاری ئەدا بەسەریا و بۆ ئەوەی پاداشی بداتەوە وەلەفەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت:

(عَجَباً لأمرِ المُؤمنِ إنَ أمرَهُ كُلّهُ خَيرٌ، وَفي روايةٍ كُلّهُ عَجَبٌ)

واته چەند جوان و شیرینە بەسەرهات و ڕووداوەکانی (ئینسانی) موسڵمان چونکە بەڕاستی تووشی هەرچی بێت و هەر خێر و چاکەیە بۆی (وەبەریوایەتێکی تردا) واته هەموو ئیشی سەیرە و.

(وَلَيَسَ ذَلكَ لأحدٍ إلاّ للمُؤمنِ إنْ أصابَتهُ سَراءٌ شَكَرَ فَكانَ خَيراً لَهُ وَإنْ أصابَتْهُ ضَرّاءٌ فَكانَ خَيراً لَهُ)رواه مسلم عن صهيب الرومي (رضى الله عنه).

واته: ئەمەش تەنها هەر بۆ خاوەن باوەڕ و موسڵمانە چونکە بەڕاستی ئەگەر موسوڵمان تووشی خێر و خۆشی بوو سوپاسی خوا دەکات وەخوا سوپاسەکەی بەخێر و چاکە دەگێڕێت بۆی و وەپاداشی ئەداتەوە وەئەگەر تووشی ناخۆشییەك بوو (وەك دەرد و بەلا)و یان (موسیبەت) ئەمە (صەبر) ئەگری (ناشوکری) ناکات خوایش پاداشتی خۆڕاگرتنی بەچاکە و بەباشە ئەداتەوە ئەی برایانی خاوەن ئیمان بەڕاستی زۆر لە (ئایەتە) بەرزەکانی قورئان فەرمانمان پێ ئەکەن بۆ (سەبر و) ئارام گرتن بەهەموو شێوەیەکی پێویست وەزۆر لەفەرموودەکانی پێغەمبەریش (ﷺ)

ئامۆژگاریمـان ئەکـەن بـەخۆڕاگرتن و ئـارام گـرتن وەهــەروەها پێویـستە ئێمەش گوێ ڕایەڵی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بکەین وەهەر لەبـەر گـەورەیی (سەبر و) ئارامە خـوای گـەورە پێناسـی ئـەو کەسانە ئـەکا کـەئامۆژگاری خـەڵك ئەکـەن کـەوا سـەبر بکـەن و ئینجـا ئـەی برایـانی (خـاوەن بـاوەڕ) دەمەوێ بەچـاوێکی ورد بڕوانینـە کەسـێ ئایەتـە ئـەم سورەتەش بـەناوی (والعصر) هـەروەك دەفـەرموێت: ﴿وَٱلۡعَصۡرِ * إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ * إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ﴾ ســـورتی العصر (١-٣).

واتە: سوێند بەکات هەموو ئادەمیزادێك وا لەناو زەرەر و زیانایە مەگەر ئەوانـەی کـەبڕوایان هێنابـێ و کـردەوە باشـەکانیان کردبـێ وەئامۆژگـاری یـــەکتریان کردبـــێ بـــەئاینی ڕاســـت وەئامۆژگـــاری یـــەکترییان کردبـــێ بەخۆڕاگرتن.

(سەرنجێك) بەڕاستی ئەی برایانی (خاوەن بـاوەڕم) خـۆڕاگرتن و ئـارام گرتن لەهەموو ئـیش و کارێکـا و زۆر پێویـستە وەك (نوێـژ و ڕۆژوو...هتـد) بەخۆڕاگرتن نەبێ نابێ چونکە ڕۆژێك نییە دوو ڕۆژ نییە و بەڵکو بەدرێژایی تەمەنتـە و هـەروەها ئینـسان لـە (دنیـادا) تووشـی هـەزار (دەردو) بـەلا و موسیبەت دەبێ پێویستی بەخۆ ڕاگرتنە و ئـارام گرتنـە و چـونکە وادەبـێ باوك و دایك و کوڕ و کچ و ژن و خزم و خۆشەویستی دەمـرن بەمـە خـەم و تەم دای دەگرێت وەئاو بەچاویا دێتە خوارەوە مردن ڕێیەکی ناچارییە بـۆ هەموو زیندویەك کەس لەچەنگی ڕزگـار نابێـت کـەوابوو چـی بکـات ئەگـەر دووچاری بوو لەمە زیاتر چارە نییە مەگەر کەبڵێت.

﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾

سورەی (البقرە) ئایەتی ١٥٤ واتە ئێمە بەفەرمانی خوا هاتووین وەهەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە) هەزار رەحمەت لەو کەسەبێ کەفەرموویەتی:

إذا بَليتَ فَثِقْ باللهِ وَأرْضَ بِه

أن الذي يَكشِفُ البلوى هُو الله

إذا قَضَى اللهُ فأستَلم لقُدرَتهِ

ما لامرىءٍ حيلةٌ فيما قضىَ الله

اليْأسُ يَقطَعُ أحياناً بِصاحِبِه

لا تَيأسَنَ فإنَ الصانِعَ الله

وە زانایەکی تر فەرموویەتی:

إصبْر لِدَهرٍ نالَ فيكَ

فَهكَذا مَضَتْ الدهورْ

فَرَحٌ وَحُزْنٌ تارةً

لاَ الحُزْنُ دامَ وَلاَ السرورُ[1]

چەند جوانیان فەرمووەو (خوا پاداشتیان بداتەوە)

(جعَلَني اللهُ وَإياكُم مِنَ الصابرينَ الذينَ هُمْ بِالله مُعتَصِمُونَ وَلِقَضائهِ وَقَدَرِهِ مُسْتَسْلمُونَ وَمُسلِمُونَ والذين إذا أصابَتْهُم مُصيبةٌ قالُوا إنا لله وَإنا إليهِ راجِعُون وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَليهِ وَعَلى جَميعِ الأنبياءِ وَالمُرسَلينَ وَعلى آلهِ وَصَحْبهِ الطيبين الطاهِرينَ وَمَنْ تَبِعَهُم بِإحسانٍ إلى يَومِ الدين).

---

(1) بڕوانە کتێبی (المستطرف من الآدب والحکم) دانراوی محمد سید گەیلانی ص٣٣.

# ئامۆژگاری دوانزەهەم

## باسی (الصدق) واتە ڕاستی ئەکات

(الحَمدُ لله الذّي أمَرَ خَلقَهُ بالصدقِ وَجَعَلَهُ مِفتاحَ الخَيْرِ وَالنَجاحِ وَعِنْوانَ التَقدمِ وَالفَلاحِ وَأساسُ رقيّ الأُمَم وَعَظَمَتَها ومَصْدَر عِزهاَ وكَرَامَتَها وَيَنبُوعَ مَجْدِها وَسَعادَتِها وَنَهاهُمْ عَنْ الكَذبِ الذي هُوَ سَبَبُ الذُلْ وَالعَارَ وَمَوجِبُ التأخر والدمار نَحْمَدهُ سُبحانَهُ وَنَشكرهُ وَنَتوبُ إليهِ وَنَستَغفرهُ وَنَسألَهُ أنْ يُجنبنا الكَذبَ وَالكذابينَ وَأنْ يَجعَلنَا مِنَ المُؤمنينَ الصادقينَ اللّهُمَ صَلِ عَلى مُحَمدّ الصّادقِ الأمين المَبْعُوثِ رحمةً للعالَمينَ وَعَلى آلهِ وَأصحابِهِ وَعَلى كُلّ مَنْ تَبَعَهُمْ إلى يَوْمِ الدين).

أما بعدُ أيها المُسلمون:

واتە لەدوای هەندێ ئەی برایانی موسڵمان خوای گەورە فەرمانمان پێ ئەكات بەڕاستی و ڕاست گۆیی هەروەك لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴾

سورەی (التوبە) ئایەتی ١١٩) واتە ئەی ئەو كەسانەی كەباوەڕتان بەخوا هێناوە لەخوا بترسن و لەگەڵ ڕاستان بن و ببن بەهاوڕێی ئەوان یان لەگەڵ پیاوە باشە ڕاستەكاندا بن).

(وَقَدْ مَدَح اللهُ عِبادَهُ المُؤمنينَ الصادقينَ عَلى عهُودِهم الثّابتين الذّينَ لاَ يُغيرونَ وَلا يُبَدلونَ)

واتە بەڕاستی خوای گەورە سەنای یارەكانی (ئەصحابەی) پێغەمبەر (ﷺ) ئەكات وەسەنای بەندەكانی خاوەن باوەڕ و ڕاستگۆ ئەكا و ئەوانەی

خاوەن پەیمانن و وەبەهیچ شێوەیەك ناگۆڕێن و كۆڵ نادەن لەسەر ئـایینی ئیسلام وەك دەفەرموێت لەقورئانی پیرۆزدا و.

﴿مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ ﴾

تـا دوایـی سـورەی (الاحـزاب) ئایـەتی ٢٣/٢٤) واتـە كۆمـەڵێ لـەپیاوە موسـوڵمانەكان ڕاسـتیان كـرد لەگـەڵ خـوادا لـەو پەیمانـەی دابویانـێ هەندێكیان گەیشتن بەئاواتی خۆیان و هەندێكیان چاوەڕێن (وەهـیچ جـۆرە گۆڕانیان بەسەرا نـەهات) جـا ئـەنجامی ئەمەیـە خـوا پاداشـت و (جـەزای) ڕاستەكان بداتـەوە بـەهۆی ڕاسـتییەكەیانەوە ئـەی برایـانی خـاوەن بـاوەڕ خوای گەورە داوامـان لێ ئـەكات كەڕاسـت بـبن و لەگـەڵ خـوا و پێغەمبـەرا (ﷺ) بەڕاستی بجوولێنەوە خوا ئینسانی ڕاست و ڕاستگۆی خـۆش ئـەوێ وەفەرمانی بەڕاستی و ڕاستگۆیی كردووە چونكە بێ گومـان هـیچ كەسێك وەك خوای گەورە ڕاستگۆ نەبووە هەروەك قورئان دەفەرموێت:

﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴾

سورەتی (النسا) ئایەتی ٨٨) واتە ئایە ئەبێ كێ لەخوا ڕاستگۆتر بێ و لـەهۆی فـەرمودەوە؟ هـەروەها حـەزرەت (ﷺ) ئینـسانی ڕاسـتگۆی زۆر خۆش ویستووە چونكە بەردەوام فەرمانی كـردووە بەڕاسـتی و ڕاسـتگۆیی هەروەك دەفەرموێت:

(عَلیكُم بالـصِّدقِ فـإنَ الـصّدْقَ یَهدی إلی البّـرِ وأنَ البـرّ یهَـدي إلی الجَنَّـةِ وَمایَزالُ الرَجلَ یُصْدقُ ویَتَحـرّي الـصِدقَ حتّـی یَكْتُـبَ عِنْـد اللهِ صَـدّیقاً إلخ).

رواهُ البُخاري وأحمد والترمذي.

واتـه ڕاسـتگۆبن و ڕاسـتگۆیی بەپێویـست بـزانن و چـونکە ڕاسـتگۆیی بەرەو کردەوەی باشتان دەبـات وەکـردەوەی باشـیش بـەرەو بەهەشـتتان دەبات وئەگەر ئینسان ڕاسـتی ووت و بـەردەوام بـوو لەسـەر ڕاسـتییەکەی خوا بەڕاست گۆی دادەنێـت (ئـەی برایـانی خـاوەن بـاوەڕانم) پێغەمبـەری نازدارمان (ﷺ) زۆر حەزی لە (قسەی) ڕاست کردووە و وەڕاستگۆشی زۆر خۆش ویستووە هەروەك لەفەرمودەیەکی خۆیـدا دەسـت نیـشانی کـردووە وەدەفەرموێت:

(أحَبُ الحَديثِ إليّ أصدَقَةُ).رواه احمد.

واتــە: خۆشەویـستترین قــسە لــەلای مــن ڕاســت ترینەکەیانــە لــەم فەرمودەیەوە وا دەردەکەوێت کەپێغەمبەر (ﷺ) قـسەی ڕاسـت و هـەواڵی دروسـتی لـەلا زۆر پەسـەند و خۆشەویـست بـووە چـونکە بەخۆشـی بـەم ڕەوشـتە بـەرزەوە لـەناو خـەڵکا بـەناوبانگ بـووە بـە (ڕاسـتگۆیی ئـەمین) پێویـستە ئێمــەی موســوڵمانان لــەژێر ســێبەری فــەرمودەکانی خــوا و پێغەمبەردا (ﷺ) بڕۆین بەڕێدا و چـونکە پێویـستە موسـوڵمان ڕاسـت بـێ لەقسە و دواندنیا و لەبەڵێن و پەیمانا و لەهەڵـسان و دانیـشتنا و لـەکڕین و فرۆشتنا و هەروەك حەزرەت (ﷺ) لە (حەدیسێکا) دەفەرموێت:

(التاجِرُ الصّدوُق الأمينَ مَعَ النبِّينَ والصدّيقينَ وَالشُهداء).رواه الترمذي.

واتە: بازرگانی ڕاست و ڕاستگۆ و دەسـت پـاك و بـێ (غـەش و حیللـە) لەگەڵ پێغەمبەرەکانایـە وەلەگـەڵ ڕاسـتگۆیانایە وەلەگـەڵ شـەهیدەکانایە (حەشـریان) ئـەکرێت. هـەروەها هەنـدێك لـەپیاوانی عـاقڵ و خـاوەن ژیـر

ووتویانه:

(النَجاةُ في الصِدقِ).

واته ڕزگاری بوون لەڕاستیدایە هەروەك لەپەندی پێشینانیش دا ئەڵێ (ڕاستی ڕەفتی چەفتی کەفتی) (سەرنجێك) هەروەها ئەی برایانی خاوەن باوەڕ پێویستە لەسەر ئێمەی موسڵمان ڕاست و ڕاستگۆبین چونکە ڕاستی و ڕاست گۆیی یەکێکە لەڕەوشتە بەرزەکانی ئاینی ئیسلام وەپێویستە لەسەر ئێمەی موسڵمان مادام باوەڕمان بەئاینی ئیسلام هەیە خۆمان برازێنینەوە بەم ڕەوشتە (ئەخلاقە) بەرزەوە.

هەروەها تکا کارم لەیەزدان کەپایە و پلەی مامۆستا (نامی) بەرزکاتەوە و چونکە لەهەندێك هۆنراوی خۆیدا دەفەرموێت:

ڕۆڵەی عەزیزم هۆشیاری دڵدار

بۆخۆت گوێ شل کە بۆ مەعنای ووتار

ئەوەی بەڕاستی دەروونی خۆی ڕەشت

بەکردەوەی چاك ڕۆیی بۆ بەهەشت

ڕاستان بەڕاستی شورەت وەرئەگرن

لەسەر گەنجینەی شاهان جێی ئەگرن

ڕاستییە بۆ خەیر شارەزات ئەکا

لەدەرد و ئازار بێ قەزات ئەکا

لەسەر ڕێگای ڕاست کوێریش ڕێ ئەکا

ساتێ پاش و پێش هەر بەجێ ئەگا

بەڵام لەسەر ڕێی قەمچ و پێچ و لار

**چاو ساغ وون ئەبێ (في وضح النهار)** [1]

(جَعَلَني الله وَإياكُم مِـنَ الـصادقِينَ وَأجَرَنـي وَإيـاكُم مِـنَ الكـذبِ وَالخيانَـةِ وَحَنث اليمين) وَصَلى اللهُ عَلى سَـيدَنا مُحَمَـدٍ الـصادِقُ المَـصدوقْ وَعَلـى آلـهِ وَصَحبهِ وَسَلَمْ وَبارِك إلى يَومِ الدّين).

(1) بڕوانە کتێبی (بەهار و گوڵزار) لاپەڕە ٧٢ دانراوی بەڕێز مەلا عبدالکریمی مدرس.

# ئامۆژگاری سیانزەهەم

## باسی ( الامانة ) واتە سپاردە و ئەمینی ئەکات

(الحَمـدُ للهِ جَعَـلَ الأيمـانَ علامـاتٌ اسـتغفرهُ وَأشـهَدُ أنَ لا إلـه إلا الله رَبُ الأرضِ وَالسَموات وَأشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً رَسولَ الله الـصادِقُ الوَعْـدُ الأمـين اللهُمَ صَلِ وَسَلَم وَبارِكْ عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ الأُمناءُ الصّالحِيَن).

أما بعدُ أيّها المؤمِنونَ:

لەدوای هەندێ ئەی خاوەن باوەڕان.

(لَقَدَ اشتهر النبي (ﷺ) في شَبابِهِ بالأمانة حتّى لَقبُه قومهُ بالأمين).

واتە بەڕاستی حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەگەنجیـەوە نامـدار بـوو بەدەست پاکی و تاگەلەکەی ناویان نـابوو بەدەسـتپاك وەهـەروەها خـوای گەورە لەقوئانی پیرۆزدا (مەدح) و سەنای ئەو کەسانە دەکات کەچـاودێری سـپاردە و ئەمانـەت ئەکـەن وەپـەیمانی خۆیـان ڕائـەگرن و هـەروەك دەفەرموێت:

﴿ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴾

سورەی المؤمنون ئایەتی ٧) وەلەئایەتێکی تردا فەرمانمان پـێ ئـەکات کـەوا سـپاردە بدەنـەوە خاوەنەکـەی خـۆی هـەروەك لـەقورئانی پـیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَـٰنَـٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ﴾

سورەی (النساء) ئایەتی ٥٨) واتە بەڕاستی خوای مەزن فـەرمانتان پـێ

ئەکات کە (ئەمانـەت) بدەنـەوە دەسـتی خاوەنەکـەی خـۆی بەڕاسـتی زۆر گوناهە (خیانەت) لەئەمانەتدا و چونکە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(لا إيمانَ لِمَنْ لا أمَانَةَ لَهُ وَلادينَ لِمَنْ عَهدَ لَه) رواه أحمد.

واتە ئەوەی ئەمانەتی نەبێ باوەری تەواوی بەخوا نییە وەلەسـەر هـیچ ئاینێك نییە وەلەفەرمودەیەکی تردا حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(أدّ الأمانَةَ إلىَ مَنْ أئتَمَنَكَ وَلا تَخُنْ مَنْ خانَكَ) رواه أحمد وأبو داود.

واتـە (ئەمانـەت) سـپاردە بـدەرەوە دەسـتی ئـەو کەسـەی بەئـەمینی داناوی (خیانەت) مەکە لەگەڵ ئەو کەسانەش کەخیانەتیان لەگـەڵ کـردوی وەلەفەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت:

(الأمانَةُ تَجلُبُ الرِزْقَ وَالخيانَةُ تَجْلِب الفَقْرَ). رواه الديلمي.

واتــە دەسـپاکی (ڕزق) دەهێنــێ و دەس پیـسیش هــەژاری دەهێنــێ وەلەفەرمودەیـەکی تـردا دەفـەرمووێت (الأمانـة غِنـىً) [1] رواهُ القـضاعي/. مانــای فەرمودەکــە بــەکورتی ئەوەیــە واتــە دەسـتپاکی دەوڵەمەندییــە (سەرنجێك) بەڕاستی ئەی برایانی خاوەن باوەڕ ئینسانی دەسـتپاك لـەدوو ڕووەوە دەوڵەمەند ئەبێت یەکەم لەڕووی ناوی پاك و ڕێز لێگرتنەوە دووەم لەڕووی دارایی و سامانەوە چونکە ئینسانی دەسپاك پایەی لـەناو خەڵکـدا بەرزە و هەمیشە بەچاکی باسی دەکەن و جێگای باوەڕە کەواتـە هەمیـشە لەسەرکەوتندا دەبێت و ڕۆژ بەڕۆژ پایـە و پلـەی بـەرز دەبێتـەوە لەهـەموو

---

(1) ای هي سبب الغنىً لان من اتّصفَ بها رغب الناس في معاملتهِ فيحسن حالهُ ويَكثر مالهُ بڕوانە کتێبی (فیض القرير شرح الجامع الصغير) بەرگی سێهەم لاپەڕە ١٨٢ دانراوی (عبدالرؤف المناوي).

لایەکەوە دەرگای خۆشی لێ دەکرێتەوە.

ئینسانی دەسپاك لەسەر ئەم ئەرزە

ڕووگەش و جوانە و هەردەم سەربەرزە

جێگای باوەڕە لەناو ئەم خەڵکە

کار و کردەوەی زۆر زۆر بەکەڵکە

ژیانی گوشادە و ڕۆزی دەهێنێ

لەهەردوو جیهان چاکە ئەبینێ

(وَصَلى الله عَلىَ سَيدِنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ وَأتباعِهِ وَبارِك لَهُمْ إلى يَومِ الدين).نبهني الله واياكم من نومة الغافلين وحشر واياكم تحت لواء سيد المرسلين.

# ئامۆژگاری چواردەهەم

## باسی (الحیاء واتە شەرم کردن ئەکات

(الحَمدُ للهِ جَعَلَ ألحياء مِنْ أعلى فضائل ألإسلام أسْتَغفرهُ وَأشهَدُ أنْ لا إله إلا الله عَنْ إدراكِ الغفولِ وَألافهامِ وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمَداً رَسُولَ الله أشـدُ النّاسِ حَياءً اللّهم صَلِ وَسَلَم وَبارِك عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ اتبعوهُ وكـانُوا أوْفياء).

برایانی موسڵمان خوای گەورە لەقورئانا دەفەرموێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ ﴾

واتـە ئـەی کەسـانێ کـەئیمانتان بـەخوا و پێغەمبـەری خـوا هێنـاوە مەچـوونە خانووەکـانی پێغەمبـەر کاتـێ نـەبێ کەرێگـە بـدرێن بـرۆن بـۆ خواردنی خۆراکی ئەمەیش بەمـەرجێ ئـەوە زوو نەرۆنـە ماڵـەوە چـاوەڕێی پێگەیشتنی چێشتەکە بکەن.

﴿ وَلَـٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّ ﴾

واتە بەڵام لەو کاتەدا کەبانگ کران بۆ خواردن برۆنە ماڵی پاشان وەکـو خواردنتان خواردو بڵاوە بکەن و بەبێ گیربونتان لەپاش خواردن بـۆ قـسە کردن لەگەڵ یەکتری چونکە ئەم گیربوونی ئێوە کەهەتا ئێستا دەتان کـرد پێغەمبەر دەڕەنجێنێ پێغەمبەریش شەرم لەئێوە دەکا دەرتـان بکـا بـەڵام

خوا شەرم لەدەربڕینی یاسای ڕاست ناکا.

﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ﴾

سوورەتی (الاحزاب) ئایەتی ٥٣) واتە ئەگەر شتێکتان خواست لەخێزانەکانی پێغەمبەر لەپشت پەردەوە لێیان بخوازن، هەروەها زانای بەناوبانگ (سید قطب) لەتەفسیرەکەیا (في ظلال– القرآن)دا دەفەرمووێت ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ فێرکردنی خەڵك بۆ ئەوەی نەڕۆنەماڵی پێغەمبەر (ﷺ) تا کاتێ ڕێگە بدرێن بەڵام ئەمەش ئەگەیەنێ کەوا حەزرەت (ﷺ) زۆر بەشەرموو (حەیا) بووە هەروەك زانای (ابن کەسیر)یش فەرموویەتی لە (تەفسیرەکەیا) [1] ئەی موسوڵمانەکان بەڕاستی شەرم کردن بەشێکە لەئیمان وە (فەزلێکی) گەورەیە لەفەزائیلی ئیسلام وەڕەوشتێکە لەڕەوشتی پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەهەموو کەس شەرم و ئابڕوی زیاتر هەبووە.

هەروەها لەفەرمودەیەکا دەفەرموێت:

(كَانَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) أشَدَّ حياءً مِنَ العَذْراءِ فِي خَدْرِهَا فإذا رَأى شيئاً يكرههُ عَرَفْنَاهُ فِي وَجهِهِ). متفق عليه.

واتە ڕەوشتی پێغەمبەر (ﷺ) بەشەرم تربوو لەکچێکی خۆی شاردووبێتەوە لەماڵەوە زۆر بەشەرم بێت وەئەگەر شتێکمان لێی بدیبایە پێی ناخۆش بێت ئەمان زانی لەڕووی (پیرۆزی) دەرئەکەوت وەلەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت:

---

(1) بڕوانە تەفسیری (سید قطب) بەرگی (٥)، ل ٢٨٧٧ وەسەیری تەفسیری (ابن کثیر بکە بەرگی (٥) ل ٤٩٢)..

(إن لِكل دينٍ خُلُقاً وَخُلُق الإسْلامِ الحَياُ) رواه إبن ماجه.

واته هەر ئاینێك ڕەوشتێكی هەیە وەڕەوشتی ئاینی ئیسلامیش شەرمە) جا لەعەبدوڵای كوڕی (عومەرەوە) (ڕەزای خوایان لێ بێت) ڕیوایەت كراوە/ كەپێغەمبەر (ﷺ) بەلای پیاوێكا ڕابوورد سەرزەنشتی برای خۆی ئەكرد پێی ئەوت ئەوەندە شەرمن مەبە پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو.

(دَعْه فَإنَ الحَياءَ مِنَ الإيمانِ) رواه البخاري.

واته وازی لێ بێنە چونكە (حەیا) واتە شەرم لەئیمانەوەیە، وەلەفەرمودەیەكی تردا دەفەرموێت:

(إن مِما أدرَكَ الناس مِنْ كَلامِ النبوّةِ الأولى إذا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ ماشِئْتَ) رواه البخاري.

واته بەڕاستی فەرمایشی لەو فەرمایشتانەی كەپێغەمبەرانی پێشەوە فەرموویانە وەگەیوە بەهەموو مرۆڤ ئەوەیە فەرموویانە كەشەرم و ئابڕووت نەبوو هەرچی ئەتەوێ بیكە (سەرنج) ئاگادار بە ئەم فەرموودەیەی دواوە بۆ هەڕەشەیە، هەزار (ڕەحمەت) لەم كەسە بێ كەوتوویەتی:

إذا لَمْ تَصَنْ عَرضاً وَلَمْ تَخشى خَالِقاً
وَتَسْتَحِ مَخلُوقاً فَما شئتَ فَاصْنَعْ
إذا لَمْ تَخشى عَاقِبةُ اللّيالي
وَلَمْ تَستَحي فَافْعَلْ مَا تَشاءُ
فَلاَ وَالله مَا فِي العَيْش خَيْرٌ
وَلا الدّنيا إذا ذَهبَ الحَياءُ(١)

---

(1) بڕوانە كتێبی (شرح الجرداني على الاربعين النووية) ل ١٤٧ دانراوی (محمد عبدالله الجردانی الشافعي).

# ئامۆژگاری پانزەهەم

## باسی ( العدالة ) واتە دادگەری ئەکات

(الحَمـدُ لله عَـزَ مِـنْ قائـلٍ ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾ وَأشـهَدُ أن لا إله إلا الله أمَرَ بالعَدلِ وَألزَمَ نَفْسَهُ بِهِ وَجَعَلَهُ مِنْ صِفاتِ المتقينَ وَأشَهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمَداً عَبدَهُ وَرَسولُه اللّهم صَلِ وَسَلم وَبارك عَلى سَيدنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلِهِ وَأصحابِهِ الذّينَ كَانُوا بالحقِ مُتَمَسكينَ وَبِالعَدْلِ مُنْصِفينَ وَفي رِضُوانِ رَبِهِمَ راغبينَ فَوَرَثْهُم جَناتِ النَعيم). أما بَعدُ.

لەدوای هەندێ (إخواني الكرام) برایانی بەڕێز خوای گەورە دفەرموێت لەقورئانی پیرۆزدا:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَـٰنِ ﴾ (سورەی (النحل) ئایەتی ٩٠).

واتە بەڕاستی خوای گەورە فەرمانمان پێ ئەکات کەدادپەروەربن و وەفەرمانمان پێ ئەکات بەچاکە کردن لەهەموو شتێکدا.

وَفي آية أُخر يقول الله في القرآن الكريم:

واتە لەئایەتێکی تردا خوای (تەعالا) لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ ٱلنَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِٱلْعَدْلِ ﴾سورەی (النساء) ئایەتی ٥٨.

واتە خوای گەورە فەرمانمان پێ ئەکات ئەگەر یەکێکمان بوو بەدەم

ڕاست لەناوەندی دوو کەسدا (یان دوو کۆمەڵ)دا یان بوو بە (قاضـي) واتـە دادوەر یا بوو بـە (حـاکم) واتـە دادگـەر پێویـستە بڕیـار بـدات بەدادگـەر و ڕاستی نابـێ لای یـەکێکیان زیـاتر بگـرێ لەلایەکـەیتر بەشـێوەیێ کـەمافی کەس نەدەن بەکەس و (حەقی) کەس نەفەوتێنن ، وەهەروەها لەئایەتێکی تـردا خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا﴾واتـە هـەرکاتێ قسەیەکتان کرد لەهەر شتێکدا ڕاست بڵێن﴿وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَى﴾سورەی (الانعـام) ئایـەتی ١٥٢) واتـە هەرچـەن ئـەو کەسـەیش کـەدەربارەی ئـەو قسەکە ئەکەن با خزمیشتان بێ، بەڕاستی ئەی خاوەن باوەڕان (عەدالەت) واتە دادگەری لەهەموو شتێکدا پێویستە چونکە بەهۆی دادگەرییەوە مافی خەڵك دەپارێزرێ و وەهەروەها هەموو ڕەوشتێکی بەرز لەدادگەریەوە پەرە ئەستێنێ و هەروەك هەندێك لەزانایان فەرموویانە:

(العَدْلُ أصلُ لِجَميعِ الأخلاقِ فَكلهَا مُتَفرعَةٌ عَنْهُ) [١]

واتە دادگەری سەرچاوەی هەموو ڕەوشتێکە چونکە هەموو ڕەوشـتێکی باش لەدادگەرییەوە پەڵ و لقی لێ ئەبێتەوە.

(سەرنجێك) پێویستە ئەوەش بزانین کەدادگەری تەنها لەکار بەدەست و (قاضي) واتە دادوەر داوا ناکرێت بەڵکو لەهەموو کەسێکدا داوا دەکرێـت و پێویـستە لەسـەر هـەمووەمان کەپـەیڕەوی خـوای مـەزن بکـەین لەسـەر (عەدالەت) و دادگەری بۆ نموونە پێویستە لەسەر باوك و دایکـان جیـاوازی لەنێو منداڵەکانیان نەکەن هەنـدێکیان لەهەنـدێك خۆشـتر بـوێ بەشـێوەێك

(1) بڕوانە کتێبی (الوعظ والارشاد) دانراوی (زین العابدین التونسي) ل ٩٣.

دڵی هەندێکیان بڕنجێ و پەرێشان ببن و غەم و تەم دایان بگرێت، یان لەکاتی بەخشینا پێویستە مرۆڤ دادگەربێت هەروەك حەزرەت (ﷺ) لەفەرموودەیەکدا دەفەرموێت:

(إتَقوُا اللهَ وَأعْدِلُوا في أوْلاَدكُمْ) رواه مسلم.

واتە پارێزگاری خوابکەن و ڕاست و دادگەربن لەشت بەخشینا بەمناڵەکانتان وەهەروەها پێویستە ئەگەر پیاوێك چەن خێزانێکی هەبوو دادگەربێت و لەنێوانیاندا نەك مەیلی یەکێکیانی هەبێ مەیلی یەکێکیانی نەبێ پێویستە وەك تەرازوو رایان بگرێت و بەهەموو شێوەیەك بەقەدەر توانا چونکە ئەگەر دادگەری بەکارنەهێنێت خوای گەورە لەڕۆژی دوایدا ئازارێکی زۆر کوشندەی ئەدات هەروەکو حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَنْ كانَ لَهُ إمرأتانِ فَمَالَ إلى أحَدِهما جَاءَ يَوْمَ القيامةِ وَشقه مائِلُ) رَواهُ أبو داود وأحمد. وَفي روايةٍ (وَلَمْ يَعْدِلْ بَيْنَهُمَا جَاءَ يَوْمَ القِيامةِ أحَدُ شِقيهِ سَاقِطٌ).

واتە هەرکەسێك دوو ژنی هەبێت مەیلی یەکێکیان زیاتر بکات لەڕۆژی دواییدا (حەشری) دەکرێت بەلەتێك وەهەروەها پێویستە مامۆستایش بەرانبەر بەقوتابییەکانی دادپەروەربێت و هەروەها پێویستە پێشەواش بەرامبەر بەگەلەکەی دادپەروەربێ و...هتد.

عَنْ أبي هُرَيرةَ (رضي الله عَنْهُ) قَالَ قَالَ رَسوُل الله (ﷺ) ثَلاَثَةٌ لاتُرَدُ دَعوَتُهُمْ الصائِمُ حَتىَ يَفْطِرَ وَالإمامُ العادِلُ وَدَعْوَةُ المَظْلُومِ).

رواه احمد والترمذي / واتە لەئەبووهورەیرەوە خوای لێ ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە پێغەمبەر (ﷺ) کەحەزرەت فەرموویەتی نزا و سکاڵای سێ

جـۆره کـەس لای خـوا نادرێتــە دواوە رۆژووگـر تـا بـەربانگ دەکاتــەوە پێـشەوای دادپـەروەر و ئینـسانی سـتەم لێ کـراو (ئاگاداربیـەك) بەڕاسـتی (العداله) واتە دادگەری (ئەساس) و بناغەی هەموو سەرکەوتنێك و خۆشـی و بەختەوەریەکە چونکە هەر گەلێك دادپەرست و دادگـەری بـەکاربهێنێت و ئەمە پاشەرۆژی کامەرانی و پیرۆزیە).

ئەگەر ئەتەوێ ڕۆڵە پەروەری

خوا لەتۆی ئەوێ ڕاستی و دادگەری

خۆشەویستی خوایە مرۆڤی دادگەر

بەکردەوەی چاك بەووتەی رەهبەر

(نَسأل اللهَ تعالى أنْ يَجعَلَنا بِفَضيلَةِ العَدْلِ وَأنْ يَشْعُرَ قُلوبَنَـا الرحمـةَ إنَـهُ أرحَمُ الراحِمينَ وَصَلى الله عَلَى سَيدنا مُحَمَدٍ وَعَلَى آلهِ وَصَحْبهِ أجمَعينَ).

# ئامۆژگاری شانزەهەم

## باسی ( الأصْلاحُ بْينُ الناس ) واتە ئاشتی لەنێوان موسڵمانان ئەکات

(الحَمْدُ لله يُحبَ للناسِ الوفَاقَ ولاَ يَرضى لَهُمْ النزاعَ والشقاقَ وأشْهَدُ أنْ لا إلـه إلا الله يُرضـيَ لعِبـادهِ أنْ يَعيـشُوا في سَـلامٍ مُتَحـابينَ وأشْـهَدُ أنَ سَـيدَنا مُحَمداً رَسوُل الله خَيْرُ مَنْ دَعا إلى الإصْلاحِ بَيْنَ المتخاصمينَ اللهم صَلِ عَلـى سَيدَنا مُحَمدٍ وعَلى آله وَصَحبه الذينَ طَهَرتْ مِنَ الحَقْدِ قُلُـوبَهُمْ وانْطَـوتْ عَلـى العود نَفُوسَهمْ فعَاشُوا أقْوياءَ مُتَحدينَ).

برایانی خاوەن باوەڕ خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴾

سـورەی (الحجـرات) ئایـەتی ١٠) واتـە کۆمـەڵی موسـوڵمانان خـاوەن باوەڕی برای یەکترن ئادەی مادام وایە ئاشـتی و کـۆکی بخەنـە نـاو بـەینی براکانتانـەوە وەپارێزگـاری خـودا بکـەن وەهـەر لـەو بترسـن و سەرپێـچی بەفەرمانەکانی مەکەن و خۆتان لەخراپە بپارێزن هیـوا وایـە لـەلای خـواوە رەحمتان پێ بکرێ. وەلەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ لَّا خَيْرَ فِى كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍۭ بَيْنَ ٱلنَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴾

سـورەی (النسـاء ئایـەتی ١١٤) واتـە ئـادەمیزاد خێـر و خۆشـی و

پیاوەتیەك لەكۆبوونەوەیانا نییە وەهەر چپەچپ و قسە و ڕاز و نیازێكی تیا بكەن بەهیچ ئەچێت واتە خوای گەورە (جەزایان) ناداتەوە بەچاكی مەگەر ئەو كۆبوونەوەیە كەڵك و سوودی هەبێ كەببێ بەهۆی چاكەو یەكخستنی خەڵك بەڕاستی هەركەس لەكۆبوونەوەیەكا خەڵك ڕێك بخا و بیان خاتە سەر ڕێگای مرۆڤایەتی و (ئینسانیەت) ئەوە خوا (ئەجر) و پاداشتێكی زۆر گەورەیان ئەداتەوە.

وَعَنْ عَبْدالله بنْ عُمَرَ (رضی الله عنه) قالَ قاَلَ رَسُول اللهِ (صلی الله علیهِ وَسَلَم).

واتە لەعەبدوڵلای كوڕی عومەرەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) دەگێڕنەوە ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(أفْضَلُ الصدَقَة إصلاحُ ذاتِ البَينِ) رواة الطبراني والبزار.

واتە گەورەترین خێر و صەدەقە ئاشتی و ڕێك خستنە لەبەینی خەڵكدا وەبەفەرمودەیەكی تردا ئەبوو(دەردا) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێت: حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(ألاَ أخْبِرَكُمْ بأفْضلَ مِنْ دَرَجةِ الصيامِ وَالصلاةِ وَالصَدَقَة قَالُوا بَلَى).

واتە ئایە ئاگادارتان بكەمەوە بەگەورەترینی پلەی نوێژ و ڕۆژوو[1] (سەدەقە) یارەكانی گوتیان بەڵێ:

(قَاَل إصلاحُ ذاتِ البَينِ).

واتە حەزرەت (ﷺ) فەرمووی خەڵك خستنەیەك و نەهێشتنی شەڕ

---

(١) مەبەست نوێژوو ڕۆژی سوننەتەو نەك فەرز چونكە (اصلاح ژات البین) خێرترەو لەنوێژوو ڕۆژی (سوننەت)

لەنێوانیانا.

(فَأن فَسادَ ذَاتِ بَينٍ هيَ الحَالقَة) رواه أحمد وَ أبو داود.

واتە بەڕاستی تێك دانی خەڵك و ئاژاوە لەبەینی خەڵکا ئاین ناهێڵێ و پاکی ئەکاتەوە وەلەفەرموودەیەکی تردا ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

(تُفْتَحُ أبْوابَ الجَنةِ يَوْمَ الإثـنْينِ وَيَومَ الخَميسِ فَيَغْفرُ فيهما لكلَ عَبْدٍ لايُشرِكْ باللهِ شَيْئاً إلا رَجلٌ كَانَتْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أخيهِ شَحْنَاءُ فَيُقال أنظُروا هَذْينِ حَتى يَصْطَلِحَا) رواه مسلم.

واتە دەرگاکانی بەهەشت لەهەموو دووشەممە و پێنج شەممەیەکدا دەکرێتەوە و کردەوەی مرۆڤ لەخزمەت خودا ئاشکرا ئەکرێ و هەر کەسێك داوای لێ خۆشبوون بکا لێی خۆش ئەبێ و لەهەموو کەسێك کەهاوەڵی بۆ خوا پەیدا نەکردبێ و مەگەر لەم کەسە خۆش نەبێ کەلەگەڵ برای موسڵمانی خۆی (ڕق و قینی) هەبێ تا ئاشت نەبێ و خوا ئەفەرموێت لێیان گەڕێن تاکوو ڕێك دەکەون و واتە دوایان بخەن تا (اصلاح) دەبن هەزار ڕەحمەت لەم کەسە بێ کەفەرمویەتی:

إن الفَضائِلَ كلها لَو جُمِعَت

رَجَعَتْ بِأجْمَعِهَا إلى شَيْئينِ

تَعْظيمُ أمْر اللهِ جَل جَلالهُ

وَالسَعْيُ في إصْلاحِ ذاتِ البَينِ

(وَصَلى اللهُ عَلىَ سَيدَنا مُحَمدٍ وَعَلى آلهِ وَأصحابِهِ وَمَنْ تَبِعَهُم بِإحْسانٍ إلى يَومِ الدين).

# ئامۆژگاری حەڤدەهەم

## باسی (الأمرُ بِالمعرُوف) وَالنَهي عَن المُنكَر) واتە فەرمان بەکردەوەی باش و قەدەغە لەکردەوەی بەد و ناشیرین ئەکات

(الحَمْدُ لله يُحِب الصلاَحَ وَيُبغِضُ الفَسادَ وَأشهَدُ أنْ لا إلـه إلا الله أمَرَ بِالمَعْرُوف وَالنَهْي عَنِ المُنْكَرِ لِخَيِر العِبادِ وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً رَسُولُ الله خَيْر هادٍ اللّهمَ صَلِ وَسَلمْ عَلىَ سَيدنَا وَعَلى آلـهِ وَصَحبهِ الآمِرينَ بِالمَعرُوفِ وَالناهِينَ عَنِ المُنكَرِ وَعَلى مَنْ تَبعَهُم بِإحسانٍ إلى يَومِ الدين).

أما بَعدُ فَقَدْ أثنى اللهُ تَعالَى عَلىَ الأُمةِ الإسلامية.

واتە لەدوای هەندێ بەڕاستی خوای مەزن مەدح و سەنای میللەتی ئیسلام ئەکات و دەفەرموێت:

﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾سورەی (آل عمران) ئایەتی ١١٠).

واتە: ئێوە چاکترین میللەتن لەناو هەموو خەڵکاندا بەدەرکەوتن ئەوەش لەبەر ئەوەیە فەرمان ئەکەن بەچاکە و (نەهی) دەکەن لەخراپە چونکە باوەڕتان بەخوا هەیە.

(أيها المُسلِمونَ فَالأمرُ بِالمَعْروفِ وَالنَهيُ عَنْ المُنْكَرِ مِنْ أعظَمِ واجباتِ الشَريعَةِ المُطَهرَةِ)

واتە ئەی موسڵمانان هاندان بۆ چاکە و بەرگری لەخراپە گەورەترین پێویستییەکانی (شەریعەتی) پاك و خاوێنە وەخوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾سورەی (ال عمران) ئایەتی (١٠٤).

واتە: باکۆمەڵێك هەبن لەناو ئێوەدا خەڵك بانگ بکەن بۆ سەر رێگای چاکە وەفەرمان بەچاکە و قەدەغە لەخراپە بکەن ئەگەر وابن هەمیشە سەرکەوتوو دەبن وەلەئایەتێکی تردا دەفەرموێت هەروەك لەسەر زوبانی لوقمانەوە (ﷺ) کەئامۆژگاری کورەکەی کردووە وەك قورئان دەفەرموێت:

﴿ يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴾

سورەی (لوقمان) ئایەتی ١٧) واتە کوڕم نوێژ و خواپەرستی بکە و فەرمان بکە بەچاکە کردن و قەدەغە بکە لەخراپەکردن وەبەئارام بە لەسەر ئەو شتانەی لەم ڕووەوە تووشت ئەبێ چونکە بەڕاستی ئەم کردەوەیە لەئیشە گەورە و گرنگەکانە/ وەهەروەها حەزرەتی پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَنْ رَأَىَ مِنكُمْ مُنكَراً فليغيرهُ بِيَدِهِ فَإنْ لَمْ يَسْتَطيع فَبِلسانه فَإنْ لَمْ يَستَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلكَ أضعَفُ الإيمانِ) رواه مسلم.

واتە ئەگەر یەکێك لەئێمە کارێکی نارەوای دی پێویستە بەدەست بیگۆڕێت ئەگەر نەیتوانی بەزمان داوای گۆڕانی بکات ئەگەر ئەوەشی بۆ نەکرا لەدڵی خۆیدا و ڕقی لێی بێ و بێزاری لەم کردەوەیە دەربڕێت ئەمەی دوایی بۆ ئەو کەسانەیە کەباوەڕیان زۆر کز و لاوازە وەلەفەرمودەیەکی تردا (حوزەیفە) خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لەپێغەمبەرەوە (ﷺ)

دەفەرموێت:

(وَالذي نَفسْي بِيدهِ لَتَأْمُرَن بِالمَعْروف ولَتَنْهَونَ عَنِ المُنكَرِ أوْ لِيُوشكَن الله يَبْعثُ عَليْكُم عِقاباً مِنْهُ ثُم تَدْعونَهُ فَلا يَستَجيب لَكُمْ).

رواه الترمذي/ واتە بەخوا قەسەم کە (گیانی) منی بەدەستە ئەبێ فەرمان بدەن بەچاکەکردن وەقەدەغە بکەن لەخراپەکردن یاخود بێ گومان نزیکە وای لێ دێت خوا سزایەکی ئەوتۆ ڕەوانە ئەکات ئەگەر دوعاش بکات خوا لەبەینی بەرێ دوعاکەتان (قەبووڵ نابێت) وەلەفەرمودەیەکی تردا حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَا مِنْ قَوْمٍ يَعْملُ بِالمَعاصي ثُمَ يَقْدرونَ عَلىَ أنْ يغيروا فَلاَ يُغيروا إلا يُوشَكُ أنْ يَعمهُم الله مِنهُ بعِقَابٍ) رواه أبو داود عن أبي بكر الصديق (رضى الله عَنهُ).

واتە هەر گەلێك یاخی بوون لەخوا نەترسی بکەوێتە ناویان و توانای گۆڕینیان هەبێت بەڵام نەیگۆڕن بێ گومان وای لێ دێت خوا بەسزای خۆی هەموویان بگرێتەوە).

**فەرمان بەچاکە و قەدەغە لە (مونکەر)**

**پێویستە لەسەر هەموو بەشەر**

**بەقەدەر و توانا ئەمر بە (مەعروف)**

**ئامۆژگاری کردن بەگوێرەی زرووف**

**گۆڕینی خراپە بەدەست و زمان**

**فەرزی کیفایەیە بۆ خاوەن ئیمان**

(وَصَلى اللهُ عَلَى سَيدنا مُحَمدٍ الآمِرُ بِالمَعْرُوفِ وَالناهِي عَنِ المُنْكرِ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلمْ).

# ئامۆژگاری هەژدەهەم

## باسی ( پایەکانی ئیسلام و ئیمان ) ئەکات

(الحَمدُ للهِ الذي آمنّـا ونُـؤمِنُ بـِه وَهـوَ الحَـيُ القَيـوم ونَـشهَدُ أنْ لا إلـه إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ أشهَدُ أنَهُ رَبُناَ وَإلَهَنا ألذي لا نَعْبدُ غَيْرهُ وَأشهَدُ أنّ سَـيدَنا مُحَمداً عَبدهُ ورَسوُلَهُ جاءَ بـِالنّورِ الـساطعِ وَالبُرْهـانِ القـاطعِ والهدايـةِ التامـةِ وَالسعادَة العامة صَلَوات الله وَسَلامهُ عَليْه وَعَلى آله وَأصحابه الذينَ أعْتَصَموا بِحَبْلِ اللهِ المتينِ وكِتَابَهُ المُبينِ فَفازوُا بِالثَواب المُقيم في جَنـاتِ النَعـيم). أمـاَ بَعْدُ.

لەدوای هەندێ ئەی برایانی خـاوەن بـاوەڕ و موسـڵمانە ئازیزەکـانم بەڕاسـتی خـوای گـەورە لەقورئانـدا و (مـەدح و سـەنایی) ئـاینی ئیـسلام ئـەکات و دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾

سورەی (آل عمران) ئایەتی ١٩) واتە بەڕاسـتی ئاینـێ کەبـەلای خـواوە بەنرخ بێ ئاینی بەرزی ئیسلامە وەهەروەها حەزرەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەبارەی ئاینی ئیسلامەوە دەفەرموێت:

(ألإسْلامُ أنْ تَشهَدَ[1] أنَ لا إله إلا الله وَأنَ مُحَمَداً رَسوُلُ اللهِ وَتقيمُ الـصَلاةَ

---

(1) (الشهادە) واتە یەکەم شایەتیمان ئەوەیە (اشهَدُ أن لا إله إلاّ الله وَأشهَدُ أنَ مُحَمَداً رَسوُل الله) واتە باوەڕم هەیە کەهیچ خوایە نییە تەنها یەزدانی پاکی پەروەردگار نەبێت وەهەروەها باوەڕم هەیە کەحەزرەتی محمد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە و ڕەوانە کراوی خوایە و هەڵگری ئاینی ئیسلامە بۆ سەر هەموو کەس تا (جنۆکە) و فریشتەش وەڕەوانە کراوە بە (شیر و بەنەزیر) واتە موژدەدەر و ترسێنەر بۆ ئەم باسە بڕوانە کتێبی (عَقيدَتُكَ أيُها المُسلِمْ) دانراوی (عبدالحليم عبدالرحمن السعدی) لاپەڕە ٢٣.

وَتُؤْتِيَ الزَكاةَ وَتَصومَ رَمَضانَ وَتُحِجَ البيتَ إن إستَطعتَ إليهِ سَبيلاً). رواه الخمسة.

واته موسڵمانەتی ئەوەیە شایەتی بدەی کەوا لە (خوا) بەولاوە هیچ خوایەکی تر نییە و محمد (ﷺ) رابەر و نێردراوی خوایە/ هەروەها نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و مانگی رەمەزان بەڕۆژوبیت وەئەگەر لەتواناتان دابوو (حەجی) ماڵی خوا بکەیت و چونکە بەڕاستی (ئەی خاوەن باوەڕان) هیچ ئاینێك وەرناگیرێ مەگەر ئاینی ئیسلام نەبێت هەروەك حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکا دەفەرموێت:

(أُمِرْتُ أنْ أُقاتِلَ الناسَ حَتى يَشْهَدوُا أن لا إلهَ إلا الله وَأنْ مُحَمَداً رَسوُلُ اللهِ وَيقيمُوا الصَلاةَ وَيُؤتُوا الزكاةَ فإذا فَعَلُوا ذَلكَ عَصمُوا مِني دِماءَهُم وَأموالَهُم إلا بِحق الإسلامِ وَحِسابَهُمْ عَلى اللهِ) رواه الخمسة.

واته پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی فەرمانم پێ کراوە کەلەگەڵ خەڵکی بجەنگم تا بڕوا دێنن بخودا و پێغەمبەر و نوێژ دەکەن و زەکات دەدەن ئەگەر ئاوایان کرد خوێن و سامانیان دەپارێزرێ جگە لەوەی کەبەهەق لێیان دەستێنرێ، ئەی برایانی خاوەن باوەڕانم پێویستە ئێمەی موسڵمان باوڕیشمان بەشەش شتی زۆر گرنگ هەبێت هەروەك حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکا دەفەرموێت:

(الأيمانُ أنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلائِكَتهِ وَكُتُبهِ وَرُسُلهِ وَبالْيَومِ الآخرِ وَبالقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِهِ) رواه مسلم.

واته باوەڕی ئەوەیە باوەڕت ببێت بەخوا و بەفریشتەکانی خوا و (کتابە) پیرۆزەکانی خوا و بەڕۆژی دوایی قیامەت و بەقەزا و قەدەر لەچاکە

و لەخراپە کەهەمووی لەخواوەیە (سەرنج) برا موسڵمانەکانم پێویستە مرۆڤی خاوەن هۆش و (فامیدە) هەرگیز لانەدا لەفەرمودەکانی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) وەهیچ کاتێك لەسەر بیر و باوەڕی ئیسلام نەترازێ و بەردەوام بپارێتەوە لەپەروەردگاری خۆی وەك قورئان دەفەرموێت:

﴿ رَبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴾

سورەی (آل عمران) ئایەتی/ ١٩٣) واتە خوای ئێمە/ ئێمە گوێمان لەبانگ کەرێك بوو مەبەست پێغەمبەر (ﷺ) بانگی خەڵکی دەکرد بۆ باوەڕی کردن و ئێمە سوپاس بۆ تۆ باوەڕمان هێنا کەواتە خوایە لەوە ببورە لەو گوناهانەی کەلەدەستمان دەرچووە خراپەمان بسڕەوە و لەگەڵ چاکە کەراندا بمان مرێنە واتە لەسەر پەیڕەوی ئەوان گیانەکەمان لێ وەربگرە و با هەر لەسەر حاڵ و کرداری چاکی ئەوان بین تا ئەوەی کەلەو (دنیا) دەست ئەوان دەکەوێت دەست ئێمەش بکەوێت/ هەزار (ڕەحمەت) لەم کەسە بێ کەفەرمویەتی[1] :

پێنج ڕوکنی ئیسلام بابزانین چییە

باوەڕیان پێ بکەین ئەمری ڕەببیە

ئەوەڵ کەلیمەی شەهادە و ئیمان

دووەم پێنج فەرزن بەشەرت و ئەرکان

سێیەم سی ڕۆژەی مانگی ڕەمەزان

---

(1) بڕوانە کتێبی (عقیدەی کوردی) دانراوی (شێخ عبدالسمیع) ل ٤، بڕوانە کتێبی (بارانی رەحمەت) لاپەڕە ١٣٠.

(مَحْفُوظ المُفْطِر) هەم لەغوو بوطلان

چوارەم زەکاتە لەگەڵ سەر فیطرە

پێنجەمین حەججە ئەو لەگەڵ عەمرە

ئەو پێنج ڕوکنانە بەفەرزیان بزانین

قەت تەرکیان نەکەین گەر موسڵمانین

مامۆستا (نامیش) دەفەرموێت لەهەندێك هۆنراوەی خۆی لەکتێبی (بارانی ڕەحمەت)دا (ص ١٣٠).

بابی دووهەممان شەش فەصلە عەیان

ئەرکان ئیمان بۆت ئەکەن بەیان

ئیمان بەخوا هەم بەفریشتە

پێغەمبەرانی عاڵی سروشتە

بەو کتێبانەی جبریلی أمین

هێنانی بەحەق لەبۆ مرسلین

بەقیامەت و بەقەزا و قەدەر

لەسەر فەرمودەی أعلای پێغەمبەر

ئەم ئەرکانانە (أصُولی) دینن

مایەی ڕزگاری گشت مؤمنین

(وَصَلى اللهُ عَلَى سَيدنا مُحَمدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبِهِ وَسَلَمْ)

# ئامۆژگای نۆزدەهەم

## باسی ( فەزڵ ) و گەورەیی ( نوێژ ) ئەکات

(الَحمدُ للهِ الذي جَعَلَ الصَلاةَ عَمادالدينِ وَجَعَلَها كِتاباً مَوْقُوتاً عَلَى المُؤْمنِينَ وَأَلْزَم بِهَاوَحَثَهم عَلَيْها في مَحْكم الذكرِ المُبين فَقالَ تعالى ﴿ حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ ﴾ وقال تعالى ﴿ وَٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾ وَنَشهَدُ أَنْ لا إله إلا الله وَحدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَنَشهَدُ أن سَيدنَا مُحَمَداً عَبْدهُ وَرَسولُه القَائل (رَأْسُ الأمرِ الإسلامُ وَعَمودهُ الصلاةُ وَذرْوَةِ سَنامه الجِهادُ) وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَليهِ وَعَلىَ آلهِ وَأَصحابهِ وَعَلىَ التابِعينَ لَهُمْ بِاحسانٍ إلى يَومْ الدين. أما بَعدُ فَيا إخْواني المُؤْمنِينَ:

يقول الله تعالى في القرآن الكريم:

واتە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾

سورەی (العنكبوت) ئایەتی ٤٥) واتە بەڕاستی نوێژ دەبێتە هۆی دووركەوتنەوە لەكاری ناڕەوا و خراپە و ئیشی بەد وەبێ گومان نوێژكردن كەیاد و (ذكر) و ناوهێنانی خوایە زۆر گەورەیە وەلەئایەتێكی تردا دەفەرموێت:

﴿ رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾

سوورەتی (النور) ئایەتی (٣٧) واتە یادی خوای تیا ئەکەن بەپاکی پیاوانێك کەبازرگانی و کڕین و فرۆشتن خەریکیان نەکات لە (ذکری) خوا و بەرپا کردنی نوێـژ) بـرا موسـڵمانە بـەرێزەکانم بەڕاستی خـوای گـەورە لەقورئانی پیرۆزدا نزیکەی لە (٨٦) شوێندا ناوی نوێژ ئەبات و فەرمانی پێ ئەدات لەهەر شوێنێکدا و بەجۆرێك چونکە بەڕاستی نوێژ کۆڵەگەی ئـایین و مایـەی پەیوەنـدی بەندەکانـە بـەخواوە وەجیاکـەرەوەی موسـڵمان و ناموسـڵمانانە لەیـەك [1] وەهـەروەها حـەزرەتی پێغەمبـەریش (ﷺ) دەفەرموێت:

(خَمْسُ صَلَواتٍ كَتَبهن اَللهُ عَلَىَ العِبادِ مَنْ آتىَ بِهِن لَمْ يَضَعْ مِنْهن شَيْئاً إسْتِخفافاً بِحَقِهِنَ كانَ لَهُ عِنْدَ اللهِ عَهْدٌ أنْ يُدْخِلَهُ الجنةَ).

واتە پێنج نوێژ هەیە خوا (فەرز و) پێویستی کردووە لەسەر بەندەکانی خۆی ئەگەر بیانکا و هیچیان نەفەوتێنێ وەگاڵتە نەکات بەمافی نوێـژەکان واتە بەڕێك و پێکی جێ بەجێیان بکات ئەو کەسە پەیمانێکی لای خوا هەیە کەبیخاتە ناو بەهەشتەوە.

(وَمَنْ لَمْ يأتِ بِهِن فَلَيْسَ لَهُ عِندْ اللهِ عَهْدٌ إنْ شاءَ عَذَبَهُ وَإنْ شاءَ غُفِرَ لَهُ).

رواه مالك وابو داد والنسائي عن عبادة بن صامت (رضي الله عنـه) واتـە هەر کەسێکیش نـەیانکا و بـەر ئـەو پەیمانـە ناکـەوێ خـوا ئەگـەر ویـستی ئازاری ئەدا و ئەگەر ئارەزووشی کرد لێی خۆش دەبێ، وەلەفەرمودەیـەکی تردا حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(أرأيْتُم لَوْ أن نَهْراً بِبابى أحَدَكمْ يَغتَسِلُ مِنهُ كُلَ يَوْمٍ خَمْسَ مَراتٍ هَلْ

---

(1) بڕوانە تەفسیری شێخ (محمدی خال) بەرگی دوهەم/ لاپەڕە ١٦٧).

يَبْقي مِنْ دَرْنِهِ شَيءٌ ؟).

واتە ئاگادارتان بکەمەوە بەڕاستی ئەگەر چۆم و جۆگە ئاوێکی (جاری) بەبەردەمی ماڵەکەتاندا بڕوا و ڕۆژی پێنج کەڕەت خۆتانی لێ بشۆن ئایا چڵك و پیسی بەبەدەنتانەوە دەمێنێ؟

(قَالوُا لاَ يَبْقى مِنْ دَرْنه شَيءٌ قَالَ فَذلِكَ مِثْلَ الصلواتِ الخَمْسِ يَمْحُوا الله بِهن الخَطايا) رواه الخمسة.الا ابا داود.

واتە یارەکانی لەوەلاما گوتیان نەخێر هیچ چڵك و پیسی پێوە نامێنێت، حەزرەت (ﷺ) فەرمووی ئاوایە وێنە و (میسالی) پێنج فەرزە نوێژەکان ئینسان پاك ئەکەنەوە لەژەنگی گوناە (سەرنجێك) هەروەها پێویستە بزانین نوێژ بۆ کێ ئەکەین و گفتوگۆ لەگەڵ کێ ئەکەین و لەبەر دەستی کێ ڕائەوەستین و دائەنیشین چونکە نوێژی بەهۆش و گۆش زۆر گرنگە وەهەر نوێژێك خاوەنەکەی قەدەغە نەکاو لەکاری (فاحشە) و نالەبار و تاوان بەپێچەوانەوە دەبێتە دووری لەخوای مەزن هەروەك حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَنْ لَمْ تَنْهَهُ صَلاتُهُ عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَرِ لَمْ يَزْدد مِنَ اللهِ إلا بعُداً) رواه الطبراني.

واتە کەسێ نوێژەکانی ڕێگای خراپەی لێ نەگرن و قەدەغەی کاری ناشیرین و ناپەسەندی لێ نەکەن هەر لەخوای گەورە دوور ئەکەوێتەوە).

(وَصَلى الله عَلىَ سَيدنَا مُحمر وَعلىَ آلهِ وَأصْحَابهِ أجمَعِينَ) نبهنى الله واياكم نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين.

# ئامۆژگاری بیستەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( زەکات ) ئەکات

(نَحْمدُ اللهَ وَنستعينَهُ ونَعوذُ باللهِ منْ شرورِ أنْفُسِنا وَسَيئاتَ أعْمالِنَا ونُصلي وَنُسَلِّمُ عَلى مَنْ أرسلَهُ اللهُ ليُطَهِرَ نفوسَنَا منْ أرْجاسها ويَصلُ بها إلى سَعادَتها وَأشهَدُ أنَ لا إله إلا اللهُ قَضَتْ حِكْمَتهُ بانْ يُربْط غنينَا بِفقيرِنَا وقَوِيَنا بِضَعيفنَا حَتى يَصيرَ المُؤْمنُ للْمُؤْمن كَالْبُنيانِ يَشدُ بَعْضَهُ بَعْضاً وَأشهَدُ أن مُحَمداً رَسُوْل اللهِ دَاعِي الأُمةِ إلى طَرِيق الرشادِ وَهَادِيَها إلى الصراط المُستَقيم).

(وَصَلى اللهُ عَلىَ سَيدنَا مُحَمدٍ وَعَلىَ آلهِ وَأصحابهِ أجمَعينَ)

لەدوای هەندێ ئەی برایانی خاوەن باوەڕ خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ﴾

سورەتی (النور) ئایەتی (٥٦) واتە نوێژەکان بەجێ بێنن و زەکاتی ماڵتان بدەن و فەرمانبەری پێغەمبەر بکەن لەهەموو کارێکدا و بەهەموو بارێ لەچاکە و خراپە بەڵکو خوا ڕەحمتان پێ بکا) وەلەئایەتێکی تردا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم﴾

سورەتی (التوبە) ئایەتی ١٠٣) واتە ئەی پێغەمبەر لەماڵ و سامانەکانیان زەکات وەربگرە تا دڵ و دەرونیان پاك بکاتەوە وەپیت و

بەرەکەت بکەوێتە ماڵەکەشیان) هەروەها بەڕاستی ئەی برایانی موسڵمان زەکات جێ بەجێ کردن لەئاینی ئیسلاما یەك جار زۆر گرنگە بۆیی خوا لەقورئانی پیرۆزدا نێزیکەی لە (٢٨) شوێندا باسی نوێژ و زەکاتی بەیەکەوە دەکات و دەفەرموێت.

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾

وەهەروەها حەزرەتی پێغەمبەریش (ﷺ) لەزۆربەی فەرمودەکانی خۆیدا باسی نوێژ و زەکات بەیەوەکەوە باسیان دەکات بۆ نمونە وەك فەرمودەی.

(أُمِرْتُ أنْ أُقاتِلَ الناسَ حَتى يشهَدُوا أنْ لا إله إلا الله وَأن مُحَمداً رَسوُلُ اللهِ وَيَقيمُوا الصَلاةَ وَيؤُتُوا الزكاةَ فإذاَ فَعَلوُا ذلِكَ عَصَمُوا مِني دِماءَهُمْ وَأمْوالَهُمْ إلا بِحَقِ الإسلامِ وَحِسابُهُمْ عَلىَ اللهِ) متفق عليه. ماناکەی باس کراوە لە (پایەکانی ئیسلام و ئیمان) پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات).

(وَرَدَ في الحَديث الشريف/ عَنْ أبي أيوبَ (رضى الله عَنْهُ) (أنَ رَجُلاً قالَ لِلنبي (ﷺ) أخبرني بِعَمَلٍ يَدْخُلني الجَنةَ)؟

واتە وەرگیراوە لە (حەدیسی) شەریفا لەئەبی ئەیوبەوە (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت پیاوێك داوای لەحەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) کرد گوتی ئەی پێغەمبەری خوا کردەوەیەکی وام پێ بڵێ کەپێی بچمە بەهەشتەوە ئەویش لەوەڵاما پێی فەرموو.

(قالَ تَعْبدُ اللهَ لاَتُشْرِكْ بِهِ شَيْئاً وَتُقيمُ الصَلاةَ وَتُؤْتِي الزكاةَ وَتَصِلُ الرَحِمَ). متفق عليه.

واتە بەندایەتی خوا بکە و هاوەڵ و هاودەمی بۆ پەیدا مەکە نوێژەکانت

بەتەواوی بکە و زەکات بەجێ بهێنە و بەدروستی پەیوەندی خزمایەتی بەجێ بهێنە، هەروەها ڕیوایەت کراوە لەجەریری کوڕی عەبدوڵاوە (خوای لێ ڕازی بێت) کەیەکێك بووە لەیارانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت پەیمانم بەست لەگەڵ پێغەمبەری خوا لەسەر ئەوەی نوێژەکان بەتەواوی جێ بەجێ بکەم (وەزەکات) بدەم وەئامۆژگاری هەموو موسڵمانان بکەم، بوخاری و مسلم/ ڕیوایەتیان کردووە (سەرنجێك) بەڕاستی زەکات گۆشە و پایەیەکی زۆر گەورەیە لەپایەکانی ئیسلامەتی خوا لەماڵ و سامانی دەوڵەمەندەکان بەپێویستی گێڕاوە بۆ ئەوەی بدرێ بەهەژار و بێ نەوایان چونکە بەڕاستی سوود و قازانجی زەکات یەك جار زۆرە لەئەندازە نایەت بۆ نمونە کەمێك باسی ئەکەین خوا زەکاتی لەسەر دەوڵەمەندەکان فەرز کردووە بۆ ئەوەی کەکۆمەڵ سودی گشتی لێ وەربگرێ وەکو ڕزگارکردنی هەژاران و بێ نەوایان لەدەست کورتی و زەبوونی یارمەتی دانیان بەماڵ و سامان بۆ ئەوەی بتوانن بژین لەم جیهانەدا و بەڕاستی زەکات پەیوەندی برایەتی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاران پەیدا ئەکات و خۆشەویستی و (مووحبەت) دروست ئەکات لەبەینی هەژار و دەوڵەمەندا وەبێجگە لەمانەش پاداشتێکی گەورەی هەیە لەلای خواوە (ڕەحمەتی) بەرئەکەوێ (وەسەڵاواتی) پێغەمبەری بۆ ئەچێ وەفریشتە نزا و تکای خێری بۆ ئەکەن.

(وَصَلَّىٰ اللهُ عَلَىٰ سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلَىٰ آلِهِ وَأَصحابِهِ الذينَ أَقامُوا الصَّلاةَ وَآتوُا الزَكاتَ وَرِضوانُ اللهِ عَلَيْهِمْ أَجمَعِين).

# ئامۆژگای بیست و یەکەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( ڕۆژووی مانگی رمضان ) ئەکات

(الحَمدُ للهِ الذي أنْزلَ القُرآنَ في شَهْرِ رَمضانَ وَفَرضَ علَىَ المُؤْمنِينَ صِيامَهُ وَجَعَلَهُ أحَدَ أركانِ الإسْلامِ وَشُعَبِ الأيمانِ وَأشهَدُ أنْ لا إلـه إلا اللهُ وَحـدَهُ لا شَريكَ لَهُ ذوُ الجُودِ وَالفَضْلِ وَالإحسانِ وَأشهَدُ أنْ سَيدَنا مُحَمداً عَبْدهُ وَرَسولُهُ المَبْعوثِ إلى الثُقلينِ الإنْسِ وَالجان اللهُمَ صَلِ وَسَلمْ عَلىَ سَيدنا مُحَمداً وَعَلـىَ آلهِ وَأصْحابهِ الهُداة الأعْيان). أما بَعْدُ فَيا إخواني الكِرام:

واتە لەدوای هەندێ ئەی برایانی بەڕێزم.

(إعْلَموُا رَحِمَكُم اللهُ تَعالى).

واتە ئێوە بزانن ڕەحمەتی خواتان لێبێت.

(أنَ شَهْرَ رَمضانَ الذي اُنزِلَ فيهِ القُرآنَ).

واتە بەڕاستی مانگی ڕەمەزان ئـەو مانگەیـە کـەقورئانی تیـا نێرراوەتـە خوارێ.

(هُوَ الذي كَتَبَ اللهُ عَلْينَا صِيامَهُ وَأوْجَبَ تَعظِيمَهُ وَإحترِامَهُ).

واتە خوای گەورە ڕۆژووی لەسـەر ئێمـە پێویـست کـردووە ئێمـە ڕێـز و حورمەتی ئەم مانگە بگرین وەهەروەها خوا لەقورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾

سـورەی (البقـره) ئایـەتی ١٨٣) واتـە ئـەی ئـەو کەسـانەی کـەخاوەن

باوەڕن ڕۆژوتـان لەسـەر پێویـست كـراوە هـەروەك لەسـەر ئەوانـەی پـێش ئێــوەش لەســەریان پێویــست كــراوە بــەڵكو تكــا وایــە بــەهۆی ئــەم خواپەرستنەوە خۆتان بپارێزن لەخراپە و خراپەكاری.

عَنْ أبي هُرَيرةَ (رَضى الله عَنْهُ) عَنْ النَبي (ﷺ) يَقوُل قَالَ اللهُ تعالى:

واتە لەئەبوو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەویش لەپێغەمبـەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە خوای گەورە لە (حەدیسی) قودسیدا فەرمویەتی:

(كُلَ عَمَلِ إبنِ آدمَ لَهُ إلا الصيامُ فَإنَهُ لـي وَأنَـا أجْـزي بِـهِ وَالـصيام جُنَـةٌ[1] أي سِترٌ مِنَ النَارِ[2])مُتَفقٌ عَليه .

واتە هەموو كردەوەیەكی ئادەمیزاد هەر بۆ خۆیەتی تـەنها ڕۆژوو نـەبێ هەر بۆ منە و منیش (جەزا) و پاداشتی دەدەمـەوە وەڕۆژوو گـر ئـەپارێزێ لەگوناە وەئەبێتە پەردە و قەڵغانە بۆ ئاگری دۆزەخ وەدەفەرموێت:

(وَإذاَ كَانَ يَوْمَ صَوْمِ أحَدِكُمْ فَلاَ يَرفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ فإنْ سَابَهُ أحَدٌ أوْ قَاتَلَهُ فَلْيقُلْ إني أمْرؤٌ صَائِم).

واتە ئەگەر یەكێك لەئێوە بەڕۆژوو بـوو پێویـستە جـوێن نـەدا و قـسەی پرووپوچ بەدەمیا نەیبێت و ئەگەر یەكێكیش جوێن و ئازاری دایت لەوەڵاما بڵێ من بەڕۆژووم.

(وَالذي نَفْسُ مُحَمـدٍ بِيَـدِهِ لَخلـوفُ فَـمِ الـصائِمِ أطْيَـبُ عِنـدَ اللهِ مِـنْ رِيـحِ المِسْك)

---

(1) اي وقاية وحفظ من المعاص الخ. بڕوانە كتێبی (تاج الجامع للأصول) بەرگی ٢ ل ٤٦.

(2) بڕوانە پەرتوكی (اسنى المطالب في احاديث مُختلفة المراتب) لە نووسینی پێشەوای (مُحَدَث) أبي عبدالله محمد بن درويش الحوت البيروتي .

واتە سوێند بەوەی کەگیانی منی بەدەستە بۆن و هەناسەی دەمی خاوەن ڕۆژوو خۆشترە لەلای خوای گەورە لەبۆنی میسك.

(لِلصائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحهُمَا إذاَ أفْطَرَ فَرِحَ وَإِذَا لَقِىَ رَبَهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ). رواه الخمسة.

واتە ڕۆژووگر دوو شادی و خۆشی بۆ هەیە پێیان شادمان دەبێت یەکێکیان کاتی ڕۆژوو شکاندن و دووەمیان بەخزمەت گەیشتنی خوای گەورە لەڕۆژی دواییدا کە (جەزا و) پاداشتی ئەداتەوە/ وەهەروەها حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت:

(مَنْ صَامَ رَمَضانَ إيماناً وَإحْتِساباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقدمَ مِنْ ذَنبِهِ) رواه الخمسة.

واتە هەرکەسێك بەئیمان و باوەڕەوە بۆ خوا بەڕۆژووبێ وەهیواشی بە (ئەجر) و پاداشی خوا هەبێ ئەوە خوا لەهەموو گوناهی ڕابووردوی خۆش ئەبێت.

هەروەها مانگی رەمەزان (سەبرە) چونکە خوای گەورەش لەقورئاندا دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ﴾ ئەمە لە پێشەوە تەفسیر کراوە.

(سەرنجێك) بەڕاستی ئەی برایانی خاوەن باوەڕانم ڕۆژوو گرتن زۆر بەسوودە و بەکەڵکە بۆ ئینسان وەئەگەر وردبینەوە لە (حیکمەت) و فەلسەفەی ڕۆژوو بەکتێبێك و دوو کتێب نووسین کۆتایی نایەت بەڵام بۆ نموونە بەکورتی هەندێ لەسودەکانی ڕۆژوو بەیان ئەکەین (یەکەم) ڕۆژووگرتن تەندروستی و لەش ساغییە بۆ ئینسان هەروەك حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت. (صُومُوا تَصحّوا) رواه أحمد وأبو نعيم. (دووەم) شکاندنی

نەفسە و شەیتانە وەدوور خستنەوەیە لەخۆت (سێهەم) دڵت لەهەموو شتێك پاك ئەبێتەوە چونكە بەڕاستی وەرزشێكی (ریاضة)یەكی زۆر گەورەیە بۆ ئادەمیزاد وەهەروەها لەهەموو شتێك گرنگتر ئەوەیە رۆژووگرتن ئەبێتە هۆی لێ خۆشبوونی یەزدان وە (ئەجر) و پاداشتێكی گەورەت دەس ئەكەوێ لەلای خوای گەورە چونكە بەڕاستی رۆژووگرتن ئینسان پاك ئەكاتەوە لەگەلێك شت كەزیان بەمرۆڤی موسڵمان ئەگەیەنێ (سەرنج) هەروەها پێویستە بزانین رۆژوو دروست نییە لەرۆژی جەژنی رەمەزان و قوربان و سێ رۆژەی پاش جەژنی قورباندا كەپێیان ئەڵێن (أيام التَشْريق) چونكە ئاینی ئیسلام قەدەغەی كردووە لەم چەن رۆژە ئینسان لێیان بەرۆژوو بێت/ هەزار رەحمەت/ لەم كەسەبێ كەفەرموویەتی:

أتى رمضانٌ مَزْرَعَةٌ للْعِبادِ
لِلتَطْهِيرِ القُلوُبِ مِنَ الفَسادِ
فَأدِ حُقوقَهُ قولاً وَفِعْلاً
وَزَادُكَ فاتَّخِذهُ إلى المِعيادِ
فَمَنْ زَرَعَ الحبُوب وَمَاَ سَقاهَا
تأوهُ نَادِماً يَوْمَ الحْصَادِ[1]

(وَنسألك اللهُمَ أنْ تَجْعَلنَا وَوالِدَينَا وَجَمِيعَ المُسْلِمِينَ بِمَنِكَ وَفَضْلِكَ مِنْ عُتَقاءِ شَهْرِ رَمَضانَ بِحُرْمَةِ القُرآنِ وَبِحُرْمَةِ سَيدنَا مُحَمد (ﷺ) سَيدُ وَلَدِ عَدْنان وَصَلىَ اللهُ عَلىَ سَيدنا مُحَمدٍ وَعَلىَ آلهِ وَسَحبِهِ أجْمَعِينَ).

---

(1) بڕوانە كتێبی (المَوعِظَ السنية لايام شَهْر رَمَضَان البَهية) دانراوی (عَبْدالرحمن بن أحمد بن مُحَمد) لاپەڕە (٨).

# ئامۆژگای بیست و دهەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( حەجی ) ماڵی خوا ئەکات

(الحَمدُ للهِ ألزَمَ حَجَ بَيتِهِ مَن اسْتَطاعَ إليهِ سَبيلاً وَأشهَدُ أنَ لا إلـه إلا الله يَمنحُ رِضْوانَهُ مَنْ أخْلصَ لَهُ في الطاعَةِ وَيعُطْهُ أجْراً جَزِيلاً وَأشهَدُ أنْ سَيدَنا مُحَمداً رَسُول الله خَير مَنْ حَجَ وَأعْتَمَر اللـهُمَ صَـل وَسَلم عَلـىَ سَيدنَا مُحَمـدٍ الحَبيبُ الشَفيع يَوْمَ المَحْشرِ وَعَلىَ آلهِ وَصَحبِهِ البَرَرة الكِرام).

لـەدوای هەنـدێ برایـانی موسـڵمان بەڕاسـتی خـوای گـەورە لـەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

سورەتی (ال عمران) ئایەتی (٩٧) واتە لەلایەن خواوە لەسەر ئینـسانی (موکەڵـەف) و بـالغ حـەجی مـاڵی خـوا فـەرز کـراوە لەسـەر ئـەو کەسـەی کەدەسەڵاتی چوون و هاتنەوە ڕێگەی (حەجی) بێ و وەهەرکەسـێ بـیر و باوەڕی بەخوا و بەفەرزی حەج نەبێ خوا پێویستی (بەعبادەت) و پـەرستی هیچ کەس نییە وەهەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:

﴿ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴾

سورەتی (الحج) ئایەتی (٢٧) واتە بانگدە ئەی (ئیبراهیم) لەناو خەڵکدا بۆ حەج دێنە لات بەپێ یان بەسواری لەسەر هـەموو وشـترێ کەلـەڕ و لاواز

بووه لەبەر دووری ڕێگایەکی کەدێن لەهەموو ڕێگایەکی دوورەوە.

(رُوِيَ أَنَهُ لَما فُرِغَ إبراهيمَ (عليهِ السَلام) مِنْ بناءِ البَيْتِ وَقيل لَهُ أذن في الناسِ بِالحَجِ قَالَ يَارَبَ وَمَايَبْلَغُ صَوْتي؟ قالَ إذنْ وَعَلي الإبْلاَغُ) [1]

واته (ڕیوایەت) کراوه کەحەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) کەبنایی (کەعبەیان) تەواو کرد خوا ئەفەرمووی یا ئیبراهیم بانگی خەڵك بکه بێت بۆ حەج ئینجا حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) ووتی ئەی خوایە دەنگی من بە کوێدا ئەگات خوا فەرمووی لەسەر تۆ بانگ کردنی بێت لەسەر من گەیاندن بەخەڵك هەروەها حەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمانی خوای گەورەی بەجێ گەیاند و (تەشریفی) بەسەر کێوی (أبا قیس) کەوت وەبەهەموو هێز و توانای خۆی بەهەر چوار لادا و بەدەنگی بەرز بانگی خەڵکی کردووە فەرمووی.

(وَقَالَ أيها النَاسُ ألا أنْ رَبكُمْ قَدْ بُنِيَ بَيْتاً وَكُتِبَ عَلَيْكُمْ الحَج إلى البَيْتِ فأجيبُوا رَبَكُمْ فأجَابَهُ كل مَنْ يُحَج مِنْ أصْلاَبِ الآباءِ وَأرْحَامِ الأمهاتِ لَبيْكَ اللهُمَ لَبيكَ) [2] .

واته فەرمووی ئەی خەڵکینە بەڕاستی خوای ئێوە (ماڵی کەعبە)ی دروست کردووە وەپێویستی کردووە لەسەر ئێوە بێن بۆ (زیارەتی) ماڵی خوا وەپێویستە فەرمانی خوا جێبەجێ بکەن و وەڵامی بدەنەوە بەڵێ

---

(1) بڕوانه تەفسیری (الواضح) بەرگی دووەم ل ٥٣ ج ١٧ چاپی (مصر) دانراوی (الدكتور محمد محمود الحجازی).

(2) بڕوانه تەفسیری (خازن ومدارك) لاپەڕە ٣٥٠ ج ٣ دانراوی (علاء الدین علي بن محمد ابراهیم البغدادي الصوفي).

کەحەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) فەرمانی خوای جێ بەجێ کرد و بانگی خەڵکی کرد و لەو رۆژەوە (زەڕات) واتە گەردیلەکان لەپشت باوکا (وەزەڕات) لەڕەحمی/ دایکا هەتا قیامەت ئەوانەی خوا (حەجی) کردووە بەبەشیان وەڵامی حەزرەتی ئیبراهیمیان (علیه السلام) دایەوە گوتیان لەخزمەتتدام خوایە لەخزمەتتدام.

(عَنْ أبي هُرَيْرةَ (رَضى اللهُ عَنْهُ) قالَ سَمِعْتُ رَسُول الله (ﷺ).

واتە ئەبی هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی من بیستوومە لەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(مَنْ حَجَ فَلَمْ يُرْفَثْ وَلَمْ يُفْسَقْ خَرَجَ مِنْ ذُنوبهِ كَيَوْمِ وَلَدَتهُ أُمهُ) رواه البخاري ومسلم.

واتە هەر کەسێك حەج بکا و ئەو کردەوەی نالەبار و ناشایستی تیا نەکات پاك ئەبێتەوە لەگوناهەکانی وەك ئەو رۆژەی لەدایك بووە مەبەستی حەزرەت (ﷺ) ئەوەیە پاك ئەبێتەوە لەگوناه وەك ئەو رۆژەی لەدایك بووە بێ گوناه بووە) هەروەها حەزرەت (ﷺ) لەفەرمودەیەکی تردا دەفەرموێت:

(العُمرةُ إلى العُمْرَةِ كَفارَةٌ لِمَا بَينَهُما وَالحَجُ المَبْرورُ لَيْسَ لَهُ جَزاءٌ إلا الجَنة). رواهُ الخمسة إلا أبا داود.

واتە هەرکەسێ دوو (عەمرە) بەیەکەوە بکا ئەبن بەکەفارەت و هۆی نەهێشتنی ئەو گوناهەی لەنێوانیانا کردوویەتی وەهەر حەجێك (مەقبول) واتە گیرا بێ یانی گوناهی تێکەڵ نەبوبوێ و نییە (ئەجرو) پاداشتی مەگەر

بەهەشت نەبێ[1].

(عَنْ أبي هُرَيرةَ (رَضي اللهُ عَنْـهُ) قـالَ سُـئِلَ رَسُـولُ اللهِ (ﷺ) أيُ العَمَـلِ أفْضَلُ؟)

واتــە لەئــەبی هــورەیرەوە (ڕەزای خــوای لێ بــێ) دەگێڕێتــەوە دەڵــێن پرسیاریان کرد لەپێغەمبەر (ﷺ) چ کردەوەیەك چاکترین کردەوەیە؟

(قالَ الإيمانُ باللهِ وَرَسُولِه).

واتە فەرمووی باوەڕکردن بەخوا و پێغەمبەر(ﷺ)

(قِيلَ ثُمَ مَاذا؟ قالَ الجِهَادُ في سَبِيلِ اللهِ).

واتە عەرزی پێغەمبەر (ﷺ) کرا لەدوای ئەو چی چاکترە؟

فەرمووی بۆ خوا غەزا کردن.

(قِيلَ ثُمَ مَاذَا؟ قَالَ حَجٌ مَبْرُورٌ) متفقٌ عليه.

واتە عەرزی حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) کرا لەدوایی ئەو چی؟ فەرمووی حەجێکی (مەقبووڵ) وەلەفەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

(حَجوُا فإن الحَجَ يَغْسِلِ الذنُوبَ كَما يَغْسِلُ المَاءَ الدرْنَ) رواه الطبراني.

واتە حەج بکەن چونکە بەڕاستی حەج کردن گوناه ئەشواتەوە هەروەك چۆن ئـاو چـڵك و پیـسی ئەشـواتەوە و لائـەبا وەدیـسان پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی:

(الحَجُ مرةً واحدِةٌ فَمَنْ زادَ فَهوَ تَطوعٌ) رواه ابو داود.

---

(1) خوێنەرە ئازیزەکانم ئەگەر دەتانەوێ بە تەواوی و دوورو درێژی لە بارەی حەج و عومرەوە تێبگەن و بۆتان ڕوون ببێتەوە.بڕواننە پەرتوکی (مەوسوعەی فیقهی حەج و عومرە) لەلایەن نووسەرەوە چاپ کراوە.

واته حەج کردن یەك جار (فەرزە) و پێویست کراوە هەرکەسێ لەو جارە زیاتر حەج بکاتەوە سوننەتە و خێرە.

(ئاگاداریەك) بەڕاستی ئەی برایانی خاوەن باوەڕ (حەج) پایەیەکە لەپێنج پایەکانی ئیسلام چەند سود و قازانجێکی بەنرخی هەیە بۆ ئادەمیزاد پێویستە موسڵمانان هیچ ڕەخاوەت و سستی بەم پایە و (ڕوکنە) مەزنە نەکەن و مەگەر بیانویەکی شەرعیان هەبێت.

(قالَ القُطْبُ الشعراني أُخِذَ عَلْينَا العَهدَ العامَ مِنْ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) أنْ نُبادرَ بِالحَج إذا استطعَنا لَاسِيمَا عِنْدَ خَوْفنَا إخْترام المَنيةَ (أي المَوْتَ) وَلا نتأخر لِعلةٍ دنْيوية وَلاَ خَوْفُ المَوْتِ فِي الطريقِ[1]

واتە شێخی شەعرانی (خوا نهێنی پیرۆز بکاتە) دەفەرموێت بەڕاستی وەرگیراوە لەئێمە پەیمانی گشتی و تێکڕایی لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) واتە پێویستە پەلە بکەین بۆ (حەج) کردن ئەگەر لەتوانامان دابوو بەتایبەتی ئەگەر ترسی کەوتن و مردنمان هەبێت وەهیچ کاتێك نابێت حەجەکەمان دوابخەین و لەبەر هۆیێ بێت یان نەخۆشییەکی جیهانی یانی شتی تر وەنابێت ترسی مردنمان هەبێت لەڕێگا یان بڵێین ئەگەر بچم بۆ حەجی ماڵی خوا لەڕێگایا ئەمرم.

وَصَلَى اللهُ عَلىَ سَيدِنَا مُحَمدٍ وَعَلىَ آلِه وَصَحْبِه وَسَلمْ)

(سُبْحانَ رَبِكَ رَبَ العِزَةِ عَما يَصِفُونَ وَسَلامٌ عَلَىَ المُرسَلِينَ وَالْحمدُ للهِ رَب العَالَمِينَ).

---

(1) بڕوانە کتێبی (لواقع الانوار القدسیه فی بیان العهود المحمدیه) لا ٥٢٣ دانراوی (الشیخ عبدالوهاب الشعرانی).

# ئامۆژگاری بیست و سێ هەم

## باسی مانای سورەتی ( فاتیحا ) و فەزڵ و گەورەیی ئەکا

الحمدُ لله ثُمّ الحمدُ لله الذّي لَمْ يزل عليماً حكيماً سميعاً بصيراً عليّاً ونشهدُ أن لا اله إلا الله وحدهُ لا شريك لَهُ ونشهدُ أن سيدنا و مولانا مُحمداً عَبدهُ وَرسوله وكان صديقاً نبياً والصلاة والسلام على هذا النبي (محمد المصطفى) الذي قال في الحديث الصحيح حيثُ يقول (لا صلاة لِمَنْ لَمْ يقرأ بفاتحة الكتاب) رواه أحمد وكما ورد في الحديث (القُدسي) عن ابي هريرة (رضي الله عنه) عَن رسول الله (صلاة الله وسلامه عليه) يقول الله تعالى ﴿ قسمت الصلاة بيني وبينَ عبدي نِصفين فَنصفُها لي ونصفُها لعبدي ولِعَبدي ما سأل إذا قالَ العَبدُ ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ قالَ اللهُ سبحانهُ حَمَدَني عَبدي وإذا قالَ ﴿ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ قال الله مجدني (أي عظمني) عَبْدي وإذا قالَ ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ قالَ اللهُ هذا بيني وبين عَبدي ولِعَبدي ما سأل فإذا قال (﴿ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ، صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ قال الله هذا لعبدي ولِعَبدي ما سأل) رواهُ مَسلم هذا الحديث القُدسي يَكشِفُ عَن سِرّ مِنْ أسرارِ إختيار السورة ليرددها المُسلم سبع عشرة مرّةً في كلِّ يوم وليلة ...(أمّا بعدُ أيّها المسلمون الكرام فداوموا على تِلأوةِ وقرآءةِ سورة الفاتَحةِ التّي أمتَنّ الله بهَا علَىَ نبيّنا وعلَىَ أُمّتهِ حَيثُ قال جل شأنه ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي

وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾(١) .

واتــه لــهدوای هەنــدێ ئــەی موســڵمانه بــەرێزەکان بــەردەوام بــن لــە خوێندنەوەی سوورەتی (فاتیحە) چوونکە بەڕاستی خـوای گـەورە منـەتان بەسـەرەوە نـاوە ئـەنێ و بـەهۆی ئـەم (فاتیحایـە) کـە بـۆ پێغەمبـەرو (ﷺ) ئیمانداران (نازڵ) بووە و هاتۆتە خوارێ و چوونکە هەروەها خـوای گـەورە لە قورئـان ئەفـەرموێت ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە حەوت ئایەتمان بۆ ناردویتـە خـوارەوە کـە لەنوێژدا دووبارە دەکرێتـەوە و حەمـدو ستایـشی خـوای تیـا دەکرێـت کـە سورەتی (فاتیحا)یە ، واتە بەمانایەکی تر ئەفەرموێت ، سـوێند بێـت ئـەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە حەوت ئایەتمان پێـداویت (کـە بریتیـە لـە سـورەتی فاتیحە) هەروەها قورئانی گەورەو مەزنیشمان پێ بەخشیویت .

## ئاگاداربیەك

هەروەها بێگومان هەندێ لە زانایـانی ئـایینی ، فەرموویانـە ئایـەتی ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾ ئیـشارەتە بـۆ دووبـارە کردنەوەی سورەتی (فاتیحە) لە نوێژدا چـونکە حـەوت ئایەتـە ، سـورەتی (فاتیحە) لەلایەن مەنایەکانیشەوە ، زۆر گەورەو بەنرخە چوونکە بەڕاسـتی بۆ گەورەیی ئەو سوورەتە فەرموودەی زۆر (ڕیوایەت) کراوە ، هەروەکو لە پێـشەوە لـە (حەدیـسە – قودسـیەکەدا) و خـوای گـەورە وەك لـە (ئـەبو

(1) سورەتی (الحجر) ئایەتی /٨٧.

هورەیرەوە) (ڕەزای خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرموویەتی خوای گەورە ئەفەرموێت (کاتێك بەندە دەڵێت ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ واتە خودا دەفەرموێت بەندەکەم (حەمدو سوپاسی) کردم ... ئەگەر ووتی ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ واتە خودا دەفەرموێت بەندەکەم (مەدح و ستایشی کردم) ... ئەگەر ووتی ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴾ واتە خودا دفەرموێت ئەوە بەڕاستی عەبدی من (ئیعتراف) بە گەورەیی من کرد ، ئەوجا ئەگەر ووتی ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ واتە خودا دەفەرموێت ئەمە نێوان من و بەندەکەمەو ئەوەی بەندەکەم دەیەوێت دەیدەمێ و ئەگەر ووتی ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ واتە ، خودا دەفەرموێت ئەمە هی بەندەکەمەو ئەوەی ئەو دەیەوێت و داوای دەکات دەیدرێتێ ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ ئەفەرموێت ئەوەبو بەندەکەم وەهەرچی دوا بکات ئەیدەمێ ، واتە ، هەروەها کە (باقی) سورەتەکەی تەواو کرد خودا دەفەرموێت : پاداشتی ئەوە لەبەینی من و عەبدی من دایە چی داوا بکاو دڵی ناشکێنم).

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان سەبارەت بە گەورەیی ئەم سوورەتە (ئەبو سەعیدی کوڕی ئەلموعەلا (خوای گەورە لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوەو هەروەکو ئەمە (نەصەکەیتی) و (قالَ رافعُ بن المعلى (رضي الله عنه) قال

لي رسول الله (صلى الله عليه وسلم) ألاَ اعلّمُكَ أعظمَ سورةٍ في القرآن قَبْل أنْ تَخْرجُ منَ المسجد؟) واتە : رافيعی كوڕی موعەلا (ڕەزای خوای لێ بێ) دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی پێم (ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێربكەم و پێش ئەوەی لە مزگەوت بچیتە دەرەوە ؟) فاخذ بيدي فلما أردنا أن نخرج قلتُ يا رسول الله انك قُلتَ لأُعَلمكَ أعظَمَ سورة في القرآن) واتا ئینجا دەستی گرتم كاتێ كە ویستمان بچینە دەرەوە ، ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەدی تۆ نەتفەرموو گەورەترین سوورەتی قورئانت فێردەكەم (قالَ الحَمدُ لله رَب العالمين هي السبعُ المثاني والقرآن العظيم الذي أوتيتُهُ) رواه الامام البخاري، واتە : (فەرمووی پێغەمبەری (ﷺ) الحمد لله رب العالمين) كە ئەویش حەوت ئایەتی دووبارە بووەو قورئانی گەورەیە كە بە من بەخشراوە) دیسان هەروەها لەبارەی گەورەیی ئەم سورەتە (كعب) دەگێڕێتەوە ، هەروەكو ئەفەرموێت لە حەدیسا (عَنْ أُبي بن كعب (رضي الله عنهُ) قالَ قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) والذي نفسي بيده ما أُنزلت في التوراة ولا في الانجيل وَلا في الزبور ولا في القرآن مِثلها وأنها سَبعٌ من المثاني والقرآن العظيم (الذي أعطته) رواه الترمذي والنسائي، واتە : ئوبەی كوڕی كەعب (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی سوێند بە و خوایەی كە گیانی منی بەدەستەوەیە ، نە لە (تەورات) و نەلە (ئینجیل) و نەلە (زەبوور) و نەلە (قورئاندا) وێنەی سوورەتی (فاتیحە) دانەبەزێنراوە ، بێگومان (فاتیحە) حەوت ئایەتی دووبارە بووەو ئەو قورئانە گەورەو پیرۆزەیە كە بەمن دراوە) ، جا هەروەها ئەی خاوەن باوەڕان ئەم سوورەتە پیرۆزە لە (مەككە) هاتۆتە

خوارەوە ، نوێژ بەبێ خوێندنی ئـەم سـوورەتە درووسـت نیـەو (بـەطـاڵـە) ئینجا هەروەها بێگومان (عوبادەی کوڕی صامت) (خوا لێی ڕازی بێت) کـە یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەڵێت پێغەمبەری خودا فەرمویـەتی (لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يقرأْ بفاتِحة الكِتاب)[١] ، واتە: هەرکەسێك ئەم سورەتە لـە نوێژەکەیدا نەخوێنێتەوە ، ئەوا نوێژەکەی درووست نییە[٢].

## سەرنجێکی گرنگ

جا هەروەها بێگومـان هـەموو موسـڵمانان لەسـەر ئـەو ڕایـە کۆکن کـە خوێندنی سوورەتی (فاتیحە) لە نوێژدا (فەرزە) ، واتە : پێویستە چوونکە پێغەمبەری خودا (ﷺ) لەگەڵ هەموو هاوەڵانی و ئەوانیش کە پاش ئەوان هاتوون کـە (تـابعینن) واتـە : ئەوانـەی لـەدوای (ئەصحابەکانی پێغەمبـەر (ﷺ)) هاتوون ناسراون بە (تابعیین) هەروەهاش سەرجەم زانایانی ئیسلام هـیچ کاتێـك بـەبێ خوێنـدنی ئـەم سـوورتە نوێـژیان نـەکردووە و ، (ئینجـا ئیمامی بوخاری لە (ئەبو قەتادە) وە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) ئەم سوورەتەی هەموو کاتێك لە نوێژدا دەخوێندەوە).

---

(1) ئەم فەرموودەیە ئیمامی ئەحمەد هێناویەتی هەروەکو لە پێشەوە باسمان کردووە .

(2) پوختەی وتەکان، ئەوەی ڕاستی بێت جەوهەری مەعنای (صەدو چوار) کتێبی خودای گەورە کە لەئاسمانانەوە (نازل) بوونە بۆ ڕەهبەران واله (صەدو چوارە) سوورەتی قورئان دا کە پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی محمد(ﷺ) هاتووە هەرچی ( واتا ماناو حەقایقێ) کەلەم سورەتانەدا هەن.

هەموویان بەکورتی لەسوورەتی (فاتیحە) دا هەن و بەرستەی (بسم الله الرحمن الرحيم) مۆکراوەو بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ڕەوانەکراون، ..هتد بڕوانە پەرتووکی (مەکتووباتی حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ ) بەرگی دووەم ، لاپەڕە٢٠.

## ( باسێك له خێری ( فاتیحه ) دان بۆ گیانی مردوو )

وَعَنْ أُم عَفيفٍ (رضي الله عنها) قالَتْ (بايعنا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) حِينَ بايع النِّساءُ فأخذَ عَليهن أن لا تحدثن الرّجل إلا مُحرماً وأمَرَنا أن نقرأ على ميِّتنا بِفاتِحة الكِتاب) رواه الطبراني[١] ، واته : دایكه عەفیفه (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت (ئافرەتان) پەیمانمان دا به پێغەمبەری خودا (ﷺ) ئەو كاتەی كه پەیمانی ئافرەتان بوو ئینجا پەیمانی لێ وەرگرتین قسەو ئاخاوتن نەكەین لەگەڵ (پیاوانی ئەجنەبی) واته بێگانه ، مەگەر خۆیی نەبێ و (مەحرەم) بێ وه هەروەها (فەرمانی) به ئێمه كرد كه (فاتیحه) بخوێنین بۆ مردوومان).چوونكه بێگومان قورئان خوێندن و (ئیهدای ثەوابەكەی) بۆ (ڕووحی) واته گیانی یەكێ له مردووەكان یان (جەمعێ) له مردووان بەڕاستی خێری زۆرەو به مردووەكه ئەگات)[٢] .

(قراءة سورة الفاتحة لأهل المقابر))[٣] ، واته خوێندنی سورەتی (فاتیحه) بۆ گۆڕستان ، قالَ أبو محمّد السّمرقندي في فضائل سورة الأخلاص من حديث عليّ (رضي الله عنه) مرفوعاً عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ : (مَنْ مرّ علىَ المقابرِ وقَرا ﴿ قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ إحدى عشرةَ مَرة ثُمَ وَهَبَ أجرهُ للأموات أعطي من الأجر بعَدد الأموات) واته : هەروەها

---

(1) بڕوان پەرتوكی (معجم الطبراني) ، ج٢٥ ، لاپەڕە ١٣٥.

(2) بڕوانه : پەرتووكی (نوری ئیسلام) له نووسینی (مامۆستا مەلا (عبدالكريم مدرس) لاپەڕە ،١٢١.

(3) بڕوانه مصباح القلوب ومفرج الكروب ، دانراوی (عبدالرحمن ملا طه عبدالعزين) بەرگی ٢، لاپەڕە ٤٣٨.

پێشەوا ئەبوو (محمد) ی سەمەرقەندی لە فەزائیلی (سورەتی ئیخلاص) دا لە فەرموودەی حەزرەتی عەلی دا (خوا لێی ڕازیبێت) بە (مەرفوعی) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ (هەر کەسێ بڕوات بەلای گۆڕستانی هەروەها (١١) دە ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێ ئینجا لە پاشان بیکات بە دیاری بۆ مردووەکان ئینجا چەند مردوو هەیە لەم گۆڕستانە بەقەدەر ژمارەی ئەوەندە مردووە (خێر) و سەوابی پێ ئەگات.

هەروەها (إبن و قدامە) لە (شەرحی) کەبیردا لە ئیمام (أحمد بن حنبل)دا دەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ : هەرکاتێك چوونە گۆڕستانی موسڵمانان سوورەتی (فاتیحە) و﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ﴾ هەردوو ﴿قُلۡ أَعُوذُ﴾ بخوێنن و خێرەکەش بدەنە مردووەکان چوونکە خێرەکەیان پێ دەگا .

**( ئاگاداری )**

موسڵمانان ئەبێ بێداربن لە خێری (فاتیحە) بۆ مردووەکە دەینێرن جا بۆ ئەوەی بزانن درەختی گۆڕستان و خوێندنی سورەتی (فاتیحە) لەچی وەرگیراوە، فەرموو با بەیەکەوە بچینە خزمەتی ئەم فەرموودانە ... عَنْ ابن عباس (رضي الله عنهُما) مَرَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) على قَبَرِيْنِ فَقَال إنَهما لَيُعذبان وما يُعذبان في كبير أما أحدَهُما فكان يَمشي بالنَّميمَة، وأمّا الآخرُ فكان لا يستترُ من بوله فَدَعا بِعَسيب رَطب فَشَقَهُ إثنين ثُمَ غرس على هذا واحداً وَعَلى هذا واحِداً ثمَ قالَ لَعَلَهُ أنْ يُخَفف عَنهُما مالم يَبسا) متفق عليه، واتە : (ئیبنو عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی بەلای دوو گۆڕدا ڕابورد ئەوجا فەرمووی ئەم

دوو گۆڕە سزا دەدرێن لەناو گۆڕەکەیان، یەکێکیان بەهۆی دوو زمانی وە بەلام ئەوەی تریان خۆی لە میز پاك نەدەکردەوە ئینجا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لقە دارخورمایەکی تەڕی کردە دوو (پارچە) و لەسەر هەر گۆڕێك پارچەیەکی داچەقاند فەرمووی : (رجا – وایە) عەزابەکەیان لەسەر کەم بێت و تاکاتێك لقە دارەکان ووشك دەبن) [1].

## ( پووختەی ووتە )

جا هەروەها شێخ (إبن حجر رەحمەتی خوای لێ بێت) لە کتێبی (تحفە المحتاج) [2] دا ئەلێ خێری قورئان خوێندن دەگاتە مردوو چوونکە زۆر لە پێشەوایانی مەزهەبی (شافعی) ش فەرموودەی ئەم سێ مەزهەبەیان هەڵبژاردووە (بەلام ئەوەی ڕاستی بێت هەر چوار مەزهەب) قورئان خوێندن لەسەر گۆڕ بەباش دادەنێن ، خوێندنی (موستەحەبە) و پەسەندە، چوونکە سزای لەسەر سووك دەبێ و هەروەها بەهۆی ئەم قورئان خوێندنە (رەحمەت) دێتە خوارەوە (ئەجر) و سەواب بە مردووەکەش ئەگات.

## ( فاتیحەو قورئان خوێندن بۆ گیانی مردوو )

جا هەروەها بێگومان زانایان لە گەیشتن لە پاداشتی (قورئان) خوێندندا ناکۆکن بەلام (سەلەفەکان) و سێ پێشەوایان لەسەر ئەوە کۆکن

---

(1) ئیمامی نەوەوی (ڕەزای خوای لێبێت) لە شەرحی ئەم فەرموودەیە ئەلێ ، چوونکە لەکاتی تەڕیدا زیکری خوا ئەکەن و بەلام لەکاتی ووشکی دا زیکر ناکەن.

(2) بڕوانە : پەرتووکی (تحفة المحتاج بشرح المنهاج) دانراوی (شیخ ابن حجر الهیتمی) بەرگی ۷ ، لاپەڕە ۷۳.

کە پاداشتەکە بۆ مردوو دەڕوات و ئەچێ ، واتە خێرو پاداشتەکەی ئەگات ئەوەی (هەدیەی) بکات بۆ گیانی مردوو.

بەلاّم لە ووتەیەکی ئیمامی (شافعی) رەحمەتی خوای لێبێت بە بەلگەی ئەم ئایەتە ناچێت کە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴾ سوورەتی النجم: ٣٩ واتە ئەوەی مرۆڤ هەولّی بۆ نەدات بۆی نییە (پێی وایە ناڕوات) بەلاّم ئیمامی شافعی لە (فتوای) تریدا دەلّێت دەڕوات چوونکە زانای بەناوبانگ پێشەوا (زەعفەرانی) دەلّێت پرسیارم لە ئیمامی شافعی کرد دەربارەی خوێندنی قورئان لای گۆڕ؟ فەرمووی ئەگات و با بیخوێنیّ قەیدی نییە :-

هەروەها ئیمامی (النووی) یش لە کتێبی (المجموع) دا[١] ئەلّێ (سوونەتە) ئەو کەسەی سەردان گۆڕ دەکات (قورئان) بخوێنیّ و دوای ئەوە دوعایان بۆ بکات چوونکە بێگومان ئیمامی شافعی (رەحمەتی خوای لیّ بێت) دەقی لەسەر ئەمە هەیەو، زانایان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون، لە شوێنێکی تردا ووتویەتی ئەگەر هەموو (قورئان) بخوێنریّ باشتریشە ئەمەش ڕاست ترین قسەیەتی، جا هەروەها ئیمامی (ئەحمەدی کوڕی حەنبەلّ) یش تا بە خزمەت فەرموودەکان نەگەیشتبوو لەڕاست ئەمەدا (ئینکاری) ئەکرد بەلاّم ئەمانەی بینی گەڕایەوە).

---

(١) بڕوانە پەرتووکی (المجموع شرح المهذب) دانراوی پێشەوا ئیمامی (النووی) ج٦ ، لاپەڕە ١٣١، چاپی بیروت، لبنان.

**( چەند ئاگادارییەك )**

١) جا هەروەها پێشەوا (شەعبی) کە یەکێکە لە(تابعین) ئەفەرموێ (ئەنصارەکان) کاتێ مردویەکیان لێ دەمرد دەچوونە سەر گۆڕی قورئانیان لەسەر دەخوێند) چوونکە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرموویەتی (أقرؤا على موتاكم يسن) رواه أبو داود.

واتە : لەسەر مردووەکان یاسین بخوێنن ، ئیمامی (قرطبي) دەڵێ دوور نیە مەبەست لەکاتی سەرەمەرگدابێ یان لەتەك گۆڕی دابێ [١].

٢) هەندێکی تر لە زانایان دەفەرموون ، بۆ سوود گەیاندنی قورئان بۆ مردوو پشت بەم فەرموودەی (عسیب)دەبەستن کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چیلکەیێ دەکاتە دوو کەرت و لەسەر هەردوو گۆڕەکانی چاند واتە ڕواندن و فەرمووی (لعلّهُ يُخفّفُ عنْهُمْ ما لَمْ يَبسا) رواه الامام البخاري ، واتە (رەجا وایە شادمندبن سزایان لەسەر سووك ببێ تا ووشك دەبن ، جا پێشەوا (الخطابي) یش لە کتێبی (معالم السنن) دا ئەڵێ: (ئەگەر بەیادو زیکری دارو چیلکەکان سزای مردوو سووك ببێ ئەی چۆن بە قوررئان خوێندنی بڕوادار سووك نابێت؟).

٣) هەروەها خاوەنی پەرتووکی (سُبل السلام) [٢] ئەڵێ لە بن سێبەری ئەم دوو ئایەتەداو کەوا ئەفەرموێت ﴿ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا ﴾

---

(1) بڕوانە پەرتووکی : (شرح الصدور بشرح حال الموتى والقبور) باب ٥١ ، في قراءة القرآن للميت أو على القبر) دانراوی (عبدالرحمن السيوطي).

(2) بڕوانە پەرتووکی (سُبل السلام في شرح بلوغ المرام) دانراوی (محمد بن اسماعيل الأمير السنعاني) ج٣ ، لاپەڕە ٣٣٧.

سووره‌تی الحشر: ١٠ وه هه‌روه‌ها ئه‌فه‌رموێت له ئایه‌تێكی تردا ﴿ وَٱسْتَغْفِرْ لِذَنۢبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾ سووره‌تی محمد: ١٩ وه‌هه‌روه‌ها غه‌یری ئه‌وانه‌ش ئه‌وه ده‌رده‌خات ئه‌م دوعایانه بێ ناكۆكی بۆ مردوو به‌سوودن و ئه‌جرو پاشاداشتیان پێ ئه‌گات.

هه‌روه‌ها ئیمامی (حه‌نه‌فی) و ئیمامی (ئه‌حمه‌د) و كۆمه‌ڵێ له زانایان، ئه‌فه‌رموون: به‌تایبه‌تی (ئه‌هلی سوونه‌ت و جه‌ماعه‌ت) ئه‌ڵێن هه‌موو ئه‌و پاداشتانه‌ی بۆ (مردوو له‌لایه‌ن كه‌سانی تره‌وه له‌كارو كرده‌وه‌كان بۆ مردوو) ڕه‌وانه ده‌كرێن و ده‌كه‌ن ئه‌گات) ئینجا نوێژ یان ڕۆژوو بێ یان حه‌ج بێ یان (خێر) و سه‌ده‌قه و یان قورئان خوێندن بێ یان (زیكر) بێ و یان هه‌ر خواپه‌رستیه‌كی تر ، ئه‌مه‌ش قسه‌ی ڕاست ترینه‌و له پێشترینه (الأرجح).

ئه‌گێڕنه‌وه پیاوێك پرسیاری له پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كرد چۆن چاكه له‌گه‌ڵ دایك و باوكی دابكات له‌دوای مردنیان ، فه‌رمووی: (بأنْ يصلي لَهُمَا مَعَ صلاتهِ ويَصومُ لَهُما مَعَ صيامهِ) رواه الدار قطني ، واته : له‌گه‌ڵ نوێژی خۆیدا نوێژیان بۆ بكات و له‌گه‌ڵ ڕۆژووی خۆیدا بۆیان به‌ڕۆژوو بێت.

جا هه‌روه‌ها ئه‌م فه‌رمووده‌یه‌ش كه ئه‌فه‌رموێت (إذا ماتَ الانسانُ إنْقَطَع عَملُه من الدّنيا الاّ من ثلاث) واته: ئه‌گه‌ر مرۆڤ مرد (چ ژن یا پیاو) كاره‌كانی له دونیا ده‌پچڕێ و له‌سێ شت نه‌بێ (صَدَقَةٌ جاريةُ ، أو علم ينتفع به، أو ولدٌ صالحٌ يدعوا لَهُ) رواهُ مسلم، واته: خێرێكی نه‌بڕاوه، وه‌یان زانستێكی فێری خه‌ڵكی كردبێت وه خه‌ڵك له‌دوای ئه‌و سوودی لێ وه‌رگرتبێت وه یان وه‌چه‌یه‌كی چاك كه دوعای بۆ بكات و له‌دوای خۆی به‌جێی هێشتبێت.

## باسێك لە پلەو پایەی فاتیحا خوێندن و پاداشتی

خوێنــەرانی ئــازیزەم حــەزرەتی حــاجی کاکــە ئەحمــەدی شــێخ لەمەکتووباتە[1] ئەفەرمووێت (براینە) پێویستە پێتان بڵێم ئەوەی بۆ ئێوە بــەکار دێــتو ســوودی لــێ وەردەگــرن هــەر بەخوێندنــەوەی ئــەوەوە (مەشـغوول) بـن لـە هـەموو (ئـەورادت) بەسـوودترە بـۆ ئێـوە (قورئـانی) پایەبەرزو گەورەیە چونکە بێگومان (سەواب) و پاداشتی خوێندنی قورئـان پیرۆز گەلێك زۆرە.

بـۆ نموونـە شـێخ ئەحمـەدی (ابـن حجـر رەحمـەتی خـوای لـێ بێـت) فـەرمووی پاداشـتی خوێنـدنی سـوورەی (فاتیحـە) لەپاداشـتی خوێنـدنی سوورەتی(بقرە) زۆرترە ئەگەرچی سـورەتی بـەقرە لـە دوو(جـزء) زیـاترە بەدلیلی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کەفەرموویەتی( الا خبرك بخیر سورە فی القرىن الحمـد لله رب العـالمین) واتـە ئاگادارتـان ئەکـەمو پێتـان ئـەڵێم کەچــاکترین ســورەتەکانی (قورئـــان) ســـورەتی (الحمـــد) ە هـــەروەها لەفەرموودەیەکی تردا هـاتووە کەسـوورەتی (فاتیحـە) بەقـەدەر سـێیەکی قورئانە، واتە خوێندنی سوورەتی (فاتیحە) بەقەدەر خوێندنی(دە)جـوزئی قورئان خێرو پاداشتی هەیە جا هەروەها (دەگێرنەوەو ریوایەتکراوە) کـەوا (شەیتانی – مەڵعوون) سـێ جـار لـەداخو خەفەتـدا هـاواری لـێ هەسـتاوە هاوارێکی وەها کەلەهاواری هەموو کاتێکی بەهێزتر بووە:

یەکەم : لەکاتی(نـازڵ بـوونی) فاتیحـەدا چـونکە ئـەو دەیزانـی کەئـەم

---

(1) بروانە پەرتووکی (مەکتووباتی کاکە ئەحمەدی شێخ) مامۆستا مەلا (عبدالکریمی مدرس) لەفارسییەوە وەریگێراوەتەوە سەر کوردی بەرگی (دووەم) لاپەڕە٩.

سـوورەتە سـامانێکی گەورەیـە بـۆ ئوممـەتی (محمـد) (ﷺ) هەرلەبـەر گەورەیـەتی کـەکراوە بـە(روکنێـی) لەئـەرکانی نوێـژ هـەتا گەورەیـە بـۆ ئوممـەتی (محمـد (ﷺ) هەرلەبەرگەورەیـەتیی کـەکراوە بـە(روکنێـی) لەئەررکانی نوێژ هەتا موسوڵمانان بیخوێنین‌و پاداشتی زۆریان (بەنصیب) بێ لەوپیرۆزی و بەختیارییە بێ بەش نەبن).

## سەرنجێکی گرنگ

هەروەها ریوایەت کراوە کە(فاتیحە الکتاب) واتە سـوورەتی (الحمـد لله) شیفای هـەموو دەردێکـە واتـە چ بەنوسـراوی هـەڵیبگریت‌و چ نوسراوەکە بـەئاو بکوژێتـوەو، ئـەو ئـاوە بخواتـەوەو چ بیخوێنـێ بەسـەر نەخۆشداو یانەخۆشەکە خۆی بیخوێنی‌و .. جا سورەتی (فاتیحـە) گـەلێ حیکمـەت‌و (سرریات) و نهێنی تێدایەو ..هتد..

**(تێبینیەك)**

ئەگەر ئێمە بەڕاستی لەم فەرموودەیە ووردبینەوە (ئەمە واناگەیەنێ کە کـاری غـەیر بـۆ مـردوو ناچێت) چـوونکە فەرموودەکـە دەفـەرموێ (عَمَلـهُ نەیفەرمووە (عَمَلَ غَیره) [1]، واتە: مردووەکە دەستی لە دونیا دەپچڕێ لـە کارەکانی دەستی خۆی) بەڵام تەنیا خێری بەردەوام و زانستێ کە سوودی لێ ببینرێ یان منداڵەکانی خێرو چاکەیان هەبێ و نزای بۆ بکات سوودی پێ

---

(1) بڕوانە پەرتووکی (مصباح القلوب ومفرج الکروب) دانراوی ، (عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز) بەرگی ٢ ، لاپەرە ٢٤٣.

دەدات لەناو گۆڕەکەشی خێرو چاکەی بۆ ئەڕوا و ئەچێ .

٥) کاری خەڵکی سوودی بۆی نابێ ئەگەر کەسەکە بە نیازی خۆی بیکات ، بەڵام ئەگەر بە نیەتی ئەو بێ دەگات ئەمەش بە (حوکمی) شەرع وەکو ئەوەیە تۆ لە بریکاری کەسێکدا کارێك بکەیت.

هەروەها زانای بەناوبانگ (إبنُ قَيم الجوزية) ئەڵێ لەسەر فەرموودەی (إذا ماتَ الانسان إنقطع عمله) جا لەسەر ئەم فەرموودەیە (شەرحی) کردووەو ئەڵێ (ئەمە مانای وانیە سوودی خەڵکی بەکەس ناگات چوونکە لێرەدا نافەرموێ (إنقطعَ إنتِفاعُهُ) بەڵام فەرموویەتی (إنقَطَعَ عَمَلُهُ) واتا کردەوەی مردوو دەپچڕێ نەك پاداشتی غەیر [1].

٦- جا هەروەها بێگومان لای زۆربەی زانا فیقهیەکان واجب نییە وەلی ڕۆژوو بۆ مردوو بگریتەوە لە قسەی تازە (الجديد) ی شافعیدا هەروەها چوونکە بریکاری (النيابه) ی تێدا ناکرێ وەکو لە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە (لا يصلي أحدٌ عَن أحدٌ ولا يصوم أحدٌ عَن أحدٍ وَلاكنْ يُطعم عَنْه مكانَ كلّ يومٍ مُدٌّ مِن الحَنْطةِ)، واتە: با کەس بۆکەس نوێژ نەکاتەوەو کەس بۆ کەس ڕۆژوو نەگرێتەوە بەڵکو لە بری هەر ڕۆژێ مشتە گەنمێ خواردن بدات بە (کەفارەت) بەڵام لای هەندێ زاناکانی تر بەڕۆژوو بوون باشترە بۆ مردوو لەبەر ئەم فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت (مَنْ ماتَ وعليه صيامٌ صامَ عنهُ وليهُ) بەڵام ئەوە ڕاستی بێت ئەوەیە کە

---

(1) بڕوانە پەرتووکی (الروح) دانراوی (ابن قيم الجوزی) لاپەڕە ٢٢٨، و مصباح القلوب ومفرج الكروب، بەرگی ٢ لاپەڕە ٣٤٥.

پاداشتی (غەیر) بە مردوو دەگات[1].

٧) هەروەها زۆربەی زانایان ئەڵێن (پاداشتی (غەیر) بە مردوو دەگات لەهەموو شتێ لەوانەش (فاتیحەو قورئان خوێندن) ئەگەرچی لەهەندێ (قەولی جدیدی) ئیمام شافیعیدا ناگات بەلام لە (قەولی بەهێزی) ئیمامی شافعیدا دەگات وەکو ئیمامی (النووی) لە (شرح المهذّب) دا لە پەڕتووکی (ریاض الصالحین) باسی کردووە (رأی) پێچەوانەی ، چوونکە رای ئەوانە بەهێزترە کە دەڵێن دەگات هەروەها (د. محمد رمضان البوطي) یش [2]، دەڵێ پاداشتی قورئان خوێندن دەگات کە قسەی جەماوەری شافعیە (رەحمەتی خوای لێبێت).

---

(1) بڕوانە (الفقه الاسلامي وأدلته) دانراوی : د. وهبت الزحیلی ، ج٣، لاپەڕە ١٧٣٧ .

(2) بڕوانە پەرتوکی (الروح) دانراوی (ابن قیم الجوزی) لاپەڕە ٢٨، (ومصباح القلوب ومفرج الکروب) بەرگی ٢ لاپەڕە ٣٤٥.

## باسێك له بارەی تەعزیەو پرسەو سەرەخۆشی )

جا هەروەها له زۆربەی پەرتوكه (فقهیەكان) ئەڵێت پێویسته خەڵكی نان و خواردن بۆ ماڵی مردوو ئاماده بكەن یان له ماڵەوه بیبەن و میوانانی دەرەوه كه دێن بۆ (فاتیحا) پێی بەڕێ بكەن تا ئەرك نەكەوێته سەر ماڵی مردوو چوونكه درووست نیه ئەوان نان خواردن بۆ خەڵك درووست بكەن لەبەر ئەوەی ئەوان زامدارو سەرلێ شێواو بوونه سەبارەت به مردووەكەیان، بەتایبەتی ئیمڕۆ خەڵكی زۆرەو بلاوەو هۆكاری هاتوچۆو پەیوەندی خێزان و خزمایەتی بووەو ، هەروەها لەبەر ئەم فەرمودەیەش كه حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (اصْنَعُوا لأَلِ جعفرَ طَعَاماً فإنّه أتاهُمْ أمر شغلهم) رواه الترمذي وابن ماجة .

واته : بۆ خێزان و ماڵ و منداڵی (جەعفەر) خواردن ئامادەبكەن ئیمڕۆ (بەهۆی مردنی جەعفەر)سەرقاڵ بوونه هەروەها (تازیه) بۆ خاوەن مردوو (مشروح) و ڕەوایه و جوانه چاك وایەو پاداشتی تێدایه ، چوونكه له فەرمودەشدا ئەڵێ (حَقُّ المُسلِمِ علَى المُسْلِمِ أن يعزِّيهُ اذا أصابَتْهُ مُصيبةٌ) واته : مافی موسڵمان لەسەر موسڵمانه له كاتی (كارەساتدا) یا (موصیبەتێكی) هاته سەر سەره خۆشی لێبكات، چوونكه دەگێڕنەوه له (معاوية بن وقرة) ئەویش له باوكیەوه دەگێڕتەوه كه ئەویش له پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) كه پیاوێ له هاوەڵانی بزر دەبێ و ئینجا دوایی سۆراغی دەزانرێ كوڕەكەی مردووه جا ئەویش (ﷺ) ئەفەرموێ (قُومُوا أنْ نُعَزِّيه) واته: هەڵسن بچین سەره خۆشی لێ بكەین ئێمەش له خزمەتیدا

چوین و سەرەخۆشیمان لێیکرد[١].

جا هەروەها لەم فەرمودەیە (ئیستنباط) دەکرێ وەرئەگیرێ کەوا درووستە بۆخاوەن مردوو لە ماڵ یان لە مزگەوت یان لە (قاعەی) مزگەوت (٣) ڕۆژان دابنیشن و خەڵکی بێن سەرەخۆشیان لێ بکەن چوونکە هەروەکو لە حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە ئەفەرموێ: (انّهُ لَمّا بَلغهُ قُتلَ جَعْفَر إبن ابي طالب وَزيدُبن حارثة وعبدالله بن رواحة) ، جَلَسَ في المسْجدِ والنّاسُ يأتُونَه ويعزّونهُ[٢]رواه أبو داود، واتە: کە ئەم زاتانە لە (جەنگی مۆتە) شەهید کران پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی لە ماتەم و پرسەکەیان دانیشت لەمزگەوت پێغەمبەر (ﷺ) زۆر غەمبار بوو (مەحزوون) بوو.

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها سوننەتە (تازیە) کردن لە خزمەکانی مردووەکە یەکجار، واتە دڵدانەوەیان و (دوعا) بۆ مردووەکە بڵێ خوا (صەبرو) ئارامی دڵتان بداو خواش لە مردووەکەشتان خۆش بێت، چوونکە پێغەمبەر (ﷺ)فەرموویەتی (ما من مُسلم يُعزُّ أخاه بمصيبةٍ إلا كساهُ الله مِنْ حُلَلِ الكَرامةِ يَوْم القيامةِ) رواه ابن ماجه، واتە هەر موسڵمانێ سەرەخۆشی تازیەی موسڵمانێ بکاو دڵی بداتەوە لە کاتی کارەساتیدا ئەوا خوای گەورە

---

(1) بڕوانە: پەرتوکی بستان العارفين ، دانراوی پێشەوا (السمرقندی) لاپەڕە ١٢٣.

(2) بڕوانە: (عُمده القاري شرح صحيح البخاري) دانراوی (بدرالدين العيينی) ج٧، لاپەڕە ١٤٤.

بەرگی بەرێزانی ئەکاتە بەر لە ڕۆژی قیامەتدا.

بەلاَم بۆ ئەو ئافرەتەی مێردی بمرێت حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (لاَ يحلُّ لأمرةٍ أن تُؤمِن باللهِ واليومِ الآخرِ أنْ تحد عَلى الميِّتِ الاَّ عَلَى زوج أربعة أشهر وَعَشرَ) رواه البخاري، واتە: ڕەوا نیە بۆ ژن کەبڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەبێ لە سێ ڕۆژ زیاتر تازیە دابنێ مەگەر بۆ مێردی نەبێ ئەوە دەتوانێ (٤) مانگ و (١٠) ڕۆژ پرسەی بۆ دابنێ.

## (تەفسیری سورەتی فاتیحە بە کورتی)

ئەم سورەتە پیرۆزە (٧) ئایەتەو لە مەککە هاتۆتە خوارەوە، جا هەروەها ئەم سورەتە سورەتی (فاتیحە) ی پێ دەوترێت چوونکە لەسەرەتای سورەتەکانی قورئانەوەیە هەروەها بێگومان (السبع المثاني) یشی پێ دەوترێت چوونکە بە (بسم الله الرحن الرحیم)ە کەیەوە لە حەوت ئایەت پێك هاتووە، وە هەروەها لە نوێژدا دووبارە دەکرێتەوە ، هەروەها (أمُ الكتاب) یشی پێ دەوترێت چوونکە ئەم سورەتە سەرجەم مەبەستەکانی قورئانی پیرۆزی لە خۆ گرتووەو (مانایەکی – یەکجار) زۆر ئەبەخشێ و ..)

## (ئاگادارییەکی گرنگ)

لە زۆربەی کتێبەکانی (تەفسیر) و شەریعەتدا ئەفەرموون (سوننەتە) بۆ ئەو کەسەی کە قورئان ئەخوێنێ و یان دەیەوێ نوێژ بکات ، پێش ئەوەی دەست بکات بە (فاتیحە) خوێندن سوننەتە (إستعاذة) بکات ، واتە بلێت (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ)چوونکە خودای گەورە لە قورئاندا لە سورەتی

النحل دوا لەئایەتی (٩٨) ئەفەرموێت ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ سوورەتی النحل: ٩٨ ، واتە : ئەگەر ویستت قورئان بخوێنیتەوە ئەوا خۆت لە شەیتانی نەفرەت لێکراو دوورخەرەوە، جا هەروەها بێگومان (زانایان) دەفەرموون: ئەم خۆ پاراستنە لە شەیتان لەهەموو کاتێکی قورئان خوێندندا جا لە نوێژ دابێت یان لەهەر کاتێکی تردا دابێت (هەر سوننەتەو پەسەندکراوە) بەلآم فەرز نیە جا ئەوەی ڕاستی بێت خاوەنی تەفسیری (المحرر الوجیز) داو [1] نەقلْ ئەکاو لە (ابن و سیرینی) و لە (ئیبراهیم نەخەعی) و هەندێکی دیکە لە زانایان دەڵێن وتنی (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) لەپێش هەموو ڕکعاتێکی نوێژدا سوننەتە ... بەلآم ئیمام ئەبو حەنیفەو ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خوایان لێبێت) ئەفەرموون تەنها لە ڕکعەتی یەکەمی هەموو نوێژێکدا بە سوونەتی دەزانن و، نەك لەهەموو رکعاتەکاندا (هەروەها ئیمامی مالیك) یش لە نوێژی (فەرزدا) بە سوونەتی دادەنێت بەلآم لە شەونوێژی ڕەمەزاندا بە سوننەتی دادەنێت ، ئینجا پاش ئەو باسە با بچینە خزمەتی لێکدانەوەو ماناکردنی ئایەتەکانی ئەم (سورەتە) پیرۆزەو لەگەڵ (بسم الله الرّحمن الرّحیم) دا چوونکە (موفەسرین) ئەفەرموون هیچ گومانێك لەوەدانیە کە ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحیم) ئایەتێکە لە قورئان و بەشێکە لە ئایەتی ژمارە (٣٠) ی سورەتی (النمل) کە دەفەرموێت: ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ سوورەتی النمل: ٣٠ بەلآم ئایە ئەم ئایەتە ئایەتێکە لە هەموو

---

(1) بڕوانە: (تفسیر ابن عطیة في تفسیر الکتاب العزیز) لە نووسینی (محمد عبدالحق بن عطیة الاندلسي) لاپەڕە ٣٢.

سورەتەكانی قورئان كە لەسەرەتایانەوەیە؟ كۆمەڵێكی زۆر لە زانایان و قورئان خوێنانی گەورەی (مەككەو – كوفەو) كۆمەڵێكی زۆریش لە (صەحابەكان) و ئەوانەیش كە لە پاش ئەوانەوە هاتوون ، هەروەها ئیمامی شافیعی و شوێن كەوتوانی و ئیمامی ئەحمەدیش لە ڕایەكیدا ئایان وایە كە سورەتی (بەرائە) نەبێت بەڵام (ئیمامی مالیك و ئیمامی ئەبو حەنیفەو شوێنكەوتوانی و هەندێ لە زانایانی (شام) لایان وایە كە ئەم ئایەتە بەشێك نیە لە هەموو سوورەتەكانی قورئان بەڵكو ئایەتێكی تایبەتیەو، بۆ جیاكردنەوەی سورەتەكانە لە یەكتری و بۆ دیاری كردنی نێوان سورەتەكان هاتۆتە خوارێ ، هەندێكی تر لە زانایان دەڵێن لە سورەتی (فاتیحە) بە ئایەتێك (حیسابە) بەڵام لە سورەتەكانی تر وانیە.

**( خولاصەی ووتە )**

جا هەروەها بێگومان ئەگەر (بسم الله ....) ئایەتێك نەبوایە لەهەموو سورەتەكاندا چۆن هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دەیانخستە پێش هەموو سورەتێك و دەیاننوسیەوە ؟ ئیمامی (ئەبو داود) لە سونەندا دەگێڕێتەوە كە (ئیبن عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) وتوویەتی: پێغەمبەری خودا (ﷺ) نێوانی سورەتێك و سورەتێكی تری بۆ دەرنەدەكەوت تا (بسم الله الرحمن الرحیم) نەهاتایەتە خوارەوە، بۆیە نابێت هیچ گومانێك لەوەدا هەبێت كە (بسم الله الرحمن الرحیم) ئایەتێكە لە ئایەتەكانی سورەتی (فاتیحە)، جابری كوری عەبدوڵاش (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی ووتم چۆن دەست دەكەی بە نوێژ منیش ووتم بە (الحمدُلله ....) خوێندن دەست پێ دەكەم ئینجا پێغەمبەری خوا فەرمووی نەخێر بە

(بسم الله الرحمن الرحيم) دەست پێ بکە) و هەروەها (ئەبو هورەیرەش)
خوا لێی ڕازیبێت) دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:
(حەزرەتی جبرائیل سەلامی خوای لێبێت) هات نوێژی فێرکردم و بە (بسم
الله الرحمن الرحیم) بە دەنگی بەرز دەستی پێکرد، هەروەها لە دایکی
موسڵمانان خاتوو (أم سَلَمە) وە دەگێڕنەوە کە پرسیاری لێکراوە
سەبارەت بە قورئان خوێندنەوەی پێغەمبەر (ﷺ) لە نوێژدا چۆن بووە ؟
لە وەڵامدا ووتویەتی (یەك بە یەك) ئایەتەکانی دەخوێندەوەو دەیفەرموو
(بسم الله ....) – (الحَمْدُ لله رَبِّ العَالَمِينَ) چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك
جار لە نوێژدا (بسم الله.....) ی بەدەنگێکە بڵند دەخوێندەوە و هەندێك
جاریش بە دەنگێکی نزم بەڵام بە زۆری بە دەنگی بەرز خوێندویەتیەوە[1]

جا با بچینە خزمەتی (تەفسیر)ی سوورەتی (فاتیحە) ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ۝١﴾ واتە : بەناوی خوای گەورەو میهرەبان ، ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ۝٢﴾ واتە : حەمدو سەنا بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جۆرە عالەمێك واتە پەروەردگاری ئادەمی و فریشتەو گشت ئاسمانەکان و

(1) ئیمامی شافیعی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەروەها (بسم الله) بەیەکەم ئایەتی قورئان دادەنێ بەڵام زانایانی دیکە (الحمدُلله) بەیەکەم ئایەت دادەنێن و هەروەها بێگومان پێشەوا شافیعی و زۆرێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) وەك (ئەبو هورەیرە ، ئبن و عومەر ، ئبن عباس ، موعاویەو زۆرانی تریش) جا هەروەها (ئبن عەبدولبڕوو ، ئیمامی بەیهەقی و لە عومەرو عەلیەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) دەگێڕنەوە لە ڕیوایەتێکی (غەریب داو) کە هەرچوار (خەلیفەکەش) بە دەنگی بەرز لە نوێژدا (بسم الله) یان خوێندووە) بڕوانە : پەرتووکی (مصباح القلوب ومفرج الكروب) دانراوی (عبدالرحمن ملا طه) ، بەرگی ٢، لاپەڕە ٤٣٣.

زەوی و بوونـــەوەرە ، پــەروەردگاری تـــەواوی جیهانەکانــە کــەوا بـــوو ئاینەکەشی پەیام و نامەیەکی (عالّەمیە) لە گشت جیهان، ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ ﴾ واتـــــە : بەخـــــشندەو دلۆڤانـــــە کانگـــــای (رەحمـــــەت) و میهرەبانیە(رەحمەتی لە دونیا هەموو شتێکی گرتۆتەوە بەلاّم لە قیامەتـدا تــەنها بــۆ ئیمانداراتــە)، ﴿ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ﴾ واتــە : خــاوەنی ڕۆژی پاداشت و تۆڵەیە (کەسێکی تـر نیـە) بێجگـە لـەو شـتێکی بەدەسـت بێـت بەتایبەتی لەو ڕۆژەدا وەکو لە ئایـەتێکی تـردا دەفـەرموێت ﴿ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ۝١٩ ﴾ سـوورەتی الانفطـار: ١٩ واتـە: ئەو ڕۆژە کەس فریای کەس ناکەوێت کە هیچ شتێکی لەدەسـت نایـەت بـۆ کەسانی تر ئەو ڕۆژە هەموو شتێك بەدەست خوایە فەرمان تەنها فـەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە.

﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ۝٥ ﴾ واتــــە: خوایــــە تــــەنها هــــەر تــــۆ دەپەرستین هەر لەتۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکـەین (لـەکاروباری دیـن و دونیامانـدا بەتایبــەت لــەو کاروبارانــەدا بەتۆنـەبێت بەکەســی تــر لەبەندەکانت ناکرێت).

﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ ﴾ واتە: خوایە ڕێنماییمان بکـە بـۆ ڕێگـەو ڕێبازە ڕاستەکەی خۆت کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامەو شارەزامان بکـە ، وە هەر لەسەر ئـەو ڕێیـەش بەهەمیـشەیی سـەقامگیرو دامـەزراومان بکـە، ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ۝٧ ﴾ واتە: ڕێی ئەو کەسـانەی کـە نـازو نیعمـەت و بەخشـشی خۆتـت بەسـەر دارشـتوون لـە

(پێغەمبەرەان و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان و) واتـە : نـەك ڕێـی ئەوانەی کە خەشم و قینـی تۆیـان بەسـەردا ڕژا (وەك گـەڵی جووڵەکـە)و ، وەنەك ڕێی ئەوانەش کە گومڕاو سەرلەشێواو بوون وەك گەلی نەسـارا واتـە (گاورەکـان) لـە کۆتـایی دا دەڵێین (آمین) واتـە خوایـە ئـەو پاڕانـەوەمان گیرابکـەی و ئـەو نوێـژەمان لێ (قـەبوڵ) بکـەی ... ئـەم ووشـەی (آمـین)ە ووشەیەکی قورئان نیە بەڵکو دوعایەکەو سوننەتە .....

**( درێژەی واتە )**

بـاهـەر وەکـو لـە پێشەوە ئامـاژەمـان کـرد خـوای گـەورە لـە سـورەتی (الحجر) دا ئەفـەرموێت ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴾ واتە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئێمە حەوت ئایەتمان بۆ ناردویتـە خـوارەوە کـە لەنوێژدا دووبارە دەکرێتـەوە و حەمـدو ستایـشی خـوای تیـا دەکرێـت کـە سورەتی (فاتیحا)یە ، کە بە (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ دەسـت پـێ دەکـات [1] و بە ئایەتی ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ ﴾ کۆتایی دێت لێرەوە وا دەردەکەوێت کە (بِسْمِ ٱللَّهِ....) ئایەتێکە لەم سورەتە ، ئینجا دەفەرموێت ئێمـە حـەوت ئایەتمان بۆ ناردویت کە دووبارە دەکرێتـەوە لەگـەڵ ئـەم قورانئـە مـەزن و بەرزەدا کە شوێن کەوتنی فەرمانەکانی مایـەی خـۆش بـەختی و کامـەرانی دونیاو دواڕۆژە ، چوونکە دەسـتوری موسـڵمانانە و سـەرزبیان لـە ژیانـەدا بەپێی پەیڕەوکردنی ئەم قورئانە پیرۆزەیە ، سورەتی (فاتیحە) بەشێکە لە قورئـانی پـیرۆز خـودای بـەرزو بـێ وێنـە لێـەردا بەتایبـەتی نـاوی هێنـاوە

(1) سورەتی (الحجر) ئایەتی (٨٧) هەروەکو لە پێشەوەش بە کورتی ڕاڤە کراوە.

چوونکه ئەم سورەتە (رەحمەت و کەرەم) و بەزەیی بەندەکانی و باسی ئەوەی کە هەر ئەو خاوەنی ڕۆژی دواییە ، هەروەها باسی یەکتاپەرستی و پشت بەستن تەنها بەو، وە داوای ڕێنمایی لێی بۆ ڕێگای ڕاستی ئایینی ڕێگای ئەوانەی کە بەر ڕەحمەتی خۆی خستوون نەك ڕێگای ئەوانەی کە لەبەر خراپی خۆیان و وێڵ بوونیان لە ڕێگای ڕاست کەوتونەتە بەر غەزەبی خودا[1] جا هەروەها هەندێ لە (موفەسرین) ئەفەرموون (غەزەب) لێگیراو جوولەکەن و گومڕاش دیانەکانن ، بەلام ئەوەی ڕاستی بێت لە ڕاڤەو تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ ﴾واتە : نەك ئەوانەی ڕقت لێیانە ، غەزەبی تۆیان لەسەرە (خودایە) نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی ئایینی تۆیان پێگەیشتوەو بڕوایان پێی نەهێناوە، واتە: ڕەشیان کردۆتەوە ، ڕق و غەزەبی تۆیان بەدەست هێناوە بێگومان ئەمانە (خسر الدنیا والآخرة) بوون ، واتە : زەرەر مەندی و بەدبەختی دونیاو قیامەت بوون﴿ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ واتە : ئەوانەی ڕێگای ڕاستیان وونکردووە هەروەها نەك ڕێگای ئەوانەی کە فەرمانی ئاینیان بەباشی پێنەگەیشتووە لە بیرو باوەڕیاندا بەهەڵە داچوون و سەریان لێ شێواوە ، ئیمام (أبو الفدا) واتە (ابن کثیر) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت ﴿ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ ﴾واتە: ئەوانەی کە هەرچەندە (حەق) یان بۆ دەرکەوتووە ، بەلام لایانداوە لێی .... ، ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾یش ئەوانەن کە حەقیان لێ ئالۆزکاوەو نازانن حەقو ڕاستی کامەیە گومڕاو سەرگەردانن .

---

(1) بڕوانە : تەفسیری گوڵشەن، لە نوسینی مامۆستا (نظام الدین عبدالحمید) لاپەڕە ٥٦٩.

**( پاشکۆ )**

(آمين) واته خوایه ئەم نزایەمان لێ وەربگرە، نزاو پاڕانەوەمان قەبوڵ بفەرموو (گیرای بکە) (برایان و خوشکانی ئیماندار) هەر چەندە ئەم ووتەی (آمين) لە سورەتی (فاتیحە) نیە ، بەلاّم هەرچەند پێغەمبەر (ﷺ) کە (فاتحە) ی بخوێندبوایەوە (آمين) ی ئەکرد ، وە لە نوێژی ئاشکراشا هەموو جارێ (ئەصحابەکانی) واتا : یارو یاوەرانی (خوایان لێ ڕازی بێت) هەموویان بەیەك دەنگ لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئەیان ووت (آمین) چوونکە هەر کەسێ بۆی ڕێ بکەوێ لەگەڵ فریشتەکەنا (ئامین) بکاو خودا لەگوناهی لەوەپێشی خۆش ئەبێ و دەبوورێ (ئەم فەرموودەیە (بوخاری و موسلم) ڕیوایەتیان کردووە) دوا ووتەم : جا هەروەها بێگومان ئەم سورەتی (فاتیحە)یە پوختەو خولاّصەی هەموو قورئانە، وەهەرچی لەم قورئانە هەیە هەمووی بەکورتی لەم سورەتەدا هەیە (نبهني الله وإيّاكم مِنْ نُومة الغافلين وحشرني وإياكم تَحَت لواءِ سيِّد المرسلين ، وبعدُ أعوذُ باللهِ من الشيطانِ الرجيم ﴿ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ اللّهم أغفرلنا آمين.

# ئامۆژگاری بیست و چوارەم
## باسی فەزڵ و گەورەیی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ئەکات

الحمدُ لله الذّي أنزَلَ عَلىَ عَبده القرآنَ هُدىً للنـاس وَرَحْمـةً وجَعَلـه حُجـةً واضحة لِمَن تمسَّكَ بهِ وأدى حَقهُ وحجة دامغة عَلَى مَـنْ أعـرَضَ عَنـهُ وجَعَلَـهُ وَراءَ ظهره وَتَركهُ قرآن صدقٍ وعدلٍ وقيم وأخلاقٍ.

ولم يكن للعوج سَبيلٌ إليه لا يأتيه الباطل مـن بـينَ يديـه ولا مـنْ خَلفـه، والصلاة والسَلام على سيدنا مَحمّدٍ الـذّي بَلّـغ الرّسـالةَ وأدّى الأمانـة، وهَـزَمَ جُندَ الشركِ وأهل الخيانة وهَزَمَ البُلغاء والفصحاء ببِلاغَةِ القرآن ، ثُـمَ الرَضـا عن آلـهِ الأطهـار وأصـحابهِ الأخيـار .. المتـأدبين بأدابـه والمهتـدين بهديـه، العاملينَ والحاكمينَ بكتاب الله وتلاوتهِ وسُنة رَسُلهِ (ﷺ) وأشهدُ أن لا إله إلا الله وَحدهُ لا شريكَ لَهُ وأشهدُ أن سيدنا محمداً عبدهُ وَرَسُولُه (صلى الله عليه وسلم) (أما بعد) فيا عباد الله اتقوا الله تعالى وأدوا حقوقَ اللهِ وَحقـوقَ كِتـاب الله القرآن الكريم الذّي تِلاوته عبادةٌ والعملُ بـهِ نجـاةٌ في الـدارين والـذّي فيـه الأعاجيبُ مِنَ المواعظ والحِكمِ والقَصَصِ والأحكام[١]، واتە: لەدوای هەنـدێ ئەی بەنـدەکانی خـودا پارێزگـاری و (تـەقوای) خـودای تـەبارەك و تـەعالا بکەن و هەروەها حەقو مـافی خـوای گـەورە جـێ بـەجێ بکـەن و، حـەق و

(1) بڕوانەپەرتوکی : (تحفه الخطیب) له نووسینی خوالێ خۆش بوو (ملا عبدالله مولود محمود البلبیتانی) لاپەرە ٣٣٩.

مافی قورئانەکەی خودا جێ بەجێ بکەن و کەچەند پیرۆزە، ئەو قورئانەی کە دەورو خوێندنەوەی خوا پەرستیەوە مایەی ڕزگاریە، لەهەردوو دوینــادا ، چوونکە بێگومان ئـەم قورئانـە زۆر شـتی (عـەجایب) و سەرسـوڕهێنەری تێدا هەیـەو ، هـەروەها لـە (نەصـیحەت) و ئامۆژگـاری و پەنـدو چـیرۆك و بەسـەرهات (حـوکم) و ئـەحکام و یاسـای زۆر تێـدا هەیـە و جـا هـەروەها بێگومان خوای گەورە لە قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرۡجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ ﴾ سوورەتی فاطر: ٢٩ ، واتـە: بەڕاسـتی ئەوانـەی (کتێبی) خوا کە قورئانـە دەخوێننــەوە و نوێـژەکانیان بـە چـاکی و ڕێـك و پێکی ئەکـەن و ئـەنجام دەدەن، هـەروەها لـە ڕزق و ڕۆزی و ئـەو سـامانە جۆراوجۆرانـەی پێمـان بەخـشیون جـا ئـەوانیش بەخـشیوانە بـە نهێنـی و ئاشکرا ئەوانە بە ئومێدی بازرگانیەك ئەو کارە دەکەن کە هەرگیز نائومێدو زەرەر مەند نابن) بە واتایەکی تر ﴿ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴾واتە: بە ئومێدی بازرگانیەکن کە هەرگیز تووشی کەمی و زیان نابێت و بەردەوام لە قازانجدان و سوودو قازانجەکەشیان هەر لە زیادبووندایە).

### ( چەند فەرموودەیەکی حەزرەت (ﷺ) لەبارەی قورئان خوێندنەوە )

١) عَنْ أبي موسى الأشعري (رضي الله عنه) عـن الـنبي (صـلى الله عليـة وسلم) قال : (مثلُ الذي يقـرأ القـرآن كالأترجـة طعمهـا طيـبٌ وريحهـا طيـبٌ والذي لا يقرأ القرآن كالتمرة طَعْمَها طَيبٌ وَلا رِيحَ لَها وَمَثل الفاجر الذّي يقـرأ

القرآن كَمَثل الرّيحانةِ ريحُها طَيبٌ وَطْعمُها مُرٌ وَمَثلُ الفاجر الذّي لا يقرأ القرآن كَمَثل الحَنظلة طَعمُها مُر وَلا ريحَ لَها) رواه البخاري، واته: وێنەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان دەخوێنێ وەك ئەترەج و لیمۆ وایە هەم بۆنی خۆشەو هەم تامی خۆشە ، وە وێنەی ئەو ئیماندارەی کە قورئان ناخوێنێ وەکو قەسپ و خورما وایە هەرچەندە بۆن و بەرامی نیە بەلأم تامی خۆش و شیرینە، وە هەروەها وێنەی (مونافیق) واتە دوو ڕووی (قورئان) خوێن وەکو ڕەیحانە وایە چوونکە هەرچەندە بۆنی خۆشە بەلأم تامی تاڵەو ناخۆشە ، وە وێنەی دوو ڕووی قورئان نەخوێنیش وەکو کووژاڵك وایە بۆنی نیە وەهەروەها تامیشی تاڵە وەکو داری زەقنەبووت وایە.

٢) عَنْ عبدالله إبن مسعود (رضي الله عنه) قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) مَنْ قَرأ حَرفاً مِن كِتاب الله فَلَهُ بهِ حَسَنَةٌ والحَسَنةُ بِعَشْرِ أمثالها لا أقولُ (ألم – حرفٌ) ولكن ألْفٌ حَرفٌ ولامَ حرفٌ وَ ميمٌ حرفٌ) رواه الترمذي والدارمي والبيهقي).

واتە: بێگومان هەرکەسێك حەرفێك واتە پیتێك لە قورئان بخوێنێ بەو پیتە خێرو چاکەیەکی بۆ هەیە پاداشتی چاکەشی یەك بە دەیە و ... دەی من نالێم (آلم) یەك پیتەو بەڵکو ئەلیف حەرفێکەو واتە پیتێکەو وە لام پیتێکەو وە میم پیتێکە).

٣) عَنْ عائشة (رضي الله عنها) قالَت: قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) مَثَلُ الذي يقرأ القرآن وَهوَ حافظٌ لَهُ معَ السّفرة الكرام وَمَثَلُ الذّي يقرأ القُرآن وهوَ يتعاهدُ وَهوَ عليه شديدٌ فلهُ أجرانِ) (رواه البخاري ومُسلم)، واتە: لە دایکە ئیماندارانەوە خاتوو (عائیشە) خوا لێی ڕازی بێت ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و بێ هەڵەو

پەڵەو بە ڕەوانی دەیخوێنێ لەگەڵ ئەو فریشتە گەڕۆکە بەڕێزو چاکە کەرانەدایە کە لە جیهانی (غەیبیە) و بەڵام ئەوەی قورئان دەخوێنێ و بە گران بۆی دەخوێندرێ و هەروەها (ڕەحمەتە) لەسەری ئەوا دوو (ئەجر) و پاداشتی هەیە ، واتە: پاداشتێك بۆ خوێندنەوە وە پاداشتێك بۆ زەحمەتیەکەی بەڵام کۆمەڵ و دەستەی یەکەم لەهی دووەم بەڕێزوو پاداشتیان زیاترە).

## ( چەند سوودێك ) [1]

هەروەها عوسمانی کوڕی عەفان (خوا لێی ڕازی بێت) ئەفەرموێ (لَوْ أن قلوُبَنا طهرت ما شبعنا من كَلام رَبنا وأني لأكره أن يأتي عَليّ يَومُ لا أنظر في المصحف)، واتە : ئەگەر دڵەکانمان پاك و خاوێن و بێ غەوش و گەرد بێ ئەوا هەرگیز لە قسەو فەرموودەی پەروەردگارمان تێر نابین وە من ئەو ڕۆژەم پێ ناخۆشە کە بەسەرم تێپەڕێ و سەیری قورئان نەکەم.

(وأن امرأتهُ قَالَتْ ماتَ عثمان (رضي الله عنه) حتّى خرق مَصْحفهُ من كثرة ما كان يديم النظر فيه) [2]، واتە: خێزانەکەی دەڵێت عوسمان (خوا لێی ڕازی بێت) شەهید نەبوو هەتا قورئانەکەی پارچە پارچە بوو لەبەر زۆر لەسەر خوێندنەوەی). چوونکە هەروەهاش (عبدالله ی کوڕی مەسعود) (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ: (أديموا النظرَ في المصحف) رواه الطبراني ،

---

(1) لەبارەی خوێندنەوەو تەماشاکردنی قورئانی پیرۆز.

(2) بڕوانە: پەرتوکی (الأسماء والصفات) دانراوی ئیمامی (بەیهەقی) بەرگی ١ ، لاپەڕە ١٨٤.

واته : بەردەوام سەیری قورئان بکەن و لەسەری بخوێننەوە).

هەروەها (نافع) دەگێڕێتەوەو دەڵێ گوترا (ما كانَ يَصنع إبن عُمَر (رضي الله عنهما) في منزله ؟ قال لا يطيقونه الوضوء لِكل صلاة والمصحف فيما بينهما) رواه ابن سعد ، واته : ئایا عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت لەماڵەوە چی دەکرد؟ گوتی لە تواناياندا نيه (هەموو كەس ئەوە بكەن) حاڵی وابوو بۆ هەر دەست نوێژێك دەست نوێژی دەشوشتەوە و هەروەها لەمابەنينيشيان قورئانی دەور دەکردەوە و دەیخوێند).

هەروەها دەگێڕنەوە (كانَ عروة يقرأ أربع القرآن كلّ يوم نظرا في المصحف ويقوم به الليل فما تركهُ إلا ليلة قطعت رجله ثم عاود من الليلة) [١] واتە: عوروەی کوڕی زوبەیر (خوایان لێ ڕازی بێت) هەموو ڕۆژێك چارەكێكی قورئانی دەخوێند وە شەو لە شەو نوێژدا دووبارەی دەکردەوە، چوونکە بە بەردەوامی ئەم کارەی ئەنجام دەدا تەنها ئەو شەوە نەبێ کە قاچی براوە ئینجا شەوی دوایی دەستی پێکردەوە .

(ئاگاداریەك)

(قالَ الامام النووي (عليه الرحمة) وأعلم أنّ المذهب الصحيح المختار الذي عليه من يعتمد من العلماء إن قراءة القرآن أفضلُ من التسبيح والتهليل وغيرهما مِنَ الأذكار وقد تظاهرت الأدلة عن ذلك) [٢] ، واتە: بێگومان

---

(1) بڕوانە: پەڕتوکی (صِفةُ الصفوة) ، دانراوی عەللامەی (ابن الجوزي) ج٢ ، لاپەڕە ٦٢.

(2) بڕوانە: پەڕتوکی (التبيان في أداب حملة القرآن) دانراوی ئیمام (محي الدين النووي) لاپەڕە ١٢.

ئیمامی نەوەوی (رەحمەتی خوای لێبێت) ئەفەرموێ (خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە زیکری (سبحان الله و لا إله إلاّ الله) و باقی زیکرەکانی تر گەورەترە چوونکە فەزل و پاداشتی زیاترە و چوونکە بێگومان بۆ پاڵپشتی ئەم چەند فەرموودەیەی (ئیمام) چەندان بەڵگەی دیارو ئاشکرا هەنە.

## ( بێگومان قورئان بەرنامەی ژیانە )

جا هەروەها بێگومان پێویستە، بیرو باوەڕمان وابێ کە ئەو خودایە ئەم خەڵکەی درووست کردووە، ئەبێ هەر ئەویش کاروباری ئەم خەڵکە بەڕێوە ببە کەوابو هەر ئەو خوایەش ئەزانێ کام یاسا باشە ڕەفتاری پێ بکرێ جا لەبەر ئەوەی خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ناردبێ یاسای ژیانیشی بۆ ناردووە، تا بەناردنی حەزرەتی محمد (صلى الله عليه وسلم) کۆتایی ناردنی پێغەمبەرانی (سەلامی خوایان لەسەر بێت) هێناو ئینجا قورئانی پیرۆزی بۆ نارد تاکو ئەم خەڵکە بیکاتە بەرنامەی ژیان و ڕەفتاری پێ بکاو جا هەروەها خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرموویەتی ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ﴾النساء:١٠٥ ، واتە: ئێمە قورئانمان بۆتۆ ناردۆتە خوارەوە تاکو داد لەنێوان ئەم خەڵکە دابکەی بەو یاسایەی خوا پێی ناساندوی، جا هەروەها خوای گەورە لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموەێت ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ سوورەتی المائدة: ٤٤ ، واتە: هەرکەسێك بەو یاسایە داد نەکات کە خوا ناردویەتیە خوارەوە ئەوانە کافرن واتە بێ باوەڕن) بەڵام عبدالله ی کوڕی

عەبباس (خوایان لێ ڕزای بێت) بەم شێوەیە (تأویلی) ئەم ئایەتەی کردووە جا هەر وەکو ئەفەرموێ (عَن إبن عباس) (رضي الله عنهما) في تفسير هذه الآية (مَن لَمْ يَحْكُم بما أنزلَ الله، جَاحِداً به فَقَد كَفَر، وَمَن أقر بهِ ولَم يَحكم فَهوَ ظالمٌ فاسقٌ) رواه ابن جُرير الطبري. واتە: (إبن عباس)فەرمویەتی تەفسیری ئەو ئایەتە ئەوهایە (هەر کەسێ داد بەم قورئانە نەکا چوونکە باوەڕێ نیە ئەوە (کافرە) بەڵام ئەگەر باوەڕی پێی هەبێ و ڕەفتاری پێ نەکا ... ئەوا (زاڵم) و (فاسقە) واتە لە (شەریعەت) لای داوە[1]

## (باسێك لە پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئانی پیرۆز)

جا هەروەها بێگومان ئیمانداران دەبێ باوەڕیان وابێ کە خوای گەورە ئەم قورئانەی لە هەموو ڕوێکەوە پاراستووە و هەرچی تێدایە هەقەو ... فەرمودەی خوای گەورەیە ، دوورە لەکەم و کوڕی و تا دونیا بە دونیایە گۆڕانکاری بەسەردا نایەت وەدتوانین بڵێین ئەو قۆناغانەی کە خوای گەورە قورئانی پێ پاراستوە چەند قۆناغێکن و .

یەکەم – هروەکو خوای گەورە لەم چەند ئایەتە بۆمانی ڕوونکردۆتەوە و ئەفەرموێت ﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ فِى لَوْحٍ مَّحْفُوظٍۭ ﴿٢٢﴾ ﴾ سوورەتی البروج: ٢١ – ٢٢، واتە : بەڵکو ئەوەی کە بە درۆی دەزانن قورئانێکی شکۆمەندو گەورەیە لە (لەوحێکی) پارێزراو دایە.

دووەم) خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ

---

(1) بڕوانە : عەقیدەی ئیسلامی لەسەر ڕاڕەوی (أهل السنه والجماعه) لە نووسینی مامۆستا (مەلا عبدالله هەرتەلی) لەگەڵ دەست کاری ، لاپەڕە ٢٥.

عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ ﴾ سوورەتی القیامة: ١٦ — ١٧، واتە: قورئانت پێ لەبەردەکەین و دەیخوێنیتەوە، لەبیرت ناچێت ﴿ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾ سوورەتی القیامة: ١٨، واتە: کاتێك قورئانمان بۆ خوێندیەوە ، بەهۆی جبریلەوە (سەلامی خوای لەسەر) تۆش شوێن خوێندنەوەی ئەو بکەوە ﴿ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ سوورەتی القیامة: ١٩، واتە: دڵنیابە لەسەر ئێمەیە قورئان خوێندنەوەی تۆ بە ئاسانی) هەروەها لە حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ) دا هاتووە (کە حەزرەتی (جبریل) دەهات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) کە قورئانەکەی بۆ دەهێناو ئینجا حەزرەت (ﷺ) گوێی لێ دەگرت دوای ڕۆیشتنی بەو شێوەیە (جبریل) قورئانەکەی دەخوێندەوە پێغەمبەریش (ﷺ) دەیخوێندەوە.

سێ هەم) پاراستنی خوا بۆ قورئان دوای ئەوەی لەلایەن پێغەمبەرەکەی (محمد صلی الله علیه وسلم) ڕاگەیەندرا هەتا دونیا بە دونیایە ، هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ سوورەتی الحجر: ٩ ، واتە: بە ڕاستی هەر ئێمە قورئانمان دابەزاندووەو بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری دەکەین .

چوارەم) پاراستنی خوای گەورە بۆ قورئان لەکاتی ڕاگەیاندن و خوێندنەوەی لەلایەن حەزرەتی پێغەمبەرەوە (صلی الله علیه وسلم) بەسەر بەندەکانی خوا چوونکە بێگومان خوای گەورە خۆی سەرپەرشتی کردووە لە گەیاندنی (دەقاو دەقی) ئەم قورئانە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ ئێمە

وەکـو قورئـان ئەفـەرموێت ﴿ وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ ٱلْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ ﴾ سوورەتی القصص: ٥١، واتە: سوێند بە خوا ئایەتەکانی قورئانمان بەشوێنی یەکدا بۆ ناردوون تا پەند وەربگرن و بیر بکەنەوە).

**( الفوائد – واتا چەند سودێك )**

١) روي عن الامام الشافعي (رحمة الله عليه) أنه كان لا ينام إلا سويعات ويقض بقية الليل مضطجعاً يفكر في القرآن ويستنبط منهُ الأحكام... قال (أحمد بن حنبل) (رحمة الله عليه) بِتُ عِنده ليلةً فَصَلَيت الى الصبح ، واضطجع هو إلى الصُبح فاستنكرت ذلك مِنهُ فقام وصلى ركعتي الفجر فقلت لهُ في ذلك فقالَ أظننتَ أني نُمتُ كلا إني أستخرجت من كتاب الله (نفيفاً و مائة) مسألةً فأنت عَمِلتَ لِنَفسكَ وأنا عَملتُ للأمة [1]. واتە: (روایەت کراوە لە ئیمامی شافعی (رەحمەتی خوای لێ بێت) هەروەها لێی دەگێڕنەوە لەم زاتە کە کەمێك لە شەو دەخەوت و زۆربەی جار ئەوەی تری هەموو بە بیرکدرنەوە لە (قورئان) بەسەر دەبرد، وە بەپاڵ کەوتنەوە چەندان (حوکم) و بڕیاری لە قورئانی پیرۆز دەردەهێناو ئینجا پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێ شەوێکیان لەلای ئەم زاتە مامەوە شەو تا بەیانی نوێژم کرد ... ئەویش تا بەیانی پاڵی داوەو ئەوجا دەڵێ ئەمنیش ئەوەم زۆر لەلا سەیر بوو ئیدی هەستاو دوو رکعەت نوێژی سوونەتی بەیانی کردو ، ئینجا منیش دەربارەی ئەمە قسەم لەگەڵ کرد،

(1) بڕوانە: پەرتووکی(تنوير الإزهان من تفسير روح البيان) لە کورتکردنەوەو نووسینی (دکتور محمد علی صابوونی) بەرگی دووەم لاپەڕ ٣٣٥.

ئەویش گووتی: ئایە گومانت برد کە من خەوتووم؟ نەخێر مـن نەخـەوتووم بەڵکو (سەدو ئەوەندە) مەسەلەو (حـوکمم) لـە کتێبـی خـوا کـە (قورئانـە) دەرهێناو، تۆش کارت بۆخۆت کردووە منیش بۆ ئوومەتی (محمـد – صـلی الله علیە وسلم) کارم کردووە).

٢) هەروەها (ڕیوایەت) کراوە لە جەعفەری کوڕی سولەیمان (ڕەحمەتی خوایان لێبێت) دەڵێت لـە مـالیکی کـوڕی (دینـارم) بیـست ئەیفـەرموو (إنّ الصدّیقین إذا قُرءَ علیهم القرآن طربت قلوبهم إلی الآخرة) واتە : ئەوانـەی لـە باوەڕەکەیاندا لەگەڵ خواو پێغەمبەر (ﷺ) ڕاست دەکەن ئەگەر قورئانیان بەسەردا بخوێنرێت دڵیان بۆ قیامەت دەگەشێتەوەلە خۆشیاندا...)

٣) قال وهیب بن الـورد: قیـل لرجـل اُلاّ تنـام ؟ قـالَ إن عجائـب القـرآن أطرن نَوْمي[1] ، واتە: وەهیبی کـوڕی وەرد دەڵێـت : بـەپیاوێك گـوترا ئایـە ئـەوە بـۆ ناخـەوی؟ ئـەویش لـە وەڵامـدا گـووتی بەڕاسـتی سـەیرو سـەر سوڕهێنەرەکانی قورئانی پیرۆز خـەویان لێ ڕەواندومەتـەوە، خـەو ناچێتە چاوم .

## (لطیفةٌ ... واتە ڕووداوێکی ناسك)[2]

جا هەروەها بێگومان بۆئەوەی (خاوەن باوەڕان) زیـاتر پابەنـد بـن بـۆ فێربـوونی خوێندنـەوەی قورئـانی پـیرۆز ، وە هـەروەها بـۆ تێگەیـشتن و

---

(1) بڕوانە (صفة الصفوة) لأبن الجوزي ، ب٢، ل٥٣.

(2) (عبدالله)ی واسگی (ر.خ) دەڵێت: لەگەڵ ئافرەتێکی (حافظة القرآن) هەمووی لەبەر بووە، لەسەفەری حەجدا قسەی هەموو بەقورئان بووە.

کارپێکردنی ئەم (کیتابە) بەرزە، کە زۆر لە دۆستانی خوا کردویانە بەسەر مەشـقی خۆیـان و چـوونکە ئـەم قورئانـەیان هێنـدە خـۆش ویـستوە بەشێوەیەکی وا ئەگەر ئاخاوتنێکیشیان کردبێ هەر بە ووتەی قورئان بووە و بەس.

ئەوجا بفەرموون لەگەڵ ئەو بەسەرهاتە پڕ لە زیرو (حیکمەت) و مانایـە دا هەروەکو لە پەرتووکی) مصباح القلوب ومفرج الكروب)[١] دا هاتووە کە ئەگێڕنەوە لە (عبدالله) ی (واسطي)[٢] رەحمـەتی خـوای لێبێـت ، ئـەڵێت : ساڵێك لە ساڵاندا چووم بۆ (حەج) واتە بۆ ماڵی خودا ئـەوجا لەگـەڵ چـەند هاوڕێیـەکی خوانـاس (زاهیـد) بـووین بـە (رەفیـق) یـەکێ لـەم هاوڕێیانـە ئافرەتێکی (عەفیفە)و زۆر بە (حەیاو شەرم) بوو ئاخاوتن و قسەکانی بەس بە قورئان بوو واتە: تەنها ئایـەتی قورئـانی دەخوێنـدەوە وە هـیچ قـسەی (دونیای) نەدەکرد ئەوجا منـیش تۆزێـك لێـی نزیـك بوومـەوە وە پـێم ووت (السّلاُم عليك يـا أمـةِ الله؟) دەڵـێ ئـەمیش وەڵامـی دامـەوەو فـەرمووی ﴿ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ٥٨ ﴾ سوورەتی یس: ٥٨ ، واتە: سـڵاوو رێـزدار لەلایـەن پـەروەردگاری میهرەبـان و دلۆڤانـەوە) ئینجـا هـەروەها پـێم ووت ئەدی باشە پێم بڵێ ناوت چی یە ؟ ، ئەمیش لە وەڵامدا فەرمووی ﴿ وَٱذۡكُرۡ

---

(1) بڕوانە: پەرتوکی (مصباح القلوب ومفرج الكروب) لە نووسینی (عبدالرحمن ملا طه عبدالعزيز) بەرگی (١) ، لاپەڕە ٤٠٦،٣٣٥.

(2) ئیمام عەبدوڵلا خەڵکی شاری (واسگ) بوەو مرۆڤێکی زۆر ٠صالح) و(موتقی) و خواپەرست بووەو هەندێکیش ئەڵێن (تابعين) بووە چونکە زۆر فەرموودەی گێڕواتەوە.

﴿فِي ٱلْكِتَٰبِ مَرْيَمَ﴾ سورەتی مریم: ١٦ ، واتە: ئەی خۆشەویست (ﷺ) لە قورئاندا باسی بەسەرهاتی (مەریەم) بکەو هەروەها یادی بکەرەوە) ئینجا زانیم ناوی (مەریەمە) ، ئینجا پێم ووت ئەدی ناوی باوکت چی یە؟ ئەمیش لە وەلاّمدا ووتی﴿إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ﴾ سورەتی نوح: ١، واتە: بەڕاستی ئێمە نوحمان ڕەوان کرد بۆلای (قەومەکەی ئینجا لەمەوە زانیم کەوا ناوی باوکی نووحە)و واتە گەلەکەی ئینجا پێم گووت ئایە منالّت هەنە؟ ئەویش لە وەلاّمدا ووتی ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا﴾سورەتی الشوری: ٥٠ ، واتە: یاخود لەهەردوو جۆر هەندێك خێزان دەبەخشێت لە کوڕو کچ ، ئەوجا دەڵێ زانیم کە منالّی هەیە جا پێم گوت ئەی باشە ناویان چی یە ؟ ئەویش لە وەلاّمدا ووتی: ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِسْمَٰعِيلَ﴾سورەتی مریم: ٥٤ ﴿وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ﴾ سورەتیمریم: ٥١، هەروەها ئەم ئایەتەشی خوێندەوە﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلْأَرْضِ﴾ سورەتی ص: ٢٦، جا دەڵێ زانیم کە سێ کوڕی هەنە بەناوی (ئیسماعیل و موسی و داوود)، ئینجا دەڵێ پێم گووت (ئیتر دەمەوێ سەرکەویە سەر پشتی ووشترەکەم، ئەمیش لەکاتی بەسەرکەوتنی پێی گووتم (ئەی عبدالله) ﴿قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا۟ مِنْ أَبْصَٰرِهِمْ﴾ سورەتی النور: ٣٠، واتە ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوانی ئیماندار بڵێ چاویان بپارێزن لە ڕوانینی ئافرەتی نا مەحرەم،ئەوجا کاتێ کە پێی بەرز کردەوە لەسەر زەوی ووتی:﴿بِسْمِ ٱللَّهِ﴾ سورەتی هود: ٤١

واته: بەناوی خودا وە کاتێکیش کە دانیشت لەسەر پشتی وشترەکەوە ووتی ﴿ سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ۝١٣ ﴾ سورەتی الزخرف: ١٣، واتە: پاك و (منزەهی) و بەرزی و بێگەردی بۆئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ ڕەخساندوین، خۆ ئەگەر ئەو بە بەزەیی خۆی ئەمەی بۆ ڕام نەکردینایە ، ئێمە نەماندەتوانی ڕامیان بهێنین و موسەخەریان بکەین ، ئەوجا کاتێکیش ویستی بێتە خوارەوە ، واتا دابەزێت ئینجا ووتی ﴿ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ۝٢٩ ﴾ سووورەتی المؤمنون: ٢٩ ، واتە: بڵێ پەروەردگارا لە شوێنێکی (موبارەك) و پیرۆز دامبەزێنە چوونکە تۆ چاکترین زاتێکی بۆ ئەوەی لە شوێنی (موبارەك) و پیرۆز دابمەزێنیت) ئەوجا کاتێك لەسەر زەویەکە دانیشت پێم گووت دەتەوێ نانێك یا شتێك بخۆی؟ ئەمیش لە وەڵامدا فەرمووی ﴿إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا ﴾ سورەتی مریم: ٢٦، واتە: بەڕاستی من بڕیارم داوەو (نەزرم) کردووە کە بەڕۆژوو بم بۆ خوای میهرەبانم. ئینجا کاتی بەرە بەری ڕۆژ لەسەر ئاوابوون بوو کوڕەکانی هاتن بۆلای بە ئێمە گەیشتن ئینجا دایکی پێیانی گووت ﴿ فَٱبْعَثُوٓا۟ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ ﴾ سورەتی الکهف: ١٩، واتە: دەی یەکێکتان بنێرن با ئەم پارە واتە ئەم دراوە ببات بۆ شار، ئینجا بڕوانێ و سەرنج بدات بزانێ کێ خۆراکی (حەڵاو – ڕەوایی) هەیە یا پاك و خاوێنی هەیە لەو خۆراکەتان بۆ بکڕێت و بۆتان بهێنێت کاتێ کە خۆراکیان هێناو ئێوارە (فتاری)

کردەوە و خواردنی خوارد لەگەڵمان ئینجا تووشی هات و زۆر ناڕەحەت بوو (حاڵی) گۆڕاو ... جا منیش پێم گووت ئەمە چی یە ؟ چی ڕوو ئەدا ئەی خوشکی خاوەن باوەڕم؟ ئەویش لە وەڵامدا ووتی: ﴿ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴾سورەتی ق: ١٩ واتە ئەی ئینسان تەنگانەی مردن و ئازارەکانی هات هاوڕێ لەگەڵ ڕاستیەکاندا ئەوسا پێت دەوترێت ، ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕوداوەیە کە خۆتت لێ لادەداو پەنات لێ دەگرت ، جا هەروەها (ڕاوی) دەڵێ کە (عبدالله) ی (واسطي) لەدوای ئەم گفتوگۆیەی ئەم ئافرەتە (صالّیحە) بە ووتەی قورئان و ئاخاوتنی ئینجا لەپاشان وەفاتی کردو ، جا لەدوای شوشتن و کفن و دفنی دا ، ئینجا شەو هاتە خەوم و منیش لە خەوەکەدا پرسیارم لێی کرد و پێم گووت ئاخۆ دوای مردنت حاڵت چۆنە ؟

ئەویش لە خەوەکەش هەر بە ئایەتی قورئان وەڵامی دامەوەو فەرمووی: ﴿ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَنَهَرٍ ﴿٥٤﴾ فِى مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُّقْتَدِرٍۭ ﴿٥٥﴾ ﴾ سورەتی القمر: ٥٤ – ٥٥ ، واتە: بێگومان ئەوانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزگارن لەناو باخ و باخاتەکان و ڕووبارەکانی بەهەشتدا بەوپەڕی خۆشی و کامەرانیەوە بۆخۆیان ڕادەبوێرن و لە جێگایەکی زۆر خۆش و سازگارو دلگیرو لەژێر سایەی کەرەم و بەزەیی پاشای خاوەن هێزو تواناادا نیشتەجێ دەبن کە خودای پەروەردگاری تاك و تەنها و جوانکارە) خوایە ئەو جێگایە پیرۆزەمان بە نسیب بکەی ئامین.

**( سەرنجێکی گرنگ )**

له ئـەبو هـورەیرەوە (ڕەزای خـوای لێ بێـت) دەڵێـت پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمویەتی: (ما مِن قومٍ يَجْتَمِعُونَ في بيتٍ مِنْ بيوت الله عَزّ وجلّ يقرءون ويتعلّمُونَ كتاب الله عزَ وجل يتدارسونه بينهم إلاّ حفّت بهم الملائكة وغشيتهم الرحمة وذكرهم الله فيمن عندهُ) رواه مسلم و الامام احمد و الترمذي) واتـه: هەرکۆمـەڵێك لـە ماڵێـك لـە ماڵـەکانی خـوا بـۆ خوێندنـەوەی قورئـانی پـیرۆزو سـەرنج دان و وەرگرتنـی (حیکمـەت) و ئامۆژگاری یەکانی کۆببنەوەو لە نێوان خۆیاندا لێکۆڵینەوەی لەسەر بکـەن و موتـاڵای بکـەن ئـەوا هێمنـی و ئـارامی و ئاسـایش دەبارێتـە سـەریان و ڕەحمـەتی خـوا بـە لێشاو دەیانگرێتـەوە و فریـشتەکانیش چـواردەوریان دەگرن و خوای پەروەردگاریش لەلای خۆی لای مەلائیکەتەکان باسـی ئـەو کۆمەڵە قورئان خوێنە دەکات [١].

**( باسێك لە باوەڕ بە کتێبەکانی خوا پێویستەو فەرزە )**

جـا هـەروەها بێگومـان بـاوەڕ بـەو کتێبانـەی کـە خـوا نـاردونی بـۆ پێغەمبەران (سەلامی خوایان لەسەر بێ) بەڵێ بڕوا بـوون بـەو کتێبانـە کـە تـەورات و ئینجیـل و زەبـورو (صـحف) و قورئانـە پایەیەکـە لـە پایـەکانی ئیسلام واتـە ئەگـەر کەسـێك بـاوەڕی بەیـەکێ لـەم کتێبانـە نـەبێت ئـەوە باوەڕی دانامەزرێ بە موسڵمان نادرێتە قەڵەم ..)

---

(1) بڕوانه : (زنجیرەی بەرەو بەهاری قورئان) لە نووسینی بەڕێز (غریب عزیز) لاپەڕە ١٢٧.

ئینجا هەروەها ئەو (کتێبانە کە ناویان هاتووە لە قورئاندا ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم :- تەورات ... کە بۆ (موسا) پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە هەروەکو قورئان دەفەرموێت : ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞ ﴾ سورەتی المائدة: ٤٤، واتە: ئێمە تەوراتمان نارده خوارێ بێ شك بۆ هەموو خێرو چاکەیەك ڕێنمایی و ڕووناکی تێدایە.

(عَن أبي ذر (رضي الله عنه) قالَ قُلت يا رسول الله فما كانت صحف موسى (عليه السلام) ؟ قالَ: كانت عبراً كلّها (عَجِبْتُ لِمَنْ أيقَنَ بالموت ثُمَ هو يَفرحُ عَجِبتُ لِمَن أيقَن بالنّارِ ثم هُوَ يضحك ، عَجِبتُ لِمَن أيقَنَ بالقَدَرِ ثُمَ هوَ يَنصبُ عَجِبتُ لِمَن رأى الدُنيا وتَقَلبها بأهلها ثم أطمأن إليها عَجِبتُ لِمَن أيقن بالحِسابِ غَداً ثُمَ لا يعمَلُ) [1].رواه إبن حيان في صحيحه، واتە: لە ئەبی زەرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ حەزم ئەکرد ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کیتاب و نامەیەی کە بۆ حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) چی بوو ؟ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی بریتی بووە لە چەند پەندو ئامۆژگارییەك بۆ گەلەکەی بەم شێوەیە:-

ئەمەش دەقەکەیەتی هەروەکو ئەفەرموێت: (سەرم سوڕئەمێنێ لەو کەسەی بڕوای بە مردن هەیەو کەچی کەیف و خۆشی دەنوێنێ ... سەرم سوڕئەمێنێ لە کەسێك بڕوای بە ئاگری دۆزەخ هەیەو کەچی پێ دەکەنێ ... سەرم سوڕ دەمێنێ لەو کەسەی بڕوای بە قەدەری خوا هەیەو خۆشی

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (منهاج الصالحين من أحاديث وسنة خاتم الأنبياء والمرسلين) لە نووسینی (عزالدين بليق) لاپەڕە ٨٤٤.

ماندوو دەكات ... سەرم سوڕئەمێنێ لە كەسێك كە بێ باری وەفـایی دنیـا دەبینێ كچی پاڵیشی پێوەدەدات ... سەرم سوڕئەمینێ لە كەسێك بـڕوای بە لێپرسینەوەی دواڕۆژ هەیەو كەچی كردەوەی ناشرین دەكات؟).

دووهەم:- ئینجیل ... هاتووە بـۆ (عیسا) پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێبێت) هەروەكو قورئان ئەفـەرموێت ﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾ سورەتی المائدة: ٤٦، واتـە : بەدوای پێغەمبەرەكانی (بـەنی ئیـسرائیل) دا عیـسای كـوڕی مەریەمیـشمان نـارد ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾ سورەتیالمائدة: ٤٦، واتـە : كە بـاوەڕی بـەو تەوراتـە هـەبوو بـەر لـەخۆی هاتبوو ﴿ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ ﴾ سـورەتـی المائـدة: ٤٦، واتـە: وە ئینجیلیشمان دایێ كـە ڕێنمـایی و ڕوونـاكی تێـدابوو ﴿ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ سـورەتـی المائـدة: ٤٦، واتـە تەسدیقی تەوراتیشی دەكرد).

سـێ هـەم :- زەبـوور... هـاتووە بـۆ حـەزرەتی داوود (علیـه الـسلام) هـەروەكو قورئـان شـایەدی بـۆ ئـەداو ئەفـەرموێ ﴿ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴾ سورەتی الإسراء: ٥٥، واتە: كتێبی زەبوریشمان بە (داوود) دا .

چـوارەم :- صـوحوف... هـاتوون بـۆ هەنـدێك پێغەمبـەران وەك : حـەزرەتی موسـاو ... ئیـبراهیم و ... هتـد...) ئینجـا خـوای گـەورە لـەم بارەیەوە ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ سـورەتـی الأعلـی: ١٨، واتە: ئەمەی بەڕاسـتی باسـكراوە لـەم سـورەتەدا لەنامـەی ئاسمانیـە

پێشوەکانیشدا هەیە ، هەروەها ئەفەرموێت ﴿ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴾ سورەتی الأعلی: ١٩، واتە: لە نامەکانی (ئیبراهیم و موسا) سەلامی خوایان لەسەر بێت) دیسان ئەفەرموێت (عَن أبي ذر (رضي الله عنه) قالَ قُلتُ يا رسول الله ما كانت صُحف ابراهيم ؟ كانت أمثالا كُلّهَا ... وَعَلى العاقل مالَم يَكُن مَغلُوبا على عَقله أن يكونْ لَهُ ساعاتٌ فساعةٌ يُناجي فيها رَبّهُ وَساعةٌ يُحاسبُ فيها نفسهُ، وساعةُ يتفكرُ فيها في صُنعِ الله عَز وَجَل وَساعةٌ يَخلو فيها لِحاجَته من المَطعَمِ والمَشرَب) رواه ابن حِبان والحاكم وَقالَ صحيح الإسناد) [1]، واتە : (ئەبو زەر خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێ پرسیم لە پێغەمبەر (ﷺ) (صوحوف) بریتی بوو لە چی ...؟ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بریتی بووە لەچەند (ووتەیەکی) پڕماناو نەستەق (مثل) وەك: پێویستە مرۆڤی ژیر (عاقل) کاتی خۆی دابەش بکات بەم شێوەیە، بەشێکی بۆ لالەو (موناجاة) واتە خواپەرستی ، بەشێکی سەرزەنشتی (محاسبە) ی دەروونی بکات، بەشێکی بیر لە بوونەوەر بکاتەوە ، بەشێکی خەریکی پەیداکردنی نان و خۆراك بێت ...)

**( ئاگاداریيەكی گرنگ )**

جا هەروەهاو بێگومان ، ئەی خاوەن باوەڕان ، ئەبێ باوەڕمان هەبێ کە خوای گەورە چەند کتێبێکی بۆ چەند پێغەمبەرێك ناردووە (ﷺ) تاوەکو ڕەفتاری پێ بکەن، جا هەروەها ئەم کتێبانە ژمارەیان (١٠٤) کتێبە لەوانە دە (صحف) بۆ حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرە (ﷺ)

---

(1) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو .

هـەروەها (تـەورات) بـۆ موسـى پێغەمبـەرە (ﷺ) هـەروەها (زەبـوور) بـۆ (داوود) پێغەمبەرە (ﷺ)، (إنجيل) بـۆ (عيـسى) پێغەمبـەرە (ﷺ) بـەڵام (قورئان) بۆ پێغەمبەری ئیسلامە حەزرەتی (محمد) (صلی الله علیه وسـلم) جا هەروەها (بزانن) بەهاتنی قورئانی پـیرۆز ئـەم کتێبانـە گـشتیان لـەکار کەوتن و سـەرڕای ئەمـەش زانایـانی (جوولەکـەو – دیانـەکان) دەسـتکاری تـەورات و (ئینجیلیـان) کـردوو گۆڕیـان بـەڵام کـەس نـاتوانێ دەسـتکاری قورئان بکات ، چوونکە قورئان (موعجیزەی) بەردەوامی پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) کەوابوو – هەروەك خـۆی ئەمینێتـەوە هـەتا هەتایـە ، جـا سەد ڕەحمەت لەوکەسە کە گووتویەتی:

(ئەو کتووبانەی فەرموودەی خودان　　ڕاستن کە هاتوون بۆ پێغەمبەران
(صُحُفي) ئیبراهیم (تەوراتی) موسا　　(زبوری) داود (ئینجیل) ی عیسا
هەروەها (قورئان) لەبۆ پێغەمبەر　　واتە محمد (ﷺ) سەرداری بەشەر
لەو کاتەی قورئان هاتۆتە خوارێ　　بێکار بوون ئەوان گشتی بەجارێ
سوورەتەکانی قورئانی پیرۆز　　سەدو چواردەیە ئەی برای دڵسۆز
هەر کەس بیخوێنێ سی جزوی قورئان　　زۆر خۆشەویستە لای خودای منان[١].

جا هەروەها بێگومان، قورئانی پیرۆز دواییی کتێبـەکانی خوایـە ، واتـە ئیتر دوای ئەو (قورئان) و کتێبێکی تر نایەتە جێگای چوونکە پێویست نیە تا کتێبێکی تر بنێردرێت بەومانایە هەرچی پێویستی ژیانی ئادەمیزاد بێـت

---

(1) بڕوانە : عەقیدەی ئیسلامی لەسەر ڕاڕەوی (أهل السنة والجماعة) لە دانانی مامۆستا (عبدالله عبدالعزيز هەرتەلی) لاپەڕە ٢٥.

هەمووی تێدایە، بگرە لە (عیلم) و زانینی (ئەوەڵ) و (ئاخر) وە هەروەها باسی هەموو گەلان و میللەتانی پێشووی تێدایەو بەسەرهات و لەناوچوونیان ...هتد.

**(تێبینیەكی گرنگ)**

جا هەروەها بێگومان بەڕاستی (قورئانی پیرۆز) گەورەترینی هەموو (كتێبەكانی) خوایە وە دەبێ تەنها ئەم بكرێ بە بەرنامەو یاسای گەلان و میللەتان و (دەوڵەتان) چوونكە ئەوانی تر بەپێی فەرموودەی قورئان كە بۆمان دەگێڕێتەوە، دەست كاری كراون و (ئاڵ و گۆڕییان) بەسەردا هاتووە ... واتە بێگومان ئەو تەوراتەی كە كاتی خۆی هاتووە بۆ حەزرەتی (موسا سەلامی خوای لەسەر بێت) وەك خۆی نەماوەتەوەو، چوونكە گاورەكان بە ئارەزووی خۆیان هەڵیان سووڕاندووەو ئەو (تەورات)ەی ئێستا وا بەدەست جوولەكەكانەوەیە چەند نووسەرێك پێكەوەیان ناوە، وە لەچەندەها چەرخ و ڕۆژگاردا نووسراوەتەوە....)

جا هەروەها زۆربەی (موفەسرین) وەكو پێشەوا (طبري) و (رازي) و (قورطبي) و (ئالوسي) و (بیضاوي) و (إبن كثیر) و (فرید وجدي) و (و هتد....)

ئەفەرموون بەبەڵگەی دیاری و ئاشكرامان بۆ گۆڕانی (تەورات) ئەمەیە كە ئەو تەوراتەی هی گاورەكانە جیاوازە لەوەی لای جوولەكەكانە ... جا هەروەها بێگومان بەڵگەیەكی تریشمان ئەوەیە، كە زۆر شت هەیە بە هیچ شێوەیەك ناگونجێت لەگەڵ پێغەمبەریەتیدا كەچی ئەمان لە (تەوراتا)

نووسیویانە ، بۆ نموونـە بـە حـەزرەتی ئیـبراهیم (علیـە الـصلاە والـسلام) دەڵێن زۆر (کذاب)ە واتـە: زۆر درۆزنـە وە بـە (لـوط علیـە الـسلام) دەڵـێن لەگەڵ کچەکانی خۆیدا دەستی تێکەڵ کردووە، بە حەزرەتی (داوود) علیـە الـسلام) دەڵـێن دەسـتی کـردووە بـە حـەزکردن و ئەڤینـداری لەگـەڵ خێزانی(ئۆریا) ی هەوڵیدا ... تا وای لێکرد بە کوشتنی داو ئینجـا ژنەکـەی مارەکردەوە، بە حەزرەتی سولەیمانی کوڕی دەڵێن لەسـەر داوای ژنەکـەی سوجدەو کڕنوشی بردووە بۆ بوتـەکان ، ئێمـەش چـی دەڵـێین لـە وەڵامـی وانـدا کـە لـەم درۆو بوختانانـەی کـە هـەڵیان بەسـتووە بەسـەر ئـەو پێغەمبەرانە[1]. ﴿سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ١٦﴾ سورەتی النور: ١٦،وە هەروەها لە ئایەتێکی تـردا خـوای گـەورە ئەفـەرموێت:﴿كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا ٥﴾ سـورەتی الکهـف: ٥، ئایـا ئەی خاوەن ئیمان و باوەڕان، بەڵگە لەمـە بـەهێزتر دەبـێ هـەبێت لەسـەر گۆڕانی تەورات؟)

هەر لەبەر ئەم ڕاستیە بووە (حاخام بارێز) ناچار بووە بەوەی کە بڵێت تەورات دەست کـاری کـراوە ئـەم (تـەورات)ە ئـەوە نییـە کـە هـاتووە بـۆ (موسـا) پێغەمبـەر (سـەلامی خـوای لێ بێـت) هـەروەکو خـوای گـەورە لـە قورئانـدا ئـەوەمان بـۆ دەگێڕێتـەوە و ئەفـەرموێت : ﴿ ۞أَفَتَطۡمَعُونَ أَن

(1) ئێمەی خاوەن باوەڕان لەسەر ڕێبازو عەقیدەی پارەوی (أهل السنە والجماعە) کە هەموو پێغەمبەرەکانمان (ﷺ) (مەعصوم) و بێگوناهو بێ تاوان بوونە لە گوناهی (کبائر) و (صغائر) واتا گوناهی گەورەو بچوکدا.

يُؤْمِنُواْ لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُۥ مِنۢ بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ سوورەتی البقرة: ٧٥.

خاوەنی تەفسیری گوڵشەن[١] .ئەڵێت پێغەمبەری خوداو (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەکانی زۆر هەوڵیان دەدا بۆ موسڵمان بوونی جوولەکەکان ، بەڵام لەم بارەیەوە ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارێ و دابەزی لە (شەئنیان) ئینجا لەم ئایەتەدا خودا دەفەرموێت (ئێوە ئومێدتان وایە چاوتان بڕیوەتە ئەو جووولەکانە موسڵمان بن؟ چۆن دەبێ چاوەڕوانی ئەوە بن، لە حالەتێکدا کە ئەمانە دڵیان ڕەقەو بەدوای ڕاستیدا ناگەڕێن، هەندێك لە حاخام و سەرانیان هەرچەندە تەوراتیان دەخوێندەوە یان دەیانبیست لێی تێنەدەگەیشتن کەچی دوایی ئەوەی بەڵگەبوو لەسەر پێغەمبەریەتی (محمد) بەدەست ئەنقەست دەیانگۆڕی بە ئارەزووی خۆیان دەستکاریان کرد).

(ئینجیل) یش وەك (تەورات) فەرموودەی خوایە هەروەها بێگومان، ئەویش وەك ئەو دەستکاری کراوە، هەروەك خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسی ئەکات و ئەفەرموێت ﴿ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ ﴾سورەتی المائدة: ١٥، واتە: ئەی خاوەن (کتێبینە) مەبەست جوولەکەکان و دیانەکانە ئەوا دوا پێغەمبەرم بە

---

(1) بڕوانە (تەفسیری گوڵشەن) لە نووسینی مامۆستا (نظام الدين عبدالحميد) بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٣١.

ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە بۆ ناردن گەلێك لەو شتانەی کە لە (تەورات و ئینیجیل) دا ئێوە گۆڕیوتانن وشاردوتانەوە باسیان دەکات بۆتان و ڕونیان دەکاتەوە کە ئەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەریەتیەکەی لەگەڵئەوەشدا چاوپۆشی دەکات لە زۆرێکی تر لەو فەرمانانەی کا شاردوتانەوەو باسیان ناکات چوونکە پێویستیان بە دەرخستن نییە ..)

## ( ئاگاداری )

جا هەروەها بێگومان[1] ئێستاکە حاڵی حازر چوار ئینجیل هەیە[2]. کە ئەوان بەراستو پەسەندی دائەنێن، کەچی ئەگەر تەماشای مێژووی نووسینەوەیان بکەی بۆت دەردەکەوێ کە ئەوانیش دوورن لە ڕاستیەوە، چوونکە ئەو چوار ئینجیلە لە(٧٠) واتا حەفتا ئینجیل هەڵبژێردراوە وە هەروەها نووسەرەکانیان دیارو ناسراون وە (مەسیحیەکان) خۆشیان دانیان پێ داناوەو دەڵێن تەنها ڕای پۆڵس پەسەندە نەوەك ئەوانی تر[3].

کەوابوو ئێستا تەنها قورئانی پیرۆزە بە پاکی ماوەتەوەو ئاڵ و گۆڕ نەکراوە واتا دەبێ دانیشتوانی سەر زەوی بە (عام) و خاس پرۆگرام و

---

(1) لەزۆربەی (کتابەکانی) عەقیدەو باوڕپێکراوەکانی ئیسلامدا ئەڵێ.

(2) ئەو چوار ئینیجلەی کە لەلای جوولەکەو دیانەکان باوەڕ پێکراوە ئەمانەن ١) ئینجیلی مەتتا ، ٢) ئینجیلی مەرقۆس، ٣) ئینجیلی لۆقا ، ٤) ئینجیلی یۆحەنا) بڕوانە (العهد الجدید ، الکتاب المقدس) لە نووسینی (قەشە یوسف پەری و کەریم زەند)، لاپەڕە (٢).

(3) بڕوانە پەرتوکی (خواپەرستی لە ئیسلامدا) لە نوسینی خوالێ خۆش بوو مامۆستا (احمد کاکە محمود) لاپەڕە ١٠٨.

(مەنهەج) و ڕێبازیان تەنها قورئـان بێـت و بـەس ئەمـەش ئـەمرو فـەرمانی خـودای مەزنــە ، ئـەمجار خـودای گــەورە (وەصــفی) قورئـان دەكـات و دەفـەرموێ ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ﴾ سـورەتی المائـدە: ١٥، واتە: لەلایەن خوداوە (نوور) بۆ ئێوە هـاتووە پێغەمبـەرێك كـە مەشـخەڵی نوورو ڕوناكیە ئەگەر ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) نەبوایە هیچ كەسـێك شـارەزای ئایینی (حەق) و ڕاست نەدەبوو ، خەڵكی لـە گـومڕایی و سەرلێـشێواوی دا دەمانـــەوە [1]. جــا هـــەروەها ئەفـــەرموێت ﴿وَكِتَـٰبٌ مُّبِينٌ﴾ سوورەتی المائدة: ١٥، واتە: بۆتان هاتووە كتێبێكی ڕێگا نیشاندەر و حەق و ئاشكراكەرو، ڕاست و درووست ، هەرچی ئـادەمیزاد پێویـستیان پـێ بـێ ئـەو ڕوونـی كردۆتـەوە، چـوونكە بەرنامـەی ژیانـەو كەتـەلۆكی بوونـەوەرە (قانون) و یاسـای خودایـە بـۆ بەنـدەكانی ﴿يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَـٰمِ﴾ سوورەتی المائـدة: ١٦، واتـە : پـەروەردگار بەهۆی ئەو قورئانەوە كەسانێك شارەزا دەكـا كـە بیانـەوێ لەسـەر ئـایینی حەق و ڕاست بن و شـوێنی پەنـدو ئامۆژگـاری یـەزدان بكـەون شـارەزایان دەكـا بۆڕێگـای ڕزگـاری و سـەرفرازی و پرۆگرامـی ڕاسـت و درووسـت .﴿وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ﴾ ســــــــوورەتی المائدة: ١٦، واتـە : لە گومڕایی و چارەڕەشی ڕزگاریان دەكاو لـە باوەشـی (كوفرو) بێدینی دەریان دەهێنێ دەیانخاتـە نـاو دونیـای (نـوورو ئیمـان و)

---

(١) بڕێ لە (موفەسرین) واتە: ڕاڤەكەران دەڵێن : مەبەست لە نوور ئایینی ئیسلامە .

کامەرانیـــــەوە ﴿ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾ ســـــوورەتی المائدة: ١٦، واتـە: شـارەزایان دەکـات بـۆ ڕاسـت تـرین ڕێگـا کـە ئـەویش ئایینی (حەق) و ڕاستی ئیسلامە[١].

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان ڕیوایەت کراوە (کافرەکان) بێ باوەڕەکان ووتیان ئەگـەر بمـان ویـستبایە وەك ئـەم قورئانـە بڵـێین دەمـان گـووت ئـەوجا لەوەلامیانداو ئەم ئایەتە پیرۆزە دابەزی ﴿ قُل لَّئِنِ ٱجۡتَمَعَتِ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ ﴾ سوورەتی الإسراء: ٨٨، واتە: بڵێ ئەی محەمـەد (ﷺ) ئەگـەر هـەموو ئینسان و (جنییە) ڕەوان بێژو بیر تیژو وریاو زیرەکەکان کۆببنەوە ﴿ عَلَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِمِثۡلِ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ ﴾ سـوورەتی الإسـراء: ٨٨، واتـە: بـۆ ئـەوەی وێنـــەی ئـــەم قورئانـــە بهێـــنن ﴿ لَا يَأۡتُونَ بِمِثۡلِهِۦ وَلَوۡ كَانَ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٖ ظَهِيرٗا ﴾ سوورەتی الإسراء:٨٨، واتە: هەرگیز ناتوانن وێنەی ئەم قورئانە بهێـنن ئەگەرچـی هەنـدێکیان پاڵـشت و هاوکـاری هەنـدێکیان بـن بـۆ ئەنجامدانی ئەو کارە).

هـەزار ڕەحمـەت لـە گـۆڕی خـواڵێ خـۆش بـوو مامۆسـتا (عبـدالرحیم مەولەوی بێت) کە ئەفەرموێت :-

---

(1) بڕوانە : تەفسیری ڕەوان بۆ تێگەیشتنی قورئان لە نووسینی (مەلا مەحمودی گەلاڵەیی) بەرگی ٦ ، لاپەڕە ٣٥٣.

بەیەقین لە جمع باقی کتێبان وەجهی ئیمتیاز بۆ قورئان بزان
ناسیخە بۆ گشت تێیدایە یەقین عیلمی ئەوەلین عیلمی ئاخرین
گشت شەوی قەدر مانگی رەمەزان لە (لەوح) هاتۆتە ئەوەڵ ئاسمان
لەودوا بە وەقفی مەصلەحەت و حاڵ نازل بوو وەخت بە بیست و سێ ساڵ
صاحیبی ئایات موفەصصەلاتە بوزرگترینی گشت موعجیزاتە
بەبێ تەعریف و زیادەو نوقصان بێ سەهوو غەفڵەت تەغیرو نیسیان
تەمام ئینس و جن مەلەك بەدەستور ئیجماع کەن میسلی ناهێنە زهور
هەموو فصەحاو بولغای عەرەب عەجەب صاحیب فەصاحەو بەلاغەی
وەك ئایەتێکیان نەدا ئەو بیروون لە موعارەزەی هەموو عاجیز بوون[1].

(أللهم إجعل القرآن ربيع قلوبنا وَنورَ أبصارِنا وَشِفاءَ صدورِنا وَ أبدانِنا وأغفر لِوالدينا وأمواتنا وأموات المؤمنين والمؤمنات ببركة القرآن ومن المُهتَدين بهدي القرآن آمين يا رَبَّ العالمين).

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (العقيدة المرضية) دانراوی (سید عبدالرحیم مەولەوی) لاپەڕە ۸۷.

# ئامۆژگاری بیست و پێنجەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ئایەتەلكورسی ئەكات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ، الحمَدُ الله خالق السّماوات وَالأرض وما بينَهُما أجمعين وَ نَشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وَنَشهَدُ أنَ سَيدنا وَ مَولانا مُحمداً عَبدَهُ وَرَسولَهُ أشرف الأنبياء وَالمُرسَلين ، وَالصَلاةُ والسّلام عَليه وَعَلى آله الطَيبين وَصَحبهِ الطّاهرينَ وأتباعه إلى يَوْم الدّين ، أما بَعد).واته: لەدوای هەندێ (إخوة المؤمنين إتقوا الله في جَميعِ أوقاتَكم في السرّ والعلن) برایانی ئیماندارانی بەڕێزم ، تەقوای خوای تەبارەك و تەعالاّ بكەن و لەهەموو كات و وەختێك داو بەنهێنی و بە ئاشكرا و چوونكە خوای گەورە ئاگای لەهەمووشتێك هەیەو ، جا هەروەها بێگومان پێغەمبەری خۆشەویست و ئازیزمان (ﷺ) لە حەدیسێكدا فەرموویەتی (باشترین هەدیەو دیاری بۆ برای موسڵمانت ئەوەیە (فێری واجبێكی ئایینی یان سونەتێكی دینی یان مەسئەلەیێكی (شەرعی) یان ئامۆژگاریەكی كۆمەلآیەتی یان دوعاو پاڕانەوەیەكی بكەیت)، جا با لەو ووتارو ئامۆژگاریيماندا بچینە خزمەت ئەم ئایەتە بەرزو پیرۆزە لە جزمی سێ (سورەتی البقره) هەروەها بابزانین زانایانی ئیسلام و هەموو ئیمانداران بە گشتی، ئەم ئایەتە پیرۆزەیان كردۆتە وێردی سەر زمانیان و بەتایبەتی لەدوای نوێژەكانیان دەی خوێنن هەروەها لەكاتی تەنگ و چەڵەمەداو لەكاتی بەلآو (موصیبەتدا) و هەروەها بۆ بەرگری لەترس و[1] نا ڕەحەتی و

---

(1) (ئەگەر لە بێ حیفزی ماڵ و سامانت ئەترسی ، براگیان بكە بە وێردت ئایەتولكورسی).

(موحافەزەی) نەفس و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامان ، هەروەها لەبۆ شەڕی نەفس و شەیتان وە دەی خوێنن و پشتی پێ دەبەستن و ئینجا کە دەی خوێنن دڵیان پێ ئاسوودە دەبێ ئارام ئەگرێ، جا هەروەها ئەم چەند ئایەتە بەرزو پیرۆزە مەشهورە بە (ئایەتەلکورسی) ئەوجا هەروەها بابچینە سەر باسی (مەعنای) واتە تەفسیرو ڕاڤەی (ئایەتەلکورسی) و ئینجا ئەوکاتە کە (مەعناکەمان) زانی بۆمان دەردەکەوێ کە ئایەتەلکورسی لەبەرچی ئەوەندە فەزڵی گەورەیە؟ ئەوجا خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾[1] سوورەتی البقرة: ٢٥٥، ئەو زاتە بەرزو بڵندەو پەروەردگارە بەدیهێنەرە خودایەکە ناوی (الله) یە هیچ کەسی تر نیە شیاوی پەرستن و بەندایەتی بۆ کردن بێ لە غەیری ئەو زاتە، چوونکە زاتەکە ناوی (الله) یە ئەمە ناوی تایبەتە بۆ خوا کەس ئەو ناوەی نیە و کەسیش ناتوانێ ئەو ناوە لەخۆی بنێ جگە لەو ناوەش خوا زۆر ناوی تری هەیە (هەندێ زانایان ئەفەرموون خودا هەزارو یەك ناوی هەیە و (الله) یان

---

(1) ٱلۡحَيُّ: واتە زیندوەێکی بەردەوامە ، قەت نەمانی بۆنیە (ٱلۡقَيُّومُ) واتە بەجێ بەجێ کردنی کاری خەڵکی هەڵدەستێ (سِنَةٌ) واتە نە خەوە کوتکە ئەیگرێ نە بۆرژان (مابَيْنَ أيديهم) واتە : ئەوەی لەبەردەستیانە (وما خلفهم) ئەوەی لەمەودوا ئەیکەن و ئەکرێت ، (كُرسِيُّهُ) واتە کۆکردنەوە ، وەك دەڵێ کوڕاسە کە چەند نامەو کاغەزی لەناو کۆنەکرێتەوە یان بناغەیەکە دیواری لەسەر درووست ئەکرێ یان بە مەعنای زانیاری (علم) دێت یان مەعنای دەسەڵات و دەست ڕۆیشتن و سەرکەوتن و دەست بەسەرداگرتن دێت (یؤده) لەلای گران نیەو ماندووی ناکات (العَلي) پایە بەرز ، بڕوانە تەفسیری قورئانی پیرۆز بە زوبانی کوردان) لە نووسینی (عەبدولعەزیز عەلائەدین مستەفا) ، بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٣٥٥ ، بەدەستکاری یەوە .

له هەموویان گەورەترە ، بەلاّم خوا ویستویەتی هەر ئەو ناوانە بزانین کە لە قورئان دیاری کراوە ، ئەوانی تر کە بەزۆری ڕەوشتن بۆ خوا، جا بێگومان لە وەتەی (لاإله) لێەردا نەبوون و هەبوون هەیە (نفی و اثبات) کە دەڵێ (لا إله) واتە بێگومان هیچ خوایەك نیە (إلا هو) لەو بەولاوە هیچ خوای تر نیە (الحَیّ) واتە زیندوو (الحیاة) بە پێچەوانەی فەوتانە (العیش) واتە ژیان بە پێچەوانەی مردنە ، ئەوجا خوا زیندووە، واتا بەردەوامە لەو دەسەلاّتەی هەیەتی بۆ بەجێ هێنانی فەرمانەکانی ئەو زیندویەتیەش قەت لێی دانابڕێ (القیوم) ئەمەش پێی دەڵێن (صفه المبالغه) واتا بەردەوامە لە سەرپەرشتی کارەکانی بە مانایەکی تر (قەییومە) تەبیرو نەخشەی بوونەوەر دەکێشێ و (مەخلوقاتی)خۆی پارێزگاری دەکا ﴿ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾واتە خوا نە ئەبۆرژێ و خەویشی بەسەردانایەت و کار وای لێ ناکات وەك ئینسان پێ ماندوو ببێ پێویستی بە خەو نییە مەبەستیش ئەوەیە کە خوا هیچ دەم و ساتێك بێ ئاگاو غافڵ نابێ ﴿ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ﴾، واتە: هەرچی هەبێ لە ئاسمانەکان و لەزەویدا هەر موڵکی ئەوەو گشتی هی خوایەو خوا درووستی کردوونە .

﴿ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ﴾، واتە: کێ بێت لە ڕۆژی دواییدا بتوانێ شەفاعەت بکات لەلای ئەو هەتا ئەو خۆی ئیزن نەدات ؟ دیارە کە هەتا ئەو خۆی مۆڵەت نەدات کەس ناتوانێ تکا بۆ کەس بکات ، چوونکە (بت پەرستەکان) ئەیان گووت ئێمە بۆیە ئەم بتانە ئەپەرستین تاوەکو لەلای خوا بۆمان بپاڕێتەوەو تکامان بۆ بکەن ، خواش فەرمووی ،

تکاکردن و پاڕانەوەش بەفەرمانی خوایەو کەس هیچی لەدەست نایەت تەنها خوا نەبێ ﴿يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ ﴾، واتە: ئەوەی لەبەر دەستیانایەو دیارە ئەوەیش کە لەپێش سەریانەوە نادیارە ، ئەو پێی ئاگایە ، واتە: کاروباری دونیاو قیامەت تەنها هەر ئەو ئەیزانێ ، ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ﴾، واتە: هیچ کەسیش ناتوانێ بە پلەی زانینی خوا بگا مەگەر خوا خۆی بیەوێ لەسەر زمانی پێغەمبەران شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە وە ئاگاداریان بکا ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾ ، بەڕاستی تەختی عەزەمەت و سەڵتەنەت و قودرەت و گەورەیی خوا هەموو ئەرزو ئاسمانی داگرتووە، لەژێر قەبزەی ئیرادەتی ئەو دایە، ئەگەر ئارەزوو بکا بە چرکە سەعاتێك هەمووی دەباتە فەزای نەبوون، هەندێ لە(موفەسیرەکان) ئەفەرموون: زانیاری خوا لە ئاسمانەکان وە زەوی گەلێ فراوانترە ، واتە: گەلێ زۆرە، هەروەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی (ئاسمانەکان) زەوی (كَحَلْقَةٍ فِي فلاة) واتە، وەك ئەنگوستیلەیە کە وان لە چاو زانیاری خوا) چوونکە زانیاری خوا بەهیچ شتێك پێوانە ناکرێ، زانیاری مرۆڤیش ناگاتە (نوکتەیەك) واتە خاڵێك لە چاو زانیاری خوا ... لەوپەڕی زانیاری مرۆڤ [1]،﴿وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَا ﴾،

---

(1) قوله تعالى ﴿وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ ﴾، قال ابن عباس (رضي الله عنهما) كُرۡسِيُّهُ علمهُ) أخرجه الطبري في جامع البيان (بەرگی /٣، لاپەڕە/١٧) بڕوانە: (التفسير الكبير – تفسير القرآن العظيم ، للإمام الطبراني ، بەرگی ١ ، لاپەڕە ٤٦٢.

واتە: ڕاگرتن و پاراستنی ئاسمانەکان و زەوی بۆ خوا گران و سەخت نییە ﴿ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴾ سووڕەتی البقرة: ٢٥٥ ، واتە: هەر ئەو بڵندو پایەبەرزو گەورەیە لە دەسەڵات و تواناداا هاوشانی نیە .

## ( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )

١) ئیمامی (قرطبي) لە تەفسیرەکەیداو [1] لە ئیمامی بوخاری و موسلمدا ئەگێڕێتەوە هەروەکو ئەفەرموێت : عَن أبـي بـن كعب قـالَ : قـالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يا أبا المنذر أتـدري أي آيـة مـن كتـاب الله مَعَكَ أعظم ؟ قالَ قُلتُ الله ورَسولَهُ أعلَم قالَ يا أبا منـذر أتـدري أي آيـة مـن كتاب الله مَعَكَ أعظم ؟ قالَ قلت ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾فـضَرَبَ في صدري وَقالَ لَيُهنِكَ (العِلمُ يا أبا المُنذر) متفق عليه ، واته : (أبی) کوڕی کەعب (خوا لێـی ڕازی بێـت) ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) پێـی فـەرمووم، ئـەی ئوبـەی کامـە ئایـەت لـە قورئانـا لـەلای تۆیـە کـە گـەورەتر بـێ لـە بـاقی ئایەتەکان؟ ئـەویش عـەرزی کـرد ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ جـا هـەروەها حـەزرەت (ﷺ) دەسـتی موبـارەکی بـە سـینگماداداو فـەرمووی (ئەم زانیاریەو زانستەت لێ پـیرۆز بێـت) وە هـەروەها پێـشەوا (ترمـزیش) ڕیوایەتی کردووە لە (ئوبەی کوڕی کەعبـەوە) خـوا لێـی ڕازی بێـت ئـەڵێ: حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (ما أنزَلَ الله في التوراة وَلاَ في الأنجيـل مثـل أُمِّ

---

(1)بڕوانە جامع أحكام القرآن ، ناودار بە تەفسیری (قورطبي) دانراوی (محمد بن احمد الأنصاري) بەرگی ٢، لاپەڕە ٣٤٣..

القرآن وهي السبع المثاني، وهي مقسومة بيني وبين عبدي ولِعَبدي ما سأل (أي وقالَ الله تعالى هيَ مقسومة).

٢) پیرۆزتـرین و گـەورەترین ئایەتـەکانی قورئـان (ئایەتەلکورسـیە) چوونکە (١٧) جار ناوی پیرۆزی خوای گەورەی تێدا هاتووە لە نێوان ناوو ڕاناودا ، (ظاهر و مضمر) دا پـەنجاو شـەش پەیژەیـە ، دە (١٠) ڕستـەیە ، خۆ هەموو سورەتەکەش هەر باسی (ربوبیەت) و (ئلوهیـەت) و (ئـەسما) و (سیفات) ی خوا ئەکاو، ئەوجا پاش نوێـژە فـەرزەکان و پـێش خـەو لـەناو مالاّ بۆ ڕاونانی شـەیاتینەکان خوێنـدنی سوونەتەو زۆر گرنگـە ، هـەروەها ئیمام (ئەحمەد) یش ئەم فەرموودەیە لـە فـەزڵی ئـەودا ئـەهێنیّ وەك لـەم حەدیسەدا هاتووە ئەفەرموێت (إن آية الكرسي تَعْدَلُ رُبعَ القرآن وإن الصّمَدَ تَعْدَلُ ثلث القُرآنِ) واتە فەزڵ و گەورەیی ئایەتەلکورسی بەتـەنها خـۆی لـە چواریەکی قورئان دەدات، بـەلاّم ئـەم سـورەتانەی (زەلزەلـەو ، کـافرون ، لەسەر) گەورەیی و خێری خوێندنی هەریەکـەیان هەروایـە بـەلاّم خوێنـدنی سوورەتی (سەمەد/ واتە ئیخلاص) خێری سیّ یەکی قورئانـە وە هـەروەها پێشەوا (نەسائی) یش ئەم فەرموودەیە باس ئەکات.

پێغەمبەر (ﷺ) مَنْ قَرأ دُبَرَ كُل صَلاةٍ مكتوبةٍ آية الكرسيّ لَم يَمْنَعْهُ مِـنْ دُخولِ الجّنـة إلاّ أنْ تمـوت) ، واتـە : هـەر کەسـێك پـاش نوێـژە فـەرزەکان ئایەتەلکورسی بخوێنیّ هەر کە مرد دەچێتە بەهەشتەوە .

٣) وَعَن أبي هريرة (رضي الله عنه) قالَ وَكّلَني رسول الله (صلى الله عليه وسلم) بحفظ زكاةِ رمضانَ فأتاني آتٍ فَجَعَل يَحْثُو من الطّعامِ فأخذتـهُ فَقُلـتُ لأرفَعَنكَ إلى رسول الله (ﷺ) قالَ إني مُحتاج وَعَلَيّ دَيـنٌ وَعيـالُ ولـي حاجـة

شديدةً فَخَليت عَنهُ فأصْبَحْتُ فقال النبي (صلى الله عليه وسلم) يا أبا هريرة مَا فَعَلَ أسيُرك البَارحَةَ ؟ قالَ قُلتُ يا رَسَولَ الله شَكَا حاجةً شديدة وَعيالاً فَرَحمتهُ فَخَلَيْتُ سَبيلَهُ قال أما إنّه قَدْ كذبَكَ وَسَيَعود فَعَرفْتُ إنّهُ سَيُعود لقَول رسول الله (ﷺ) واته: ئەبو هورەیره (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) کردمی بە (وەکیلی) ئاگاداری زەکاتی سەر فیترەی ڕەمەزان ئینجا کە تەماشام کرد شەوێ یەکێك هات ، مست بە مست دەستی کرد بە دزینی سەرفترەکە ئەوجا منیش چووم لەناکاو گرتم و ئینجا ووتم هەر ئێستا دەتبەم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئابڕوت ئەبەم ، ئەوجا (ئەبو هورەیره) ئەڵێ زۆر پاڕایەوە لەبەرم و ووتی زۆر دەست کورتم و قەرزارم و ماڵ و منداڵم زۆره ئەوجاره (عەفووم) بکە بەڕەڵڵام بکە منیش بەزەییم پێدا هاتەوەو بەرم دا، ئینجا بۆ نوێـژی بەیانی چوومە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) نوێژمان بە (جەماعەت) کردو، لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی (ئەبا هوڕەیره) ئەسیرەکەی شەوێت کە گرت چی لێهات ؟ ئەڵێ زۆرم لەلا (عەجیب) بوو پێش ئەوەی بۆی بگێڕمەوە ئەو زانیبووی ئینجا عەرزم کرد قوربان زۆر پاڕایەوە ، ووتی زۆر هەژارو دەست کورتم قەرزارم و ئەوجا منیش بەڕەڵام کرد ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبا (هورەیرە) بزانە درۆی لەگەڵ کردووی ئەمە دووبارە دێتەوە بۆ دزی (ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ زانیم کە دووبارە دێتەوە ، چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی دێتەوە، دەڵێ کە شەو داهاتەوە نەنووستم و (حەرەسیم) لێ گرت و ، کاتێ کە زانیم کابرا ووردە ووردە هاتەوەو دەستی کردەوە بە مستە مستە سەرفترە دزینەکە دووبارە

ئەوجارەش پەلامارمداو گرتم ، ئەم جارەش زۆر لێم پاڕایەوە ووتی وازم لێ بێنە زۆر (موعتاجم) ماڵ و عەیاڵم زۆرە ڕەحمم پێ بکە ئەوجا تازە جارێکی تر نایەمەوە، ئەوجا ئەبو هورەیرە دیسان ئەفەرموێ ڕەحمم پێکردو بەرمدا ، دیسان بەیانی چوومەوە خزمەت حەزرەت (ﷺ) فەرمووی ئەی (ئەبو هورەیرە) ئەرێ ئەسیرەکەت چی لێ هات ؟ عەرزم کرد ئەی (ڕەسولی) خوا زۆر پاڕایەوە ، زگم پێی سووتاو بەڕەڵلام کرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی (ئەبو هورەیرە) ئاگاداربە دووبارە دێتەوە (إنّهُ سَيَعُودُ فَرَصدْتُهُ فَجَاء يَحْثُوا الطَّعَامَ و(ذكر الحديث) إلى أنْ قَالَ فأخذته (يعني) في الثالثة، فَقلْتُ لأرفعَنَكَ إلى رسول الله (صلى الله عليه وسلم) وهذا آخر ثلاث مرات تَزعَمُ أنكَ لا تَعودُ ثُمَ تَعودُ ، قالَ دَعني أُعَلمَكَ كلمات يَنْفُعكَ الله بِهَا قُلتُ ما هُنّ قَالَ إذا آويْتَ إلى فِراشك فأقْرأ آية الكُرسِّي ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾ حتّى تَخْتم الآية فإنَكَ لن يَزالَ عليْكَ من الله حَافظٌ ولاَ يَقربُكَ شَيْطانٌ حتى تُصبح فَخلْيتُ سَبيلَهُ ، فَأصْبَحْتُ فَقالَ لي رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) ما فَعَلَ اسيرك[1]، البارحة ؟ قُلتُ يا رسول الله (صلى الله عليه وسلم) زَعَم أنه يُعَلمني كلمات ينفعني الله بِهَا فَخلّيتُ سَبيلهُ ، قالَ ما هيَ ؟ قُلتُ : قالَ لي إذا أويتَ إلى فراشك فأقرأ آية الكُرسي مِنْ أولها حَتّى تَخْتم الآية ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾وقال لن يزال عَلَيك مِنَ الله حافظ ولا يقربك شيطان حتى تُصبح وكأنوا أحرص شيء على الخير فقال

---

(1) الذّي قَبضت عليهِ وحَبَسْتهُ.

النبي (صلى الله عليه وسلم) أما إنّهُ قَد صَدَقَك وَهُوَ كذوبٌ[1]، تعلَمُ من تخاطب مُنذُ ثلاثة أيام يا أبا هُريرة ؟ قالَ: لا ، قالَ: الشيطانُ[2] رواه البخاري والترمذي وإبن خزيمه وغيرهم ، واته ئەڵێ شەوی دوایی بۆی دانیشتم تەماشام کرد کابرا بە دزی بۆ دزی هاتەوە ، ئەفەرموێ ئەوجارە زۆر بە سەختی گرتم و گووتم ئەوە سێ شەوە لەسەر یەك دێی بۆ دزی بەزەییم پێی دا دێتەوە بەرت نادەم ، بەو شەرتە جارێکی تر دزی نەکەی و نەگەڕێیتەوە ، کەچی درۆ دەکەی و هەر دێیتەوە ئەوجارە هەر ئەت بەم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ئەڵێ ووتی ئەی ئەبو هورەیرە ، بەرمدە ئەوجارە چەند (کەلیمەیەکت) واتە ووتەیەکت فێردەکەم کە (سەواب) و پاداشتی لە دوارۆژدا زۆربێ لای خواوەندی گەورە ئەڵێ ووتم باشە ئەو (کەلیمەو) ووتانە چین ؟ لەوەلامدا ووتی : ئەی ئەبو هورەیرە شەو کە چویتە سەر جێگا بۆ نووستن (ئایەتەلکورسی بخوێنە) ئەو شەوە تا بەیانی خوداوەندی گەورە بەکەرەمی خۆی حافزێکت بۆ دەنێرێ تا ڕۆژ دەبێتەوە هیچ (شەیاتینیەك) ناتوانێ توخنت بکەوێ یا لێت نزیك بێتەوە تا زەرەرت پێ بگەیەنێت ، ئەبو هورەیرە ئەڵێ منیش بەرمدا ئەوجا کە ڕۆژ بووەوە چوومە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ئەی ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەسیرەکەی شەوت چی لێ هات ؟ عەرزم کرد قوربان چەند (کەلیمەیەکی) فێری من کرد زۆر بە سوود بوو ئینجا منیش بەرەڵام کرد

---

(1) كذوب : كثير الأفك والبهتان والإثم ، بڕوانە فتح الجديد، لاپەڕە ٤١٩.

(2) بڕوانە : پەرتوکی (الترغيب والترهيب) من الحديث الشريف دانراوی (الحافظ زكي الدين عبدالعظيم) بەرگی ١ ، لاپەڕە ٤٢٠.

چوونکه فێری ئەو ووتانەی کردم کە لای خودای گەورە سەوابیان زۆرە بۆ هەر کەسێ بیانخوێنێ و یەکجار زۆرە فێرە منیش لەسەر ئەوە بەرمدا ، حەزرەت (ﷺ) فەرمووی ئەی ئەبو هورەیرە ، ئەو (کەلیمانانە) کامانەن ؟ ووتم : قوربان کابرا گوتی هەر کاتێ چوویتە سەر جێگا (ئایەتەلکورسی بخوێنە) خوای گەورە (حافیزێکت بۆ دەنێرێ ئەو شەوە تا بەیانی هیچ شەیاتینێك ناتوانێ لێت نزیکەوەبێ ، ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (یا ئەبا هورەیرە هەرچەندە ئەو کابرا (ئەسیرەت) زۆر درۆزنە بەلآم لەوەدا ڕاستی کردووە ، فەرمووی ئەی (ئەبو هورەیرە) دەزانی سێ شەوە لەگەلّ کێدا قسەت کردووە؟ ووتم قوربان نازانم ، فەرمووی ئەوە یەکێك بووە لە (شەیاتینی) فێلّبازو درۆزن و بوختان چی).

٤) قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) لِكلِّ شيءٍ سَنام و أنّ سَنام القرآن سُورةَ البقرةَ وفيها آية الكرسي) رواه الترمذي، واتە : هەموو شتێ لووتکەی هەیە لووتکەی قورئانیش سوورەتی (البقرە) یە ئایەتێکیشی تێدایە کە گەورەترین ئایەتەکانی قورئانە ئەویش (آية الكُرس) یە .

٥) قالَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) مَنْ قَرأ حم المؤْمن إلى إليه المصيُر، وآية الكرسي حين يُصبحُ حُفظَ بِهَما حتى يُمسى وَمَنْ قَرأهُما حين يُمْسي حُفِظَ بِهِما حَتى يُصْبَح) رواه الترمذي ، واتە هەرکەسێك سەر لەبەیانی سورەتی (المؤمن) لە سەرەتاوە تا (اليه المصير) بخوێنێ لەگەلّ (آية الكرسى) دا ئەوە ئەو ڕۆژە هەتاکوو ئێوارە دەیپارێزێت .

## (دوو تێبینی گرنگ)

یەکەم :- (ڕوایەت کراوە لە شُەعبی یەوە[1] ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەگێڕنەوە کە پێشەوا (عومەری کوڕی خەتاب) خوا لێی ڕازی بێت)، لە سەفەرێکدا بە کاروانێك گەیشت کە (عبدالله) ی کوڕی مەسعودی تێدابوو ئینجا ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت)، فەرمانی بە پیاوێك کرد بانگیان بکات ئایە لە کوێ هاتوون ؟ عبدالله ی کوڕی مەسعود وەلامی دایەوەو فەرمووی لە ڕێگایەکی دوور (فجّ عمیق) ئەوجا (ئیمامی عومەر) فەرمووی ئەدی بۆ کێ دەچن، (عبدالله) گوتی بەرەو ماڵە پیرۆزەکەی خوا (البیتُ العتیق) واتە (ماڵی کۆن و قەدیم زەمان) ئیمامی عومەر فەرمووی: مادام بەرەو (بیت العتیق) دەچن پێویستیتان بە زانایەکی شارەزا هەیە کە لە گەڵتان دابێ و ئەوانیش وتیان بەڵێ لەگەڵمان دا هەیە ، ئیمامی عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی (ئایە چ ئایەتێك لە قورئاندا زۆر مەزنە ؟ (عبدالله) ی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) لە وەلامدا فەرمووی ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴾هتد... حەزرەتی عومەر فەرمووی ئەدی بەهێزترین ئایەت کامەیە ؟ عبدالله لە وەلامدا فەرمووی :

﴿ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٩٠ ﴾

---

(1) شەعبی : پیاوێکی (تابیعی) و خواناس بووە مرۆڤێکی زۆر زاناو (عالم) بووە و فەقێی ئیمام ئەبو حەنیفە بووە ، خەڵکی هەمەدان بووە (وە دۆستی عبدالملك کوڕی مەروان بوو) ، وە زۆر شارەزایی هەبووە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ).

سوورەتی النحل: ٩٠ ، ئیمامی عومەر فەرمووی : (دقیق ترین و جامیع ترین ئایەت کامەیە؟ عبدالله فەرمووی: ﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ (٨) ﴾ سوورەتی الزلزلة: ٧ – ٨ ئەوجا ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) فەرمووی، ئەدی کامە ئایەت ترسێنەرترین ئایەتە؟ ئینجا (عبدالله) لە وەلامدا فەرمووی ، ئەم ئایەتەیە ﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (١٢٣) ﴾ سوورەتی النساء: ١٢٣، هەندێ لە (موفەسیرەکان) دەگێڕنەوە کە چەند کەسێك لە موسڵمانەکان و دیانەکان و جولەکەکان) لە شوێنێکدا گەیشتوون بە یەکتری وە هەر کامەیان خۆی بە باشترو بە پەسەندتر لەوانەی دیکە ناساندووە ، جا لەم بارەوە خودا دەفەرموێت (چاکی و پەسەندی بە ئاوات و خواستن و ئیدیعاو ووتن نابێت) بەڵکو بە کردەوەی چاك و ڕووکردنە خودایە جا هەر کەسێك خراپیەك بکات بەپێی ئەو خراپەی سزا دەدرێت وە جگە لە خودا هیچ یارمەتیدەرو پشتیوانێکی دەست ناکەوێت کە یارمەتی بدات و پشتگیری لێ بکات).

ئەوجا ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی: ئەی بە ئومێد، هیواترین ئایەت کامەیە ؟ عبدالله ی کوڕی مەسعود (ڕەزای خوای لێبێت) فەرمووی : ﴿ ۞ قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (٥٣) ﴾ سوورەتی الزمر: ٥٣، ئەوجا ئیمامی عومەر فەرمووی : ئەوە ئێوە (عبدالله ی کوڕی

مەسعود تـان) لەگـەڵ دایـە بەڕاسـتی ئێـوە سـەرکەوتوون (خـودا ئـەجرو پاداشتان بداتەوە).

دووەم:- جـا هـەروەها ئـەی خـاوەن بـاوەڕان ، حـەزرەتی پێغەمبـەر (ﷺ) لە حەدیسێکدا و سەبارەت بە گەورەیی ئایەتەلکورسی ئەفەرموێت: چونکە دەیلەمی لە (مسند الفردوس)[1] دا لە ئیمامی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە ، نەقلی لێ دەکاو ئـەڵێ : (سَمِعْتُ رسـولَ اللهِ (صـلى الله عليه وسلم) يَقول يـا علـي) واتـە بیـستم لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) کـەوا فەرمویەتی ئەی عەلی بزانە (سَيِّدُ البشرِ آدم (عليه الـسلام) واتـە گـەورەی هەموو بەشـەران حـەزرەتی ئادەمـە(ﷺ) ، هـەروەها (سَيِّد العـرب مُحمَّد (صلى الله عليه وسلم) ولا فَخْرَ) واتە : گەورەی هەموو عـەرەبان محەمـەدە (ﷺ) (فەخر) ناکەم بەبێ شانازی و (سيِّد الفُـرس سَلمان) واتـە گـەورەی فارسەکان سەلمانی فارسیە (خوا لێـی ڕازی بێـت) و سـيِّد الحَبَـشَةِ (بِـلالٌ) واتـە گـەورەی حەبەشـیەکان بـیلالی حەبەشیە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) وە هەروەها فەرموویەتی (سَيِّد الجِبال الطورُ)[2] واتـە گـەورەی کێـوان کێـوی تـوورەو وە هـەروەها ئەفـەرموێت (سَـيِّد الـشَّجَرِ الـسِّدْرُ) واتـا گـەورەی درەختان درەختی سیدره[3](سَـيِّدُ الـشهُور الأشْـهر الحَـرام) واتـە گـەورەی

---

(1) وە هەروەها ئیمامی (سیوطي) یش لە (الجامع الصغير) هێناویەتی ، بڕوانە پەرتووکی (فيض القدير شرح جامع الصغير) دانراوی (عبدالرؤوف المناوي) ج٤، لاپەڕە ١٢٣.

(2) چوونکە کێوی (طور) خوا سوێندی پێ خواردووە ، ئەفەرموێ: ﴿وَالطُّورِ﴾ سوێند بە کێوی (توری سینا) کە خوا لەگەڵ موسا ووتو وێژی کردووە .

(3) ئەگەر مەبەست ئەو دارە بێ (سدره المنتهى) ئەمە زۆر پیرۆزەو ، بەڵام (سیدره) بە درەختێکیش دەڵێن کە بۆنی زۆر خۆشە .

هەموو مانگەکان سێ مانگەکەی کاتی حەجەو موحەرەم (سَيِّد الأيام يَوْمَ الجُمعَةِ) واتـا گـەورەی هـەموو ڕۆژان ڕۆژی جومعەیـە واتـا (هەینییـە) وە هەروەها فەرموویەتی: (سيِّد الكلام القُرآن) واتـە گـەورەی کـەلاّم و قـسە (قورئانـە). وە (سَـيِّد القـرآنِ البَقـرة) واتـە گـەورەی قورئـانیش سـورەتی (بەقەرەیـە) چـوونکە لـە هـەموو سـورەتەکان درێـژترەو وە هـەروەها فەرموویەتی (سَيّدُ البَقَرَةِ آيَةُ الكُرسـيِّ) واتـا گـەورەی سـورەتی بەقـەرەش ئایەتەلکورسـیە) ، ئینجـا پێغەمبـەر (ﷺ) فـەرمووی (يـاعلي إن فيهـا لَخَمسِينَ كَلِمَةٍ فِي كُلِ كَلِمَةٍ خَمْسُونَ بَرِكَةً)رواه الديلمي واتـا ئـەی عـەلی (آيـة الكُرْسي) پەنجا کەلیمەیەو، واتا ووتەیەو هەر (کەلیمەی) پەنجا بەرەکـەتی تێدایـە)، هـەروەها خوێنـدەورانی ئـازیزم ئەوەنـدە (دەلیـل) و بەڵگانـەی پێشوو بەسەو (کافیە) بۆ ئینسانی ژێر، هەزار رەحمەت ڕەحمەت لە گۆڕی مامۆستای نامی خوالێ خۆش بوو ، کە لـە پـەرتووکی ئیقبـال نامەکەیـدا[1] ئەفەرموێت یادی بەخێر.

| | |
|---|---|
| بابی پانزەهەم بە عەونی غەفور | ئەکەم بەیانی ئەدیمەی مەئسوور |
| (قُل الحَمدُ) ئاخر سورەتی (سُبْحاَنه) | دەوایە بۆ غەم ڕاستی بیزانە |
| هەم (لا إله الا الله) ی جەلیل | حسبي الله وَنِعمَ الوكيل |
| دەوایە بۆ غەم مەبە موشتبیە | اللهُ ربي لا أُشْرِكُ به |
| شيئاً تا سێ بەلاّم هەموو جار | کەلیمەی (الله) باش بکەی تکرار |
| (آية الكرسي) و (آمَنَ الرّسول) | بخوێنە دوعای پێ ئەبێ مەقبول |

---

(1) بڕوانە پەرتووکی (سەرچاوەی ئایین – ئیقبال نامەی تێدایە) دانراوی (مامۆستا مەلا عبدالكريم مدرس) لاپەڕە ٢٩٦.

| | |
|---|---|
| یاحيُّ یا قیوم له وەختی سوجده | زۆر زۆر موفیده پێت ئەدەم موژده |
| (یا ذا الجلال والإکرام) ی زۆر | بخوێنه نەفعی دیاره وەك خۆر |
| بۆ رەحمەت باری شێخی نەوەوی | تەعلیمی فەرموو دەوای مەعنەوی |
| به (بسم الله الرحمن الرحیم) | (لاحَولَ وَلا) هەتا (العظیم) |
| ئاخریان تەنیا مایەی شیفایه | بۆ نەوەدو نۆ عیللەت دەوایه |
| شەخصی داوای له (مەولاّ) عەلی | بۆ جەبری گوناه دوعایه جەلی |
| یەکی دوعای باغ یەکی بۆ منالّ | یەکی لەبۆ ئاو یەکی لەبۆ مالّ |
| بۆ هەمووی فەرمووی ویردی ئیستیغفار | بەشەرطی دەوام لەگەلّ ئیعتیبار |
| به دەلیل فەرمووی له سورەتی نوح | ئایەتی (فَقُلتُ استغفروا) ی مەشروح |
| بۆ دەفعی شەڕی چاوی ئینسانی | زیانی دابی له موسلّمانی |
| بەنەقلی (تحفة) بابی (جنایەت) | دوعای (ماشاءالله) ئەکا کفایەت |
| بیخوێنه لەسەر موبتەلا به چاو | زوو شیفای بۆدێ شیفایه تەواو |
| بۆ دەفعی شەیتان (أعوذ بالله) | بۆ فەتح و نەصرەت (نَصرٌ مِن الله) |
| ئەگەر له جنی و شەیتان ئەترسی | بکه به وێردت (آیة الکرسي) |

## ( پاشکۆ )

جا هەروەها بێگومان له کۆتاییدا و لەباسی فەزلّ و گەورەیی (ئایەتەلکورسیدا) پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەفەرموێت: (هەر کەسێك که چووه سەر جێگای خۆی بۆ خەوتن با ئایەتەلکورسی به دلّێکی پاك و به نیەتێکی ساف پڕ ئیمانەوه (ئایەتەلّکورسی) بخوێنێ ئەو شەوه خۆی و دراوسێ و جیرانیشی له بەلاّو موسیبەت و شەڕی شەیتان مەحفوز دەبن ،

بەهۆی گەورەیی و بەرەکەتی ئایەتەلکورسیەوە) خوایە داواتان لێ دەکەین عەفوومان بکەی و دوورمان بخەیتەوە لە شەڕی (نەفس) و (شەیتان) بە بەرەکەتی (ئایەتەلکورسی) و سی جزمەی قورئان ، ئامین .

(اللّهم وَفقنا لقراءة القرآن والأذكار — ووَفِقنا للأعْمالِ الصّالحاتِ والأبرارْ، وأحْفَظْنا مِنْ شرّ الشياطينِ والُكفّار). امين يارب العالمين ياغفار يستار.

# ئامۆژگاری بیست و شەشەم
## باسی فەزڵی کۆتـایی سوورەتی ( البقرة ) ئەکات

الحمدُ لله ثُمّ الحمد لله ... الحمد لله الذّي أقر بوحدانيته العـاقلون ونَـشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لهُ ونَشهَدُ أنَ سَيدنا وَ مَولانـا مُحَمَـدٌ عبـدهُ وَ رسولهُ الذي يغفل عن سنته الغافلون والصلاة والسلام على هذا النبي مُحَمـدٍ وآله الطيبون وصَحبه الطاهِرون سيما الخلفاء الراشدون حـضرات أبـي بكـر الصديق وَعُمر الفاروق وَ عُثمان ذي النورين وعلى المرتضى أمراء الصادقون ومن تبعهم بإحسانٍ إلى يوم الدين (رضوان الله تعالى عَليهم وعلينـا ببركـاتهم أجمعين) أما بعدُ يا أخوة المؤمنين ، أيها المُستمعون أوصيكم ونفسي بتقوا الله وطاعته فإن الله مع الذين إتقوا والذينَ هُم مُحسِنون) واتـه : لـەدوایی دا برا ئیماندارەکان ، ئەی گوێگرانی بەڕێزم یەکـەم نەفـسی خـۆم ئامۆژگـاری دەکەم دووەم ئێوە کە لە خوای بترسێن و پەیڕەوی خـوای گـەورە بکـەین چوونکە بەڕاستی خوای گەورە لەگەڵ پارێزگاران و چاکە کارانە).

جا هەروەها بۆ نموونە پێش ئەوەی بچینە ناو بابەتەکەوە ئەم حەدیسە (قودسیە) و پیرۆزە ئەخەینە بەرچاوی خوێنەواران (عَن النعمـان بـن بـشير (رضي الله عنه) قالَ قالَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) إن الله كتَبَ كتاباً قَبلَ أن يَخلقَ السماواتِ والأرضَ بألفي عامٍ أنزلَ منهُ آيتين ختـمَ بهـا سـورة البقـرة ، ولا يُقـرأنِ في دارِ ثَـلاثَ ليـالٍ فَيقربُهـا شـيطانٌ) رواه الترمـذي في صحيحه.

واتە: خوای گـەورە نوسـراوێکی نوسـیوە پـێش ئـەوەی ئاسمانـەکان و

زەوی درووست بكات بە دوو هەزار ساڵ (دوو ئایەتی) لێ ناردە خوارەوە كۆتایی سورەتی (البقرة) ی پێ هێناوە ، وە لە هەر ماڵێكدا ئەو دوو ئایەتە سێ شەو بخوێندرێت شەیتان بەهیچ شێوەیەك نزیكی ناكەوێت).

جا هەوەها زانای بەناوبانگ (إبن كثیر) لە (تەفسیرەكەیدا) [1] ئەڵێ : (يُخبِرُ تَعالى أن لَهُ مُلكُ السماواتِ والأرض وما بَينَهُنَ وأنه المُطلَعُ عَلَى ما فيهنَ لا تَخفى عَليهِ الظواهر وَلا السرائر والضمائر وإن دقت وَخُفيت وأخبر أنه سَيُحاسبُ عِبادَهُ عَلَى ما فَعَلوهُ وَما أخفَوهُ في صدورهِمْ) واتە : خوای تەبارەك و تەعالا خەبەرمان پێ ئەداو پێمان ڕائەگەینێ كە بێگومان ئەوەی لە ئەرزو لە ئاسماندایە ئەوەی تێیدایە لە (جانەوەر) و (بونەوەردا) ئاگاداری هەمووی هەیە هیچ شاراوەو نادیار نیە بە ئاشكراو بە پەنهان با هەرچەند شتەكە ووردو پەنهان بێت ئاگاداری هەموویەتی و هیچی لەبەر وون نابێت و وە هەروەها پێمان ڕائەگەیەنێ كە خوای گەورە (موحاسەبە)ی هەمووی ئەكات و بەتایبەتی بەندەكانی لەو ئیشو كارەی كە ئەنجامی ئەدەن و ئەوەی لە سینەیان شاراوەیە ، جا هەروەها بێگومان خوای گەورە ئەفەرموێت :

﴿ لِّلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۗ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ ٱللَّهُۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ ﴾ سووروەتی البقرة: ٢٨٤واتە : هەرچی لە

---

(1) بڕوانە : صحيح تفسير إبن كثير ، دانراوی بەڕێز : مصطفى بن العَدَوي) بەرگی (١) لاپەڕە ٣١٨.

ئاسمانەکان و زەویدایە بە گیاندارو بێ گیانەوە هەر هەمووی هی خودایەو لە نەبوونەوە هێناویەتە بوون ، هیچ شتێك نییە نەزانێت و لێی بزر بێت ئەوەی لە دڵتان دایە ئاشکرای بکەن یا بیشارنەوە خودا دەیزانێت وە ئاگادارە لێی وە لێتان دەپرسێتەوە ، ئەوسا هەرکس بیەوێت لێی خۆش دەبێت وە هەر کەس بیەوێت سزای دەدات و ، خواش بەسەر هەموو شتێکەوە دەسەڵاتی هەیە (ئەوەی چرپەی دەروونیە دێت و دەڕوات و جێگیر نابێت لێپرسینەوەی لەسەر نیە)، ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٨٥، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئیمانی بە قورئان هێناوە کە لەلایەن خوداوە بۆی هاتۆتە خوارەوە هەروەها ئیماندارانیش باوەڕیان پێ هێناوە وە هەموویان باوەڕیان هێناوە بە خواو بە فریشتەکان و بە (کتێبەکانی) کە ناردونیەتیە خوارەوە هەروەها بە پێغەمبەرەکانی کە پێشتر ڕەوانەی کردوون ئیمانداران دەڵێن ئێمە هیچ جیاوازیەك ناخەینە نێوان پێغەمبەرانی واتا هیچ جۆرە جیاوازیەك ناکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێ لە پێغەمبەرەکانی خوا لە (باوەڕدا) هەروەها دەڵێن خودایە بانگەوازو فەرمایشتەکانمان بیست و ملکەچ و گێڕایەڵی بووین سا خودایە لێمان ببورە لە ڕۆژی دواییدا هەر بۆلای تۆ دەگەڕێنەوە ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ﴾،واتە: خودا خاوەنی بەزەییە ئەرکێك ناخاتە سەر هیچ

کەسێك کە لەتوانای خۆی زیاتر بێت[1] ئەو واجیبانەش کە داونی بەسەر موسڵمانانادا هەمووی لە ئاستی توانای خۆیاندا وەکو (نوێژو ڕۆژوو و زەکات و حەج و گشت فەرزەکانی تریشی) ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە خودای میهرەبان بناغەی ئەم ئایینە پیرۆزەی لەسەر سووکی و ئاسانی داناوە ﴿ لَهَا مَا كَسَبَتْ ﴾ ، واتە : لەڕۆژی دواییدا هەموو کەسێك کردەوەی خۆی دێتەوە ڕێگای خۆی ئەگەر چاکە بێت هەر بۆ خۆیەتی و پاداشت وەردەگرێتەوە ، ﴿ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ﴾، واتە : هەر خراپەیەکیشی کرد سزاکەی هەر بۆ خۆیەتی وە خۆی زەرەرمەندە ، ئینجا لەکۆتایی سورەتەکەدا شێوەی (موناجات) و پاڕانەوەمان فێر ئەکا دەفەرموێ ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾، واتە : ئەی پەروەردگاری ئێمە ئەگەر فەرمانێکی تۆمان لەبیرچوو یان تێیدا بەهەڵە چووین لێمان مەگرە ﴿ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ﴾، واتە : ئەی پەروەردگارمان هیچ تەکلیف و ئەرکێکی ئەوەندە قورس و گران (إصر) مان مەخەرە سەر شانمان وەکو ئەو فەرمانانەی کە پێشتر لەبەر یاخی بوون و دڵڕەقی لە ڕادەبەدەری خۆیان خستبووتە سەر شانی گەلانی پێش ئێمە وەکو (جوولەکەو دیانەکان) ، ﴿ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ﴾واتە : پەروەردگاری ئێمە ئەرکێکی

---

(١) هەرچەندە خودا لە خەیاڵ و خەتەرەی دڵ وە دەروون دەپرسێتەوە بیشارێتەوە یان دەری بخاتە ڕوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدەر لە توانا (تەکلیف) و ئەرکی ناخاتە سەر شانی هیچ کەسێك) ، بڕوانە تەفسیری ڕامان ، لاپەڕە ٩٣.

وا بەسەرماندا مەدە بۆمان هەڵنەگیرێ و لە تواناو هێزمان نەبێت ﴿ وَٱعۡفُ عَنَّا ﴾ واتە : چاوپۆشیمان لێ بکە ﴿ وَٱغۡفِرۡ لَنَا ﴾ واتا : هەڵەو تاوانمان بپۆشە ، ﴿ وَٱرۡحَمۡنَآ ﴾واتا : رەحممان پێبکە، ﴿ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا ﴾ ، واتە : هەر ئەتۆی سەرپەرشتیارو پشت و پەنامانی ، ﴿ فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ واتە: دەسا بەسەر هۆزو بەرەی بێ باوەڕان و خوانەناساندا سەرمان بخە واتە بەڵگەو نیشانەمان فێربکە بالەکاتی (موجادەلەو دەمەقاڵێدا وە لەکاتی ڕووبەڕووی دووژمن بونەوە لە جەنگیاندا زاڵ بین)، دەگێڕنەوە لە موعازی کوڕی جەبەل (خوا لێی ڕازی بێت) کە هەر کاتێ لە خوێندنەوەی ئەم سورەتە ئەبۆوە ئەیفەرموو (آمین فاللّهُمّ آمین).

## ( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )

جا هەروەها بێگومان چەند سوودو قازانجێك ئەخەینە بەرچاوی خوێنەران کە ئەویش لە تیشکی ئەم دوو ئایەتە وەرئەگرین وە لەم چەند خاڵە ڕوونی دەکەینەوە :

١) لابردنی ئەرك و باری گران و قورس لەسەر شانی ئوممەتی پێغەمبەر (ﷺ).

٢) هەروەها تاوان و گوناه لەحاڵی لەبیرچوون و هەڵەدا ڕوودات هیچ سزاو تۆڵەیەکی نییە .

٣) لێبوردن و لێخۆشبوون لەو هەڵەو پەلانەی بەدڵتا تێدەپەڕێت.

٤) فێربـوون و خوێنـدنی ئـەم دوعایـەی وئـاخیری سـورەتی (بەقـەرە) سـوننەتە چـوونکە پێغەمبـەرو (ﷺ) هـاوەڵانی هـەموو کـاتێ دەوریـان ئەکردەوەو ئەیان خوێنـد ٥) جـا هـەروەها بێگومـان پێغەمبـەر (صـلی الله علیـه وسـلم) لەفەرمودەیەکـدا کـە ئـیبن و مەسـعود (خـوا لێـی ڕازیبێـت) ئەیگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت : (مَـنْ قَـرأ هـاتينِ الآيـتينِ مِن آخرِ سُورةِ البقرة في ليلةٍ كَفتاهُ) رواه مسلم ، واتە : هەر کەسـێك لەهـەر شەوێکدا ئەم دوو ئایەتـەی ئـاخری سـورەتی (بەقـەرە) بخـوێنێ بـۆ ئـەوە بەسیەتی .

٦) لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (مَن قَرَأهُما بَعْدَ العشاءِ مرّتينِ أجزاتهُ من قيام اللّيلِ وكَفَتاهُ من شَرّ الشّيْطانِ فلا يكونُ لَـهُ عَليـهِ سُـلطان) رواه الترمـذي ، واتـە: هـەر کەسـێك پـاش نوێـژی خەوتنان دوو جار ئەو دوو ئایەتە بخوێنێ ئەوا لە جیـات شـەو نوێـژی ئـەو شەوە بۆی دەنوسرێت و لە خراپەو شەڕی (شـەیتان) یـش پـارێزراو دەبـێ دەرەقەتیشی نایەت).

٧) ئـــەم (جوملەیـــەش) کـــە ئەفـــەرموێت ﴿ فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ خوایە هەر تۆ کاری ئێمەت لەدەستەو خـاوەنی ئێمـەی بەسەر بێ باوەڕاندا سەرمان خـەو ، ئەمـەش وا ئەگەیـەنێ کـە موسـڵمانان بەردەوام بێ پسانەوە لەگەڵ بێ باوەڕو (کافران) لەجەنگ دان و هـەروەها (کافران) لێمان ناگەڕێن کە بە گوێرەی یاسـای خـوا کـاری خۆیـان بـەڕێوە ببەن .

بۆیە دەبێ بەردەوام موسڵمانان داوای یارمەتی لە خوا بکەن لە خـواش

بەولاوە کەس نەکەنە پشتیوان و پێشەوا کە بەگوێرەی فەرمانی خوا کارناکەن (والله أعلم) واتە خوداش زانایە بەم ووتانە .

**( سەرنجێکی گرنگ )**

هاتووە لە تەفسیری کەبیردا[1] نەقڵ ئەکا لەم بەڕێزانە وەکو (حەسەن) و زوحاك) و (موجاهید) و زۆرانی تریش لە (موفەسیرەکان) لەسەر ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ ﴾ هتد...) تا دوایی سورەتەکە (كانَ في قصة المعراج لما انتهى النبي (صلى الله عليه وسلم) إلى سِدْرةِ المُنتهى ، قالَ لهُ جبريل إني لَم أجاوز هذا المكان ولَم يؤمَر أحدٌ بالمجاورة غيرك فأمضِ أنت) واتە : لە داستان و شەوڕەوەو (میعراجی) پێغەمبەر (ﷺ) لەو کاتە کە حەزرەتی جوبرەئیل لەگەڵیدا بوو تا گەیشتنە داری (سدرة المنتهى) ئینجا جوبرەئیل فەرمووی ئەی خۆشەویست من ناتوانم لەم جێگایە زیاتر (تجاوز) بکەم چوونکە خودا فەرمانی پێم نەکردووەو مەگەر تۆنەبی ڕێگا بەهیچ کەسێکی تر نەدراوە لەتۆ زیاتر تۆش فەرموو کەرەم بکەو (قال النبى (صلى الله عليه وسلم) فمَضَيْتُ حتى أنتهيتُ إلى ما أرادَ الله تعالى) واتە : حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت ئەوجا منیش ڕۆیشتم تا گەیشتمە ئەو جێگایەی خوا بیەوێت و حەز بکات (فأشارَ جبريلُ (عليه السلام) أن تسلّم عَلَى ربِّك) ئینجا گەیشتم بە خزمەتی خودا جا هەروەها

(1) هەرچەندە خودا لە خەیاڵ و خەتەرەی دڵ وە دەروون دەپرسێتەوە بیشارێتەوە یان دەری بخاتە ڕوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەدەر لە توانا (تەکلیف) و ئەرکی ناخاتە سەر شانی هیچ کەسێك) ، بڕوانە تەفسیری ڕامان ، لاپەڕە ٩٣.

حەزرەتی (جوبرەئیل) سەلامی خوای لێبێت) ئامارەی بۆ کردم و فەرمووی تۆ گەیشتی بە حزوری خودا بە جوانترین شێوە سەلام و تەحیەی بۆ بکە ئەوجا منیش ووتم (التحياتُ للهِ وَالصّلوات الطّيباتُ لله) جا خوای تەبارەك و تەعالاش فەرمووی (السّلامُ عَلَيكَ أيّها النبّيُّ وَرحمة اللهِ وبركاتهُ) ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) لەوەلامدا فەرمووی بۆ ئەوەی بێ بەش نەبێ ئوممەتەکەی لە سلاوی خودا فەرمووی (السّلامُ عَلينَا وَعَلى عِبادِ اللهِ الصّالحين) ئینجا حەزرەتی جوبرەئیل و هەموو فریشتەکانی ئاسمان ووتیان (أشْهدُ أنْ لا إله إلا الله وأشْهَدُ أن مُحمداً عبدهُ وَرَسولَهُ) جا هەروەها خوای مەزنیش فەرمووی (آمنَ الرّسول بِما أُنزلَ إليهِ مِنْ رَبّهِ) ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) بۆ ئەوەی بێ بەش نەبێ (ئوممەتەکەی) لەم رێزو شەرەفەداو فەرمووی ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٨٥[1]، جا خوای گەورە فەرمووی ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٨٦ جا حەزرەتی جوبرەئیلیش فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ) چی داوا بکەی لە خوا پێت ئەداو ئەوجا ئەویش فەرمووی ﴿ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ﴾الآية ، جا ئەو کاتەی پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی گەڕایەوە لە شەو ڕەوەکەی خودا نیگایی بۆ کرد ئاوا (ئوممەتەکەت) فێر بکە دوعاو پاڕانەوە لەبەر خوا بکەن).

(نبهني اللهُ وايّاكُمْ مِنْ نَوْمةِ الغافلينْ وَحَشرَني وإيّاكُمْ تَحْتَ لواءِ سَيّد المُرسَلينْ اللّهُمَ إغفِرْ لَنّا آمينْ)

---

[1]() ئەم ئایەتە لەپێشەوە تەفسیرکراوەو بچۆبیخوێنەوە.

# ئامۆژگاری بیست و حەوتەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( بِسْمِ اللهِ الرحمن الرّحيم ) دەكات

الحمدُ للهِ القائمِ عَلى كلَ نَفسٍ بِما كَسَبَت الرّقيبُ على كلّ جارحةٍ بما إجْتَرحتْ المطلّع عَلى ضمائر القلوب إذا هَجست الحَسيبُ على الخواطر إذا اختلجت الذّي لا يَعْزُبُ عَنْ علمه مِثقال ذرّة في السّموات والأرضِ تحَركت أوْ سَكَنتْ المحاسب على النقرِ والقطميرِ والقليلِ والكثيرِ من الأفعال ، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شريكَ لَهُ وَأشهَدُ أن سيدَنا مُحَمداً عَبدَهُ ورَسولَهُ ، وَصَلَوات الله وسلامه على سَيدنا مُحَمدٍ القائل (مَن يُرِد الله بهِ خيراً يُفقهُ في الدين (وصلى اللهُ عَلى آلهِ وأصحابهِ وأتباعهِ إلى يَوم الدين)

أما بَعد : إعلموا إخواني المؤمنين وفقني الله وإياكم لِطاعتهِ ، إن بسّمِ الله الرّحْمنَ الرّحيم كَلِمةٌ مَنْ تَحقّقَ بها فَلَهُ جَزيل النوالِ وَمَن بَلَغَ نهاية الآمالِ وَمَن لازَمَها فَهوَ نِهاية الكَمال[1] .

واتە: لەدوایی هەندێ برایانی خاوەن باوەڕم ، خوای گەورە (موەفەق) و هاریكارمان بێت بۆ پەیڕەوی تاعەت و پەیڕەوی كردنی خۆی ، جا پێویستە بزانین بە (تأكيد) كە ووشەی (بِسّم الله الرّحْمنَ الرّحيم) زۆر

---

(1) بڕوانە : پەرتوكی (مجالس خيرية ومفاتيح علميّة) دانراوی بەڕێز (محمد خيري بن محمد نظيف) لاپەڕە ٧.

گەورەو پیرۆزە وە بەڕاستی هەر کەسێك ئەم ووشە پیرۆزە لەپێش هەموو شتێکدا ئەنجام بدات و بیڵێ ئەوە بە(تەحقیق) ئەجرو سەوابی یەکجار زۆرە وە ئەگاتە مەقصەدو مرازی خۆی ، وەئەگاتە ئامانج و مەبەستی خۆی ، وە هەر کەسێك دەوامی لەسەر بکات ئەوا بێگومان گەیشتۆتە ڕادەی (کەمال) واتە ئیش و کاری زۆر لە جێیە ، جا هەروەها بێگومان تا ئێستا بەسەدان عالم و زاناو ڕوناکبیر و خاوەن ژیر لەسەر گەورەیی ئازایەتی (بسم اللهِ الرّحْمن الرّحيم) قسەیان لەسەرکردووە پەرتوك و کتێبیان لەسەر داناوە وە زۆر حەدیسیان لەسەر (ریوایەت) کردووە ، بەلاَم ئەگەر بە ووردی بیر لە ئایەتی (بسم الله الرحمن الرحيم) بکەینەوە ئەوەندە گەورەیە ئەوەندە )ئەسرارو) نهێنی تێدایە مەگەر هەر خوا خۆی بیزانێ ؟ بەڵێ بە گۆترەو خۆڕایی نیە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (كُلُ أمرِ ذي بالٍ لاَ يبدءُ فيهِ (بسم الله الرّحمن الرّحيم) فَهوَ أبتر[1] .رواه أبو داود عن أبي هريرة (رضي الله عنه). واتە : هەر (ئەمرو) کارو فەرمان و کردەوەیەکی چاك کە (بِسم الله) ی لەسەر نەکرێ ئەوا خێرو سەواب و پاداشتی دواڕۆژی و کەلکی دونیای کەم دەبێتەوە ، جا هەروەها خاوەن باوەڕان گەورەیی و ئەسرارو نهێنی ئایەتی (بسم الله) ئەوەندە زۆرن لە ژمارو (حیساب) نایەن.

(1) وفي رواية (أقطع ، وفي لفظ أجذم) المعنى (أنه ناقص – وقليل البركة) واتە خێری نوقسانە یا بێ بەرەکەتە ، هتد... بڕوانە (كشف الخفا) دانراوی العجلوني، بەرگی ٢ ، لاپەڕە ١٥٦.

**( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )**

١) قالَ المُفَسرون (بِسْم الله) كَلِمةٌ تَوسَلَ بِها نُوحٌ (عَلَيْهِ السّلام) في الزمن القديم) ، واتە: (موفەسيرەكان) ئەفەرموون ووتەی (بِسْم الله) ئەو كەليمەيە كە حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێبێت) ڕزگاری بووە لەگەڵ ئەو ئيماندارنەی كە لەگەڵی دابوون (نەجاتيان) بوو لە تۆفان هەروەكو خوای گەورە لە قورئاندا بۆمان دەگێڕێتەوە ئەفەرموێت : ﴿ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴾سوورەتی هود: ٤١ ، واتە : نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) بە ماڵ و منداڵەكەی و موسڵمانانی گووت سەركەونە سەر كەشتيەكە ڕۆيشتن و ڕاوەستانی بەناوی خوايە ، واتە : بەفەرمان و چاودێری خوا دەڕوات ، هيچتان بەسەر نايەت و بەفەرمان و چاودێری خوا دەوەستێ ئێمە هيچ دەسەلاتێكمان لەسەری نيە ﴿إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ سوورەتی هود: ٤١ واتە : پەروەردگاری من لێبوردەيەو ميهرەبانە بۆ بەندەكانی خۆی ، هەردەم لە خراپەيان دەبورێ و ڕەحميان پێ دەكات وە لە بەلاو نەكبەت ڕزگاريان دەكات بۆيە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت : (هەركەسێ سواری كەشتی بوو با بڵێت ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ﴾ئەگەر ئەم دوعايە بكات هيچی بەسەر نايەت.

٢) جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لە قورئاندا داستان و بەسەرهاتی سلێمان پێغەمبەرو بەلقيسمان بۆ دەگێڕێتەوە ، كەوا پوختەكەی ئەمەيە حەزرەتی سلێمان (سەلامی خوای لێبێت) نامەيەكی نووسی و مۆری كردو دايە دەستی پەپووڵە سلێمانِ ئەويش بردی بۆ خاتوو

بەلقیسە و ، هەروەکو قورئان ئەفـەرموێت : ﴿ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ ﴾ سـوورەتی النمـل: ٢٩، واتــە: دوای ئــەوە کەپەپووڵــە سلێمانەکە نامەکەی گەیاندە بەلقیس و خوێندیـەوە ، ئـیتر دەسـت بـەجێ پیاوانی پلەداری سوپاو (مەملەکەتی) کۆکردەوە و ، ووتـی : ئـەی گـەورە پیـاوانی پلـەدارانی سـوپا بەڕاسـتی مـن نامەیـەکی زۆر ڕێـزدارو گـرنگ و پیرۆزیان بۆ هاوێشتووم ، وەك قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێت ﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ ﴾ سـوورەتی النمـل: ٣٠، واتــە : لـەپاش ئـەوەی نامەکـەی خوێندەوە بۆیان و ووتـی ئـەم نامەیـە تێیـدا نووسـراوە (بِسْمِ الله الـرَّحْمن الـرَّحِيم) واتــە : دەبـیَ هــەموو کاروبارێـك تـەنها بـەناوی خـوای گـەورەو بەخشندەو میهرەبانەوە بکرێت .

٣) (بسم الله) واتە: بەناوی خوای گەورەو دلۆڤان (الرّحمن الرّحيم) واتە : خوایـەکی بەخـشندەو میهرەبـان ، هەنـدێ لـە (موفەسـیرەکان) ئـەڵێن (الرّحمن) واتە: خوا میهرەبانە لـە دونیـاداو (الـرّحيم) واتـا لـە دواڕۆژدا لـە قیامەتدا بەخـشندەیە ، هـەروەها لەبـەر ئـەم هۆیەیـە (الـرّحمن) بـە پـێش (الـرّحيم) خـستووە ، جـا هـەروەها بێگومـان پێویـستە ئینـسانی خـاوەن باوەڕو موسڵمان ، لەهـەموو کـارو فـەرمانێکی بـە (بـسم الله) و نـاوی خـوا دەست پێبکات ، چوونکە بەڕاستی ئەم ناوە پیرۆزە ، (شیعاری) ئینـسانی خاوەن ئیمان و بیرو باوەڕە (بسم الله) واتە: (میفتاح) و کلیلـی کردنـەوەی دەرگـای کـارو فـەرمان و ئومێـدی سـەرکەوتنی بەسـەر هـەموو تـەنگ و چەڵەمەی ژیاندایە، جا هەروەها (بسم الله) ناوبردنی خوداوەنـدی گەورەیـە

بۆ هەموو ئیش و کارێك بۆ ئینسانی خواناس و خاوەن ئیمان بەتایبەتی بۆ ئەو خوا پەرستانەی کە دەست بە نوێژو ڕۆژوو خواردن و خواردنەوەی زاد و ئاوو هەر شتێکی ڕەواو (حەلال) بێت[1] ، چوونکە لە شەریعەتی ئیسلامدا هەر (حەیوان) و ئاژەڵێك ناوی غەیری خوای لەسەر ببرێ لەکاتی سەربڕیندا ئەوا (شەرعاً) گۆشتەکەی (حەرامە) و ناخورێ هەروەکو خوای گەورە لە قورئانـــدا ئەفـــەرموێت : ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ سـوورەتی الأنعـام: ١٢١) ، واتـە : هـەر پەلـەوەرو (حـەیوانێ) لـەکاتی سـەربڕیندا نـاوی خـوای لەسـەر نـەهێنرابێت ئێـوە لـەو گۆشـتەی مـەخۆن (حەرامە) و (قەدەغەیە).

## ( چەند سوودو قازا نجێك ) [٢]

جا هـەروەها بێگومـان پێغەمبـەری خۆشەویـست (ﷺ) سـەبارەت بـە مەزنی و گەورەیی ئایەتی (بسم الله) و (بسم الله) کردن و بەرەکـەتی (بـسم الله) لـە حەدیـسدا فەرمایـشتی زۆری فـەرمووە هـەروەها زۆر حەدیـسی لێ وەرگیراوەو(ڕیوایەت) کراوە بۆ نموون :

١) خاوەن پەڕتووکی (إعانە)[٣] ،چەند فەرمایشتێکی (حەزرەت) (ﷺ)

---

(1) جا هەروەها هەموو کڕین و فرۆشتنێك ، هەروەها هەموو هەستان و دانیشتنێك دەبێ بەناوی خوا دەست پێبکات .

(2) لەبارەی (بسم الله الرّحمٰن الرحیم) وە ، وە هەروەها هەندێ فەرمایشتی بەسوودی لەسەر هاتووە .

(3) بڕوانە (حاشية إعانة الطالبين على الفاظ الفتح المبين)، دانراوی (زين الدين عبدالعزيز المليباری) ب(١) لاپەڕە١٠.

ئەخاتە بەرچاو لەیەکەم لاپەڕەی پەرتووکی ناوبراو ، ئەفەرموێت : (وَأعلَم أنّه جاءَ في فضل البَسْمَلَة أحاديثٌ كثيرة) روي عَن النبي (ﷺ) أنه قال: (أول ما كَتَبَ القَلَم (بِسْمِ اللهِ الرّحْمَن الرّحِيم) فإذا كَتَبْتُمْ فاكتبُوهَا أوله وهي مِفْتاح كلّ كتابٍ أنْزَلَ) ، واتە: (ریوایەت) کراوە لە پێغەمبەر (ﷺ) یەکەم کەلیمەو ووشە کە قودرەتی خواوەندی گەورە نووسی ئایەتی (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم) بوو کە (لە لەوحلمەحفوزدا) نووسرابوو جا ئەفەرموێت ئەگەر ئێوە لەهەر نامەیەك و کاغەزێك نوسیتان لەیەکەم جاراو لە (بیدایەتی) بینووسن چوونکە (بسم الله) کلیلی هەموو نامەیەکە کە خوای گەورە دایبەزاندووە .

وە ئەفەرموێت: (وَلَما نَزَلَ بِها جبريلُ أعادها ثلاثاً وَقال وَهيَ لَكَ وَلأمتكَ فَمرْهُمْ أن لا يَدعوها في شيء من أمُورِهم فأني لمْ ادعها طَرفة عين مَنذ نَزَلْتَ علَى أبيكَ آدم (عليه السلام)، واتە: ئەوکاتە کە حەزرەتی جوبرەئیل کە ئایەتی (بسم الله) ی دابەزاند سێ جار دووبارەی کردەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی یەکێك بۆتۆ یەکێکیش بۆ ئومەتت ئینجا فەرمانیان پێ بکە کە وازی لێنەهێنن لە هەموو ئیش و کارێکیاندا چوونکە ئێمە وازمان لێ نەهێناوەو بە ئەندازەی چاو نوقانێك لەو کاتەی کە دابەزیوە بۆ باوکت حەزرەتی ئادەم (ﷺ) وە هەروەها فریشتەکانیش.

٢) ورووی (بِسْمِ اللهِ الرّحمَن الرّحِيم) أمّ القرآنِ ، واتە : (بِسْمِ اللهِ الرّحمن الرّحيم) وەك دایکی قورئان وایە هەروەها (ریوایەت) کراوە لە فەرمایشتێکدا ئەڵێ ژمارەی پیتی (بِسْمِ اللهِ الرّحمن الرّحيم) نۆزدەیەو هەروەکو (نەصەکەی) بەعەرەبی ئەفەرموێت (وَعَدَدُ حروف البَسمَلة تِسعةً

عَشَرة حَرفاً، وعدد خزنة النار تِسعةَ عَشَرَ خازناً كما قالَ الله تعالى ﴿ عَلَيْهَا تِسْعَةَ عَشَرَ ﴾ سوورەتی المدثر: ٣٠

٣) وە هەروەها ژمارەی مەلائیکەو زەبانیەی دۆزەخیش نۆزدەن هەروەکو ئایەتەکە ئەفەرموێت واتە نۆزدە فریشتەی بەسەرەوەن بۆ سەرپەرشتی و چاودێری و بەڕێوەبردنی دۆزەخ ، وە عبداللەی کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ (فَمَن أراد أنْ ينجيه الله مِن الزّبانية التسعة عَشَرَ فلْيقرأ البسملة فيجْعَلُ الله له بكلِّ حَرفٍ منها جنّةً أي وقاية) واتە: هەرکەسێ دەیەوێ ڕزگاری بێ لە دۆزەخ وە لە چنگی ئەم دەرکەوانانەی دۆزەخ با (بِسْمِ اللهِ الرّحمَن الرّحيم) بکاو ناوی خوا بێنێ خودای گەورە لە بەڵای ئەو نۆزدە زەبانیەی دیپارێزێ چوونکە بەهەر پیتێك دەرگایەکی بۆ ئەگیرێ و ئبێتە وقایەی و مایەی ڕزگاری .

## ( لطيفة واتە ڕوداوێکی ناسك )

(قيلَ أنّ لقمان (عليه السلام) رأى رُقعةً فيها (بِسْمِ اللهِ الرّحْمَن الرّحيم) فَرَفَعها فأكرمهُ اللهُ بالحِكمة[1]، گوتراوە لە زووەوە بەڕاستی حەزرەتی لقمانی حەکیم (سەلامی خوای لێ بێت) پارچە وەرەقەیەکی دۆزیەوە لە ئەرزاو لەبن دەست و پێیان کەوتبوو ناوی پیرۆزی خوای لێ نووسرابوو ئینجا ئەویش هەڵی گرتەوەو پاکی کردەو، کە ئەو ڕێزی لە ناوی خوا ناو،

(1) بڕوانە پەرتوکی (التُحفةُ المرضيّة) لە نووسینی الشيخ (عبدالمجيد علي خادم آل بيت النبّي(ﷺ) ، لاپەڕە ٤.

خوداش ڕێزی لە ئەو نا وە فێری ئەم هەموو حیکمەت و ژیریەی کرد).

هەروەها بێگومان ئیمامی (کَرّم اللهَ وجْهَهُ) ، دەفەرموێ هەر کەسێك کاغەزێك کە ناوی خواو (بسم اله) ی لەسەر بێ و لەبەر (حورمەتی) ناوی خوا هەڵی گرێتەوە ئەوا خواوەندی گەورە لە دونیاو قیامەت ناوی ئەو کەسە سەربەرز دەکاتەوە .

**( ئاگاداریيەك )**

(وروي) مَن أرادَ أنْ يُحْيا سَعِيداً ويَمَوت شهيداً فَلْيَقُل عِندَ ابتداء كُلّ شيء (بِسْمِ اللهِ الرّحْمَن الرّحيم) ، واتە : هەر کەسێك پێی خۆشە بە خۆشی بژی هەروەها بە (شەهیدی بمرێ) واتە کە مرد (دەرەجەی) شەهیدی دەست کەوێ با لە ئەوەلی هەموو کردەوەیەکی چاکدا (بِسْمِ اللهِ الرّحْمَن الرّحيم) بکا ، چوونکە بێگومان زۆر لە زانایەکانی ئایینی ئەفەرموون هەر سەحیفەو کتێبێکی ئاسمانی کە لەلایەن خوای گەورەوە بۆ پێغەمبەرەکان (سەلاّت و سەلامی خوایان لەسەر بێت هاتبێتە خوارەوە، (کلیلەی) کردنەوەی دەست پێکدرنی هەر ئایەتی (بِسم الله) بووە .

## دوو تێبینی زۆر گرنگ

جا هروەها خوێنەرانی ئازیزم ئەگەر ئێمە ووردبینەوە لە (حیکمەت) و فەلسەفەی (بسم الله) بۆچ خوای مەزن لەسەرەتای قورئان وە لە سەرەتای هەموو سورەتێکی قورئاندا (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحيم) ئەفەرموێت ؟ جا لەوەلاّمدا ئەڵێن ئەمە لەبەر چەند (حیکمەت) و هۆیەکە کە زانایانی ئیسلام وەلاّمیان داوەتەوە :

یەکەم) ئەمانە فەرمانێکە کە خوای گەورە بە موسڵمانان ئەکات کە هەر ئیشێك و شتێك ئەکەن لەپێش دەست پێکردنیدا بڵێن (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنِ الرَّحِیم) وە ئەوەی کردە درووشمی خوا پەرستان واتە هەر ئیشێك ئەکەن بەناوی خوا دەستی پێبکەن ، وە ئەڵێن (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنَ الرَّحِیم) واتە : بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان چوونکە هەریەکێك بەگوێرەی زوبان و زاراوەی خۆی ناوی خودا[1] لەسەر ئیشەکە ئەبات).

دووەم) گاوورەکان (بت پەرست) لەپێش هاتنی ئیسلامی پیرۆز کە دەستیان بەهەر کارێك دەکرد ئەیان ووت بەناوی (لات) یان ناوی (هوبەل) یان ناوی (عوززا) واتە هەر کەس ناوی بتێکی لەو بتانەی کە ئەیان پەرست لەپێش دەست بەکارکردندا ئەهێنا وە بەناوی ئەوان دەستیانبە ئیش و کار ئەکرد ، ئینجا کە خوای گەورە ئایینی ئیسلامی پیرۆزی هەنارد وە حەزرەتی(محمد) مستەفای نازداری هەناردو و کردی بە پێغەمبەر (ﷺ) وە قورئانی پیرۆزی بۆ نارد ئینجا فەرمانی دا بە موسڵمانەکان کە هەر بەناوی خوا دەست بە فەرمان و ئیش و کار بکەن وە بەهیچ ناوێکی تر جگە لە ناوی خودای گەورە دەست بە هیچ ئیش و کارێك نەکەن[2] .

---

(1) بەلاّم ئەمە گوناهێکی گەورەیە ، وەك هەندێك لە (جولەکەکان) ئەڵێن بەناوی (عوزێر) یاخۆ هەندێ لەدیان واتە (فەلەکان) ئەڵێن بەناوی (مەسیح – یا عیسا) یا هەندێ کەس ئەڵێن بەناوی فلاّنە شا یا (بإسم شعب) یا گەلّ یان نیشتیمان ...هتد) ئەمە هەمووی گشتی دژی خواناسین و موسڵمانیەتیە و گوناهێکی زۆر گەورەیە) هەروەکو لە پەرتووکی (تاوانە گەورەکان) باسمان کردووە.

(2) بڕوانە : پەرتوکی (باشترین دیاری بۆ کوردەواری) لە نووسینی خوالێخۆشبوو ، مامۆستا مەلا (محمد) شێخ بالیسانی ، لەگەڵ دەستکاری ، ل١٦.

## ( بسم الله – ووشەیەكی چەندە مەزن و پیرۆزە )[1] .

زانای بەناوبانگ (نەورەسی – رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەفەرموێت (بسم الله) بناغەی هەموو چاكەیەك و سەرەتای هەموو كارێكی گرنگە ، چوونكە پێویستە بزانین ئەم ووشە پاك و پیرۆزە هەروەكو دروشمی ئیسلامە (زیكر) و (وێردی) زەمانی حاڵی هەموو (بوونەوەرانیشە) بەڵێ ئەم ووتە پاكە (بسم الله) گەنجینەیەكی وەها گەورەیە كە هەرگیز نابڕێتەوە .

## ئاگاداری

جا بێگومان ئەو كەسەی كە بەو ووشەیە (بسْمِ الله) هەڵسوكەوت دەكات و بەیانی و ئێواران وەكو ئەو كەسە وەها كە چوبێتە خزمەتی سەربازیەوە وە بەناوی دەوڵەتەوە ڕەفتار بكات و لەكەس نەترسێ چوونكە ئەو بەناوی یاساو بەناوی دەوڵەتەوە قسە دەكات بەمە كاروباری جێ بەجێ دەكات و لەبەردەم هەموو شتێكدا دامەزراو دەبێت [2] .

جا هەروەها لە كتێبی (مەجلیسی ئەولیادا) [3] .دەفەرموێ هۆی (هیدایەتی) شێخ (بُشْري) حافی (رەحمەتی خوای لێ بێ) بەهۆی ڕێزو حورمەت گرتنی لەناوی خواو ... بسم الله وە بوو ، چوونكە دەفەرموێ

---

(1) چوونكە بێگومان هەر كەسێ ناوی خودا بەپاكی ڕاگرێ و بیهێنێ و ڕێزی لێ بگرێ خواش لەهەردوو دونیا دەیپارێزێ .

(2) بڕوانە لە پەرتوكی (ووشەی دانایان و زانایان) لە نووسینی بەڕێز (سەردار ڕەزا) لاپەڕە٨.

(3) بڕوانە پەرتوكی (مەجلیسی ئەولیا) لەدانراوەكانی مامۆستا مەلا (محمد ی شلماشی) ، بەرگی (١) لاپەڕە ٥٣.

رۆژێك لە پیاسەو گەڕاندا تەماشای کرد کاغەزێك کەوتووە ئینجا هەڵی گرتەوە کە خوێندیەوە نووسرابوو (بِسْمِ اللهِ الـرّحمَنَ الـرّحِيم) بە خوێندنەوەی مووچڕکێکی پێدا هات و دڵی گۆڕا شووشە عەترێکی پێبوو هەمووی بەکاغەزەکە داکرد و زۆر بە حورمەت لە شوێنێکی پاکی دانا ئینجا یەکێك لەپیاو چاکانی بەغدا ئەو شەوە خەوی دیت و لەخەوەکەیدا پێیان گووت بەیانی بچۆ بە (بیشر) بڵێ (طَيّبتَ إسْمنا فَطَيبْناكَ) واتە : خوای گەورە دەفەرموێ تۆ ناوی ئێمەت بۆن خۆش کرد ئێمەش ئەوا تۆمان بۆنخۆش کرد (طَهْرتْ إسْمنَا فَطَهرناكَ فَبعِزَتي لأطيَّبَنَ إسْمكَ في الدُنيا وَالآخرة) واتە : بێگومان تۆ ناوی ئێمەت پاك کردەوە ، ئەوا ئێمەش تۆمان پاك کردەوە ، بە (عیزەت و جەلالی) خۆم قەسەم ناوی تۆ لە دونیا و قیامەت لە ژەنگی گوناح پاك دەکەمەوە[1] .ئینجا پیاوە چاکەکە ئەو خەوەی دی و ڕاپەڕی و گووتی تەماشا چ خەوێکم دی ؟ (بِیشر) پیاوێکی زۆر خراپە چۆن بەو پایە دەگا ؟ کابرا دیسان نووستەوە ، دووبارە عەینەن خەونی دیتەوە ئەو شەوە سێ جار ئەو خەونەی دی ئینجا بەیانی هەستاو چووە ماڵی (بِیشر) و لە دەرگای داو (بِیشر) بەپێی پەتی هاتە دەرەوە ، پیاوەکە کە خەونەکەی بۆ گێڕایەوە ئەوجا ، (بِیشر) زۆر گریاو تۆبەی کردو شەرتی کرد تا ماوە پێڵاو لەپێی نەکاو ڕووی کردە (تاعەت) و خواپەرستی هەروەها بەرەکەت و گەورەیی (بسم الله) و ناوی پیرۆزی خودا گەیشتەئەم مەرتەبەیە گەورەیە .

---

(١) چوونکە دەگێرنەوە ئەم زاتە لە گەنجیەتی ڕوو لە خوا نەبووەو ، تا ئەو کاتەی خوا (هیدایەتی) داو (تۆبەی) کردو گەڕایەوە .

هەزار رەحمەت لەو كەسە بێت ووتویەتی :–

بسم الله كردن قەلاو پالپشتە　　پێناسەی ئاشتی و ئارامی گشتە
خۆدانە دەستی خوای بوونەوەرە　　پەساپۆرتەو بۆ گەشتی بەهەشتە
بسم الله كرد قەلغانەو پتەو　　بەرامبەر دووژمن بەرۆژو بەشەو
پارێزراو دەبێ هەلگری قەلغان　　لەدەست شەیتانی جنۆكەو ئینسان
ئەوەی بسم الله دەكا لەكارێ　　رێزدارە لەلای پەروەردگارێ
سەلامەت دەبێ لە دەست بوونەوەر　　خودا پشتیەتی و دەكا هاوكاری
كێ بەفەرمانی خودا كار نەكا　　كێیە لە ویستی خودا رادەكا
هەموو ملكەچی یاسای خوای بەرزین　　كێ بۆ قیامەت سەفەر بار ناكا
باخات بەناوی خواوە دێتەبەر　　تۆوێك درەختێك رادەگرێ بەسەر
لەخۆلێ و ئاوو میوە هات دێنێ　　بە ئامازەیەك تێدەگا بەشەر
بەناوی خواوە بوون لەكارایە　　ئەو تواناو ووزەی وا لەبارایە
هەر ناوی خوایە ئەم نیعمەتانە　　دەرگای بەهەشتیش هەر بەو والایە
هەرچی ناوی خوای لەسەر براوە　　مۆری باوەری پیادا نراوە
لەبەرەی خێردا كاری بۆ كراوە　　خواش بەرەكەتی تیادا داناوە
خودا خاوەنی گشت بوونەوەرە　　زەرپەو كاكەشان بچووك و گەورە
دەسەلات خوا هێندە رەهایە　　كە بەخەیالی هیچ كەسێ نایە
خاوەنی بوونە ئەو فەرمان رەوایە　　لەكارو مولكیا خۆی بێ هاوتایە

## (تنبيه) واتە بێداری یا ئاگاداری

(قالَ العُلَماءُ يَنْبَغِي لِلْمُؤمِنِ أنْ يَعُودَ لِسَانَهُ فِي إبتِداءِ كُلَ أمرٍ شَرعِي ذِكر (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنَ الرَّحِيم) وفِي آخره الحمدُ للّه رَبِّ العالَمِين حَتى يَجِدَ حَلاوَةَ الإِيْمانِ فِي قلبِهِ ويَحْصِل البَركةَ والسَّعادةَ فِي الدّارين ، وإنما قُلنا فِي ابتداءِ كلّ أمر شرعي إذ قد قيل مَن قالَ عِندَ إبتداء حَرام لِعَيْنه قطعي كالزِّنا وشُرب الخَمر بسم الله يكفرُ)[1] ، واتە : زانايان ئەفەرموون ، پێویستەلەبۆ ئینسانی ئیماندار هەرگیز زوبانی تەڕبێت لەهەمو كارو كردەوەيەكی شەرعی بەناوهێنانی خوای گەورە و بەتايبەتی (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنَ الرَّحِيم) لەياد نەكات لەهەموو كاتێكداو وە لەكۆتايی دا بڵێت سوپاس بۆ خودای پەروەردگاری عالەم تا بەكێشی شیرنايی ئیمان لەناو دڵیداو وە بەرەكەتی بۆ (حاصل) ئەبێت لە دونياو قيامەتدا سەر بەرز دەبێت .

وە هەروەها ئەو (بِسم الله) يەش ئەگوترێ لەهەر كارو كردەوەيەكی شەرعی ، بەڵام هەندێ لە زانايان ئەڵێن ئەگەر ناوی خوا بێنی لە ئەوەڵی كارێكی بێ شەرعی و ناڕەوا لەو كاتەی كە ئيشی بێ شەرمی و حەرام ئەكا ، وەكو داوێن پيسی و عارەق خواردنەوە ئەوجا ناوی خودا بێنێ ئەوا (كافر) ئەبێ (العياذُ بالله). واتە: خوابمانپارێزی لەم كارە نائەموارانە.

---

(1) بروانە : پەرتوكی (مجالس خيريەومفاتيح علميە) لە نووسينی (الحاج محمد خيري بن محمد نظيف) لاپەڕە ٧.

( **پوختەی قسە** )

جا هەروەها بێگومان (زانایانی ئایینی) و عولـەمای شـەرعی ئـەحکامی خەمسەیان بەسەر (بِسم الله) دا جاری کـردووە و فەرموویانـە ... جـاری وا هەیە (بسم الله) کردن (حەرامە) و قەدەغەیە ، وەکو ئەوەی بچی بۆ دزی و (بِسْم الله) بکات و، دەست بۆ ماڵی (حـەرام) درێـژ بکـات و ئـەوجا لەگـەڵ ئەوەشدا (بِسم الله) بکات و بە(إسْتِهْزاء) (واتە گاڵتە و گەمە و قەشمەری).

هەروەها فەرموویانە : جاری وا هەیە (بسم الله) کردن (واجبە و فـەرزە) وەك (مەزهەب) و ڕێبازی زانای گەورە ئیمامی (شـافیعی) ڕەزاو رەحمـەتی خوای لێ بێت) کە دەفەرموێ : لە نوێژدا (بسم الله) ئایەتێکـە لـە سـورەتی (فاتیحا و واجبە) لە هـەموو ڕکحاتێکدا بخوێنـدرێ ، وەهـەروەها کـاتی وا هەیە ووتنی (بسم الله) سونەتە وەك (بسم الله) کردن بۆ (غوسل) و دەسـت نوێژو ئەو جۆرە کارانە ، جاری واش دەبـێ (بـسم الله) کـردن (کەراهـەتی) هەیە و باش نییە جـاری واش هەیـە (موباحـە) و گـووتن و نـەگووتنی وەك یەکە ، وەك لەکاتی گواستنەوەی شتێك لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر .

جـا هـەروەها مامۆسـتا مـەلا محەمـەدی شەڵماشـی لـە ووتـارو ئامۆژگاریەکانی دا[1] خودا پاداشتی خێری بداتەوە ئەفەموێت : گوێ گرینە بەڕاستی ئێمەی ئادەمیزاد لـە دونیـای پـان و بەریندا زۆر عـاجرو -فـەقیرو هەژارو داماوین ، دەیان دوژمنی ئاشکراو نهێنیمان هەیە ، سـەدان تـەنگ و چەڵەمەو بـەڵاو موسیبەت دەورەمـان دەگـرن ، ئەگـەر ئاگامـان لـەخۆمان

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (مەجلیسی ئامۆژگاری) لە نووسینی مامۆستا مەلا محەمەدی شەڵماشی ، لاپەڕە ١٠.

نەبێ و پەنا بۆ ناوی خـوای گـەورە نەبـەین و هـاواری لێ نەکـەین بەڕاست سـەگ و گـورگی نـەفس و شـەیتان و ڕێـوی و چـەقەڵی (حەسـادەت) و بەخاڵەت و دزو درۆزنی (غەیبەت) و بوهتان و چاوی پـیس و چـاو نـەزێری کەوڵمان دەکەن و لە ڕێگەی ڕاست و ژیانی پڕ لە خۆش بەختی و کامەرانی دونیاو قیامەتمان پێ تاڵ دەکەن ناهێڵن بە مەقسەدی خۆمان بگەین :-

ئایەتی (بسم الله) ئاوێنەی لابردنـی ژەنگـی گونـاح و قەسـوەتی قەلبـە سـکەی ڕەواجـی هـەموو (تاعـەت) و عیبادەتێکـە خـەم ڕەوێنـی خـەم و پەژارەیە وەرەقەو پسوولەی هەموو (ئەمرو) فەرمانێکە هـۆی گـرێ کـوێرە کردنـەوەی هـەموو تـەنگ و چـەڵەمەیەکە ، دەگێڕنـەوە کـاتێ حـەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) بوو بە خەلیفەی ئیسلام ، هەروەها (عومەری کوڕی عاصی) کردە ئەمیری (میسر) ئەو ساڵە نەهات بوو چوونکە دەغڵ و دان و خەرمان زۆر کەم بوو گیاوگۆر شین نەبوو بەتایبەتی ئاو زۆر کەم بوو ، ئەوجا(عەمری کوڕی عاص) (خوا لێی ڕازی بێت) پرسـیاری کـردو ووتـی هۆی خراپی و کەمی زراعەت و فەلاَحیەکەتان چی یە ؟ لە وەلاَمدا ووتیان : قوربان تا ئێستا ئیمساڵ نـەبێ (عـادەت) و یاسـامان وابـووە هـەموو سـاڵ کچێکی گەنجی جوانی کچمان بـەڕەزا بـوونی دایـك و بـاوکی خـستۆتە نـاو ئـاوی نیلـەوە ئینجـا هـەروەها (فەیـەزانی) کـردوەو ئـاوی زۆر بـووە و کاسبیمان لەبەردا کردووە.

جا عەمری (کوڕی عاص) فەرمووی : بەڕاستی ئـەوە کردەوەیـەکی بـێ (شەرعی) و جاهیلانەیە ، من بەوە ڕازی نابم ، هات نامەیەکی بۆ خەلیفـەی ئیـسلام نووسـی و نـاردی بـۆ (مەدینـە) و ئـەو کارەسـاتەی تێـدا نووسـی حەزرەتی (عومەر) (ڕەزای خوای لێبێت) کە نامەیەکەی خوێنـدەوە ئینجـا

له وەلآمیدا هەروەکو لەدەقە عەرەبیەکە ئەفەرمویت : (فَكَتَب إليه عمر (رضي الله عنه) بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم ، إلى نيل مصر من عَبْدِالله (عُمر بن الخطاب) أمّا بَعد: (أيّها النيل إن كُنتَ تَجري بِنَفسِك فَلا حَاجةَ بِنا إليك) وإن كُنتَ تَجري بأمر الله تعالى فأجْرِ على (إسم اللهِ)، وأمر أن يُلقِيها في النّيل فَجَرى مِنْ ذلك اليوم وَلَم يتوقَف قَطُّ[1]، واتە: ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) نووسی لە نامەیەکدا بۆ وەلآمی (عەمری کوڕی عاص) بەناوی خوا (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم) بۆ نیلّی (میسر) لەلایەن بەندەی خواوە ،واتە (عومەری کوڕی خەتاب) لەدوای هەندێ ، ئەی ئاوی نیلّ ئەگەر تۆ بەبێ ئەمرو (ئیرادەی) خوا فەیەزان ئەکەی و جاری ئەبی ، ئەوا ئێمە کارمان بەسەرەتەوە نییە ، وە ئەگەر بە (ئەمری) خواش (جاری) ئەبی و (زیاد) دەکەی فەرموو با ئاوەکەت (زیاد) کا ئینجا (ئیمامی عومەر) فەرمووی ،ئەم نامەیەش باوێژنە ناو نیلەوە ئەوجا لەو ڕۆژەی کە ئەو کاغەزەیان هاویشتە ناو نیلەوە ئاوەکەی هەر لە زیادبوون بوو بە (ئەمری) خوا هیچ ڕانەوەستا تا ئەمڕۆکە جا هەروەها مێژوو نووسەکان ئەڵێن لەو کاتەی ئەو وەلآمە گەیشتە (میسر) و ئینجا نامەکەیان خستە ناو ئاوی نیلّەوە ئەوجا بە (ئەمری) خوا ئاوی نیلّ تۆغیانی کردو لآفاو هەڵساو ئاو بۆ دەغڵ و دان زۆر بوو ، هەروەهاش بەهۆی ناوی خواوە ئەو کردەوە خراپەیان لەکۆڵ بۆوە کە (کچی گەنجیان) ئەکردە قوربانی و ئەیانخستە ناو نیلّەوە بەنەزانی و جەهالّەتەوە .

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (مِصْباح القلوب ومفرّج الكَروب) دانراوی (عبدالرحمن مەلا طه عبدالعزيز الدزەیی) بەرگی دووەم، لاپەڕە ٢٧.

## ( چەند سودێك )

پێشەوا (ابو اللّيث السمرقندي) (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئەفەرموێ:

(مَن حَفَظَ سَبعَ كَلمات فَهوَ عندَ الله شريفٌ وعندَ المَلائكة شريفٌ وَغَفرَ اللهُ لَهُ ذنوبَهُ وإن كانَتْ مثل زُبَدِ البَحْرِ وَيَجد حلاوةُ الطاعةِ وتكون حياتُه وَ مَماتُهُ خَيراً لَهُ) واتە : هەر كەسێ ئاگاداری (حەوت) ووشە بكات ئەوا ئەو كەسە لای خوا زۆر بەڕێزە وە لای فریشتەكانیش زۆر بەڕێزە وە خوای گەورە لێی خۆش ئەبێت ئەگەر گوناهەكانی بە ئەندازەی كەفی دەریا بێت (مەبەست گوناهی بچووكە) وە هەروەها شیرناتی (تام و لەزەت) وەر ئەگرێ لە تاعەت و خواپەرستی وە لە دونیاو قیامەت ئەبێتە خێرو چاكە بۆی .

أولّهَا) أن يَقولَ عندَ إبتداءِ كُل شيء بسْمِ الله .

والثاني) أن يقول بَعدَ الفراغ مِن كُل شيء الحَمدُ لله .

والثالث) إذا جرى على لسانهِ لَغو أو عَمل سوءٍ قَلَ أو كَثُرَ يَقول بَعدهُ (أستغفر الله) .

والرابع) إذا أراد أن يقول أفعَلُ غَداً كَذا فَيقولَ عَلى إثْرهِ إن شاءَ الله .

والخامس) إذا إستَقبَلَهُ مَكروه يَقول (لا حَولَ وَلا قوةَ إلا باللهِ العلي العظيم .

والسادس) إذا أصابَتهُ مُصيبَةٌ في النَفس أو في المالِ قَلَ أو كُثر يَقول (إنا للهِ وإنّا إليهِ راجِعُون) .

والسابع) لا يَزالُ يَجري عَلى لِسانه في أنـاء اللّيـل وأطـراف النَهـارِ (لا إلـه إلا الله)[1]

---

(1) بڕوانە : پەرتوكی (تنبيه الغفلين) دانراوی (الشيخ نصر بن محمد بن ابراهيم السمرقندي) تحقيق واتە لێكۆڵینەوەی (سعيد محمود عقيل) لاپەڕە ١٣٨.

یەکەم) واتەپێش هەموو شتێك کە دەست بە هەر ئیش و کارێك بکات بلّیّ (بسم الله) واتە : بەناوی خودا .

دووەم) لەدوای هەر شتێك کۆتایی پێهێناو لێی بۆوە لەم ئیش و کارەدا بلّێت (الحَمدُ لله) واتە : سوپاس و شوکرانەی خوا ئەکەم لەسەر ئەم کارەی کە خوا (فورصەتی) دام .

سێ هەم) واتە ئەگەر بەسەر زوبانی داهات قسەیەکی پڕو پووچ یا ئیشێکی خراپ چ زۆر چ کەم لە پاشان بلّێت (استغفر الله) واتە تۆبەو پەشیمانم لەم کارە .

چوارەم) ئەگەر ویستت بلّێی کارێك ئەکەم بەیانی لەپاشان بلّیّ (إن شاء الله) واتە : ئەگەر خوا حەزبکاو بیەویّ .

پێنجەم) ئەگەر ئیشێکت هاتە پێش پێت ناخۆش بوو (دەتکرهاند) و ڕقت لێی ئەبۆوە بلّیّ (لا حَولَ وَلا قوة إلا بالله) واتە: هیچ هێزو تاقەتێك نییە مەگەر بەخودا نەبیّ خوا چارەسەری نەکاتو ناکرێت.

شەشەم) ئەگەر تووشی بەلآو موسبەتێك هاتی چ لە نەفسی خۆت و چ لە مالّ و سامانت دا زۆر بێت چ کەم بێت بلّیّ (إنا لله وإنّا إليهِ راجِعُون) واتە : ئێمە هی خواین و هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێینەوە .

حەوتەم) پێویستە ئینسانی ئیماندار زیکرو یادی خوا لەبیر نەکات وە بە بەردەوامی لەسەر زارو زوبانی بێت شەوو ڕۆژ ووشەی پیرۆزی (لا إلە إلا الله) واتا : هیچ خوایەك نییە جگە لەو خوایەی کە الله یە وە لەغەیری وی هیچ خوایەکی تر نییە بپەرستریّ مەگەر ئەو زاتە نەبیّ .

## (كۆتايى)

جا هەروەها ئەی خاوەن باوەڕان و موسڵمانە بەڕێزەكان پێویستە ئێمەی ئیماندار خوا لەیاد نەكەین و لە زیكرو (ئەورادەكان) غافڵ نەبین و هەرگیز ناوی خوامان لەبیر نەچێتەوە ، با هەموو كارو كردەوەیەكی چاك و باش ناوی خوای لەسەر بێنین ، با هەمیشە ناوی خوای گەورە بكەینە وێردی سەر زمانمان هەروەها ئەمەش لەیاد خۆمان نەبەینەوە و بزانین خوای گەورە بۆچی لە ئەوەڵی قورئاندا (بسم الله) ی لەهەموو سورەتەكاندا كردووە ما عدا سورەتی (نەمل) نەبێ ، ئەویش هەندێ حیكمەتی تێدا هەیە خوێنەرانی ئازیزەم یەكی لەو (حیكمەتانە) ئەوەیە و .....سەرەتای ئەم سورەتە -وەكو- سورەتەكانی دیكەی قورئان (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم)ی تێدا نیە چونكە لە تووڕەیی و ڕك و قینی خوا بەرامبەر بە (موشریكەكان) باس دەكات، ئینجا هەندێ لە زانایان ئەفەرموون چاك وایە لە باتی (بِسْمِ اللهِ الرّحمن الرّحِيم) ئەم دوعایە بخوێنی و ئەمیش ئەوەیە (أعُوذ باللهِ من النّارِ- وَمِنْ شَرِّ الكُفّارِ- وِمِنْ غَضَبِ الجبّارِ العِزّةُ للهِ وَاحِدِ القَهّارِ).

(وَصَلى الله على سَيِّدنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ و صَحْبِهِ وسَلَمْ-والسّلامٌ عَلَيْكُم وَرَحْمَةُ اللهِ وبَرَكاتهُ)، خوایە بۆ خاتری گەورەیی (بسم الله) عەفومان بكەی لە بەلاّو موسیبەتمان بپارێزی ئامین .

# ئامۆژگاری بیست و هەشتەم

## باسی شەیتان و وەسوەسەی شیتان ئەکات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ما توفيقي والإغتـصامية إلا بـالله ، الحَمْدُ للهِ مَـلءَ سَماواته وَأرضه وأياهُ نَعبُد إذ هوَ المُستَحق للعبوديّة والخضوع لَـهُ واللجـوءِ إليهِ وَنَشكرهُ على إحسانه وأنعامه وَتَكريمه وَنَعوذ به من نَزَعات الـشَيْطان وَ وَساوسه و تمويهه والصلاة والسلام عَلـى عَظـيم الهِمّـة وقـوي العزيمـةِ سَـيّد العالَم وهادي الأمّة سيّدنا مُحَمَد المَخـصُوصِ مِـنْ رَبّ العَـالَمين بكَمـال قُربـه وزِيادةِ مَحَبَته ثُمَ الرضا عَن آله الأطهار وأصحابه الأخيار وأشهَدُ أن لا إله إلا الله الّذي رِضاه في الإجتناب مـن إتبـاع الـشيطان وفي إمتثـال أوامـر الـرّحمن وأشهد أنّ سيّدنا مُحَمداً عَبدُ وَ رَسـولَه الـذّي حـارَبَ الـشيطان وقـارعَ الظُلـمَ والطُغيان أينَما كان) أمّا بعدُ فَيا عِبادَ الله إتقوا الله يا ابـن آدم واحـذروا مـن مكايد الشيطان وأتباعـه فإنـه عـدّو للإنـسان ، واتـه: لـەدوای هەنـدێ ئـەی بەندەکانی خوا پارێزگاری خوا بکەن وە لێی بترسێن ئەی نـەوەی ئـادەم ، وە هــەروەها خۆتــان بپــارێزن لــە وەسوەســەو حیلّــەی شــەیتان وە لــەو کەســانەی کــە لــەدوای هــەنگاوی شــەیتانن ، چــوونکە بێگومــان شــەیتان دوژمنێکی ئاشکراتانە هـەروەکو خـوای گـەورە لـە قورئـان ئەفـەرمێت: ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ﴾ الأعراف: ٢٧، واتـە : ئـەی نـەوەکانی ئادەم وریابن شەیتان نەتان خەڵەتێنێ و فریوتان نەدا و لـە ئـایین وەرتـان

وەرنـەگێڕێ ﴿ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ ﴾[1] واتـە: هـەروەك بـاوك و دایكتانی لە فڕوفێڵێ لە بەهەشت بەدەركردندا) وە هـەروەها لـە جێگایـەكی تریشدا ئەفـەرموێت: ﴿ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٌ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٦٨، واتە : هەرگیز بەشوێن هـەنگاوەكانی شەیتانیـشدا مەڕۆن وە پەیڕەوی لێ مەكەن چوونكە بەڕاستی دوژمنێكی ئاشـكراتانە ، دەسا وریابن فریوتـان نـەدا و نـەتان خاتـە نـاو شـیرك و كـاری حەرامـەوە ﴿ إِنَّمَا يَأۡمُرُكُم بِٱلسُّوٓءِ وَٱلۡفَحۡشَآءِ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٦٩ ، واتە: چوونكە بێگومان ئەو فەرمانتان پێدەدا هەر كاری خراپ و داوێن پیسی و (فەحشا) و (زینا) بكەن ، هەروەها ئەفـەرموێت ﴿ وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٦٩، واتە: ئەو شەیتانە هەر فەرمان بە خراپـەو گونـاهو تـاوان دەكـات وەهـەروەها هانتـان دەدات بـۆ ووتنـی هەنـدێك شـت یـان هەڵبەستنی هەندێك گوفتار بەدەم خواوە بێ ئەوەی بـزانن و ئاگاتـان لێـی هەبێ).

## ( چەند تێبینەیەكی گرنگ )

١) موسـڵمانانی خـاوەن بـاوەڕم ئـەوەی ڕاسـتی بێـت دوژمنایـەتی حەزرەتی ئادەم و نەوەكانی لەگەڵ (ئیبلیس) دا واتە شـەیتان ، هـەر لـەو ڕۆژەوە دەستی پێكرد كە خوای گەورە حـەزرەتی ئـادەمی درووسـت كـرد (صەڵات و سـەلامی خـوای لێبێـت) هـەروەها پـێش ئـەوەی (روحـی) واتـە

---

(1) سورەتی (الأعراف)ئایەتی ٢٧.

گیانی بەبەر بێت ، شەیتان لە دەوری دەسوڕاو دەیگووت (لَئِن سلطتَ علي لأعصيتك وَلَئن سلطت عَليكَ لأهلكنكَ)[1] واتە: دەیگووت ئەگەر زاڵ بویت بەسەرم بەگوێت ناکەم و یاخی ئەبم لێت وە ئەگەر زاڵ بووم بەسەرت ئەوە بێگومان لەناوت ئەبەم و ئەتفەوتێنم) ئەوجا لەپاشان کە ڕوح و گیانی هاتە بەر ئینجا خوای گەورە فەرمانی بە مەلائیکەتەکان واتە فریشتەکان کرد کە سوژدەو کڕنوش بۆ بەرن .

٢) (فریشتەکان سوژدە دەبەن و ئیبلیس یاخی ئەبێ) جا هەروەها خوای گەورە ئەو بەسەرهاتەی حەزرەتی ئادەم و شەیتانمان لە سورەتی (الأعـراف) دا ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَٰكُمْ ﴾ واتە: سوێند بەخوا ئێوەمان (باوکە ئادەم) لە قوڕ درووست کرد﴿ ثُمَّ صَوَّرْنَٰكُمْ ﴾ ، پاشان بەو شکلە جوانەیە وێنەو نیگارمان درووستکرد، ﴿ ثُمَّ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ ﴾ پاشان بە فریشتەکانمان ووت گشتتان کڕنۆشی ڕێز بۆ ئادەم بەرن ﴿ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ لَمْ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١١ ، واتە: هەموو ئەوانیش کڕنۆشیان برد تەنها شەیتان نەبێت ئەو لە ڕێزی کڕنۆش بەران خۆی هەڵاورد چوونکە دەعیەو فیزو خۆ بە زڵ زانینی نەیهێشت﴿ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ

(١) بروانە : تأريخ الطبري ، بەرگی (١) لاپەڕە ٥٨، وە بروانە (البدايه والنهايه) لأبن كثير ، بەرگی (١) لاپەڕە ٨٨.

﴾[1]سوورەتی الأعراف: ١٢ خوا فەرمووی باشە مـن کـە فـەرمانم پێدایت سـوژدە بـەریت بۆئـادەم چ شـتێك ڕێـی لێ گرتیـت ئـەی شـەیتان کڕنـۆش نەبەیت ؟﴿ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ ﴾ سورة الأعراف: ١٢ واتە : شەیتان ووتی لەبەر ئـەوە کـەمن لـەو چـاکترو بـەڕێزترم ، چـۆن دەبـێ (فاضـل) سـوژدە بـۆ (مەفضول)بەرێ ﴿ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ ﴾ واتە: تۆ منت لە ئـاگر درووسـت کـرد، ﴿ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ﴾ وە ئەویشت لە قوڕ درووست کرد لەبەر ئـەوە سـوژدە نابـــەم ﴿ قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴾ سـوورەتی الأعـراف: ١٣واتـە : خـوا فـەرمووی دەی کەواتـە دابـەزەو لـە بەهەشت یان لە ئاسماندا یان لە (پلەو پایەی) بەندایەتی چوونکە تۆ بـۆت نییە لەوێدا فیز بکەیت و خۆت بە گـەورە دابنێیـت جـا هـەتا زووە دەرچـۆ چوونکە بەڕاستی تۆ لە ڕیـسواو بـچوك و بـێ نرخـەکانیت ﴿ قَالَ أَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ

---

(1) بە شێوەیەکی تر هەندێك لە زانایان ئەم ئایەتەیان وا تەفسیر کردووە ،واتە : خودا لێی پرسی چی وای لێکردیت کە فەرمان بەجێ نەهێنیت ئەویش لە وەڵامدا ووتی ، ئاخر من لە ئادەم بە نرخترم منت لە ئاگر درووست کردووە بەڵام ئادەمت لە خاك و خۆڵ درووستکردووە ، ئیتر ئەوەی بیرێك لەمە بکاتەوە کە خاك و خۆڵ جێگایەکە بۆ ژیان بەڵام ئاگر سوتاندن و کاولکردنی بەدواوەیە).. تێبینیەك : هەندێ لەزانایانی (نحو) دەڵێن (لا هنا زائدە زیدت لتأکید الجحد) بەڵام (ابن و جەریر) یش دەڵێ : (إن (ما منعك) مضمن معنى فعل أخر تقديره ما الزمك واضطرك ان لا تسجد إذ أمرتك) ئیبن کثیر دەڵێ (وهذا القول قوي وحسن والله أعلم) بڕوانە تەفسیری (ڕامان لە ماناو مەبەستی قورئان) لە نووسنی ئەحمەد کاکە مەحمود.

﴿ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٤شەیتان ووتی خوایە تا ئەو کاتەی گشت خەڵکان دەمرن و زیندوو ئەکرێنەوە مۆڵەتم بدە﴿ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٥ خواش فەرمووی بێگومان لە مۆڵەتدراوەکانی و تا ڕۆژی زیندوو بوونەوەش هەر دەمێنێت .

بەڵێ خوای گەورە هێشتنەوەی شەیتان هەتا ڕۆژی زیندووبوونەوەی گشت خەڵکی لەبەر (ئبتیلاو) ئیرادەو مەبەستی ئەو (شاە عظیمە) ئەمە بڕیارێکە خۆی دەیزانێ ﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأَقۡعُدَنَّ لَهُمۡ صِرَٰطَكَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٦ ئەوجا شەیتان کەوتە ململانێ و (عینادیە)و ووتی چوونکە گومڕات کردم شەرتبێ ڕێی ڕاستەکەی تۆیان لێ بگرم و بزرکەم).

﴿ ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ وَعَنۡ أَيۡمَٰنِهِمۡ وَعَن شَمَآئِلِهِمۡۖ وَلَا تَجِدُ أَكۡثَرَهُمۡ شَٰكِرِينَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٧پاشان سوێند بەخوا لە بەردەمیانەوە لە پشتیانەوە لەلای ڕاستیانەوە لەلای چەپیانەوە بۆیان دێم و دونیایان لا خۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لا دروست دەکەم و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاس گوزاربن ﴿ قَالَ ٱخۡرُجۡ مِنۡهَا مَذۡءُومٗا مَّدۡحُورٗاۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٨واتە : خوا فەرمووی لەبەهەشت دەرچۆ دەرەوە بەسەرشۆڕی و ڕیسوایی و دەرکراوی سوێند بە خوا ئەو کەسەی شوێنت ئەکەوی بێگومان دڵنیابە دۆزەخ لەخۆت و ئەوانەی دوات ئەکەون پڕ ئەکەم لە تۆڵەی ئەو لاساری و بێ گوێیەدا)

٣) جا هەروەها خاوەن ئیمان و باوەڕان ، بەڕاستی شەیتان دوژمنێکی گەورەی ئێمەیە و خواش لەزۆر شوێن ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە لە وەسوەسەو خراپەی شەیتان،هەروەکو لەم ئایەتەشدا ئەفەرموێت﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّا ﴾ سوورەتی فاطر: ٦ واتە: بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن ، چوونکە بێگومان دوژمنایەتی شەیتان ناڕواو تەواو نابێت چوونکە ئەو وا (حیساب) دەکات کە دەرکردنی ئەو لە بەهەشت هۆیەکەی حەزرەتی ئادەم بوو وە دەبێت تۆڵە لە ئادەم و نەوەکانی بکاتەوە، چوونکە هەروەها شەیتان ئامانجێکی دووری هەیە کە ئەویش ئەوەیە مرۆڤ داخلی دۆزەخ بکات و بێ بەشی بکات لە بەهەشت ، هەروەکو لە دوایی هەمان ئایەتی پێشوودا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾ سوورەتی فاطر: ٦واتە: بێگومان، بانگی تاقم و دارو دەستەی خۆی دەکات بۆ ئەوەی ببنە نیشتەجێی دۆزەخ.

## ٤- ئەی بنیادەم شەیتان نەتان خەڵەتێنێ

جا هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ ﴾[1] سوورەتی الأعراف: ٢٧جا

---

(١) ئەم ئایەتە پیرۆزە لە پێشەوە (تەفسیر) و ماناکراوە و هیچ پێویست بە دووبارە کردنەوە ناکات..

هەروەها لە تەواوی ئایەتەکەدا ئەفەرموێت ﴿ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا ﴾ واتە: جل و بەرگەکەشیان لێ دادەماڵێنێ ﴿ لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ﴾بۆ ئەوەی عەورەتی خۆیان نیشان بداو ببینن (بۆ ئەوەی عەیب و عاریان هەموو دەرکەوێ). بەڵێ دیارە مەبەستی شەیتان تەنهاو تەنها دەرخستنی عەورەت و ئابڕوبردن و سووک کردنی بنیادەمە) جا بەپێویستنی دەزانم ئەم ئامۆژگاریەی خوالێخۆشبوو مامۆستا (ئەحمەد کاکە مەحمود) بخەمە بەرچاوی خوێنەران ، کەوا لە تەفسیرەکەیدا (ڕامان) [1] ئامـاژەی بۆ کردووەو ئەفەرموێت ، بۆیە ئەمڕۆش قوتابیەکانی دەبینین لێرەو لەوێ بـرەوو ڕەواج دەدەن بە داماڵینی (جل و بەرگ) وە هەروەها بەهەموو هێزێکیانەوە بانگهێشتەی ژنان دەکەن بۆ ڕووتکردنەوەو خۆ دەرخستن و تێکەڵ بوون بە پیاوان و هەڵهاتن لە داب و نەریتی ئایینی ئیسلام و شەریعەتەکەی ، بەناوی ژیان و پێشکەوتن و شارستانیەتەوە ، لە پشت ئەوەشەوە مەبەستەکە دیارە و ئاشکرایە کە تێک دان و خراپ کردنی کۆمەڵ و کۆمەڵگایە ، بە ووروژاندنی ئارەزووە جنسیەکان و نەهێشتنی (ئەخلاق و حورمەت و ڕێزی ناموس و بێ غیرەت کردنی مرۆڤەکان لە ئاستی شەرەفیاندا ، ئاشکرایە کە بەرزکردنەوەی ئالآی کۆن و تازە لەلایەن شەیتان و قوتابیەکانیەوە هەر بۆ ئەو مەبەستەیە ، ئەگەرچی ئێستا شێوەو ڕەنگ و دەنگیشی گۆڕابێت ، بەڕاو بۆچوونی من ئەو سوکایەتیە کە ئەمڕۆ بە ئافرەتان دەکرێت لەلای عەلمانیەکانەوە لە تاریخ

---

(1) بڕوانە بۆ تەفسیری ڕامان لەماناو مەبەستی قورئان ، لە نووسینی خوالێخۆشبوو (ئەحمەد کاکە مەحمود) لاپەڕە ٢٦٤.

و له مێژووی کۆن و (جاهیلیەتیشدا) نەبووەو نەکراوە .

٥) خوای گەورە لە سورەتی (یاسین) دا ئەفەرموێت ﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ ﴾ سوورەتی یس: ٦٠واتە : ئەی نەوەکانی ئادەم ئاخر من پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن ، یا ئایە ئێمە لە ڕێگای پێغەمبەرەکانەوە تێمان نەگەیاندن ﴿ أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴾ سوورەتی یس: ٦٠، کە بەندایەتی شەیتان مەکەن و مەیپەرستن بێگومان شەیتان دوژمنێکی گەورەو ئاشکرای ئێوەیە؟ ﴿ وَأَنِ ٱعْبُدُونِى ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾ سوورەتی یس: ٦١واتە : فەرمانمان پێنەکردن کە بەندایەتی من بکەن تەنها من بپەرستن، ئەمە ڕێگای ڕاستی ئایینە، نەك ئەو ڕێگایەی کە شەیتان نیشانتان دەدات ؟ ﴿ وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنكُمْ جِبِلًّا [1] كَثِيرًا ۖ أَفَلَمْ تَكُونُوا۟ تَعْقِلُونَ ﴾ سورة یس: ٦٢واتە: بێگومان شەیتان خەڵكێکی زۆری گومڕاکرد لێتان ، وە ئایە تێناگەن و ژیر نابن ؟)

## ( سەرنجێکی گرنگ )

برا موسڵمانەکان) بەڕاستی لەو ڕۆژەوە کە خودا حەزرەتی ئادەم پێغەمبەری (سەلامی خوای لێبێت) دروست کردو شەیتان (سوجدەی) بۆ نەبردو بەنەعلەت واتە بەنەفرەت کراو هەروەها لە قاپی (رەحمەت) دەرکراو ئینجا بووە دووژمنی بەرەی ئادەمیزاد (لەیل و نەهار)

---

(1)جِبِلًّا : واتا چینێك و نەتەوەیەك.

واته شەوو ڕوژ كارو پیشەی خۆی و دارو دەستەكەی ، وەسوەسەو دوو بەرەكیە لە بەینی بەرەی ئادەمیزاد دا ، بەتایبەتی لە بەینی موسڵمانانداا ، دۆست لەگەڵ دۆست و برا لەگەڵ برا ، ژن و مێرد لێك دەكاتە دووژمن ، حەرام لە پێش چاوی موسڵمانان شیرین دەكاو بنیادەم وا لێدەكات خۆی لەهەموو كەس بە زاناترو داناترو گەورەتر بزانێ ، ڕێگای وا نیشانی ئینسان دەدا (نەخشەی وای بۆ دەكێشێ) ئەگەر خوانەخواستە بە قسەی بكەین زۆری پێ ناچێ (ڕوو ڕەشی دونیاو قیامەت دەبین) جا هەروەها پێویستە چۆن (بەدەن و جسم و لەشت) بەهۆی پزیشك و دەرمان و پارێزەوە لە نەخۆشی و (میكرۆبات) دەپارێزی دەبێ ئاواش گیان و (روحت) لە وەسوەسەو (مەكری) شەیتان بپارێزی بەهۆی (تاعەت) و خوا پەرستی و قورئان خوێندن و دوعاو پاڕانەوە و چاكەكردن شەیتانی (لەعین) لەخۆمان دوور دەخەینەوە ، جا هەروەها پێویستە ئەمەش بزانین ، هەر شەیتانی پەری و ئەجینە دەبنە هۆی لادانی ئینسان لە ڕێگای ڕاست و درووست ، هەروەها ئەبێ ئەوەش بزانین بەڵكو زۆر ئینسانی خراپ و سیفەت شەیتانی هەن كە ڕێگای چەوت و خوارو خراپ نیشانی ئینسان دەدەن و لەسەر ڕێگای ئاین و شەریعەت ئەیترازێنن و لە خشتەی دەبەن ، خوا بەگەورەیی و عەزەمەتی خۆی لەو جۆرە كەسانەمان بپارێزێ ، ئەوجا پەنا بەخوای گەورە دەبەین كە بمانپارێزێ لە فیتنەو ئاژاوەی ئەو جۆرە ئەجنەو ئینسانانە كە خەیاڵ و خەتەرە دەخەنە دڵی بەنی ئادەم و لەسەر ڕێی ڕاستی لای ئەبەن ، بەتایبەتی ئینسانی شەیتان سیفەت كە زەرەرو زیانی بۆ موسڵمانان لە شەیتان زۆرترە ، چوونكە شەیتان بە وەسوەسەو

به نهێنی خەریکە بەڵام ئەم بە ئاشکراو (عەلەنی) لەسەر ڕێت لائەباو گومرات ئەکا ، جا هەر ئەبیّ ئەوەش بزانین (شەیتان) بە (بسم الله) و قورئان خوێندن دوور دەکەوێتەوە ، بەڵام ئەو باشتر نزیك دەبێتەوە کە ئینسانی سیفەت شەیتانە.

### ( ئاگاداریيەك )

خوێنەرە بەڕێزەکانم ، جا چ دەردێك نەبیّ دەرمانێکی نەبیّ خوای پەروەردگار لە کۆتایی سورەتەکانی قورئانی پیرۆزدا ئەم سورەتەی دابەزاندووە کە سورەتی (ناس) ە مرۆڤ فێری ئەوە دەکات کە هەموو کات هەر بە خوای گەورە پەنا بەریّ لەگەڵ ئەوەشدا هەندیّ سیفاتی بۆ باس دەکا و دەڵیّ خۆ (الله) پەروەردگاری هەموو خەڵکانە، پاشای تەواوی هەموو ئینسانە، تاکە (مەعبودو) وپەرستراوی بەحەقی بەندەکانە، ئینسان فێر دەکا کە پەنا بەخوا بگریّ لە زیانی (ئیبلیس) و مرۆڤە لادەرەکان و شاگردەکانیان ئەوانەی کە هەردەم لە چەواشەکردن و فریودانی ئادەمیزادن).

### (باسێك لە پەنابردن بۆلای خوا لە دەست جنۆکەو ئینسانی بەدفەڕ)

جا هەروەها بێگومان خوای گەورە بریّ لە (زات) و (سیفاتەکانی) خۆی لەم سورەتەدا باس دەکاو بۆئەوەی ئینسان باشتر پشتی پیّ ببەستیّ و لە خراپەی (ئینس و جین) ی بەدکار بیپاریّزیّ و لێیان نەترسێت، بۆیە دەفەرموێت (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم) بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان ،

﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ ﴾ سوورەتی الناس: ١، واتە: ئەی موحەمەد (ﷺ) ئەی ئیماندار بڵێ پەنا دەبەمە بەر پەروەردگاری خەڵك ، یان ئەی پێغەمبەر تۆ بڵێ خۆم بە پەروەردگاری ئادەمیزاد دەپارێزم ئەو پەروەردگارەی کە لە نەبوونەوە درووستی کردوونەو هەموو پێویستیەکی ژیانی بۆ ئامادەکردوون بە رێك و پێکی[1]،﴿ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴾ سوورەتی الناس: ٢، واتە: پادشای خەڵکی، ﴿ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ الناس: ٣، پەرستراوی خەڵکی ، ئەم سێ سیفەتە لە پیرۆزی خوایە (ڕەب، مەلیك، ئیلاە) ،﴿ مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ ﴾ سوورەتی الناس: ٤ واتە لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵ دەخاتە دڵەوە کە خەناسە[2]،﴿ ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴾ سوورەتی الناس: ٥، بریتیە لەوەی کە (وەسوەسە) فرێدەداتە سینەو دڵ و دەروونی خەڵکیەوە ، ﴿ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴾ الناس: ٦واتە : لە پەری و خەڵکی و لە جنۆکەو ئادەمیزاد (ئەوانەیان کە شەیتان سیفەتن ، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (الأنعام) دا ئەفەرموێت ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗا ﴾ سوورەتی الأنعام: ١١٢واتە : هەر بەم شێوەیە، کێشمەکێشی

---

(١) بڕوانە : (التفسير الكبير) دانراوی پێشەوا (فخرالدين الرازي) بەرگی (١) لاپەڕە ٣٧٦.

(2)ٱلۡخَنَّاسِ : واتە بزردەبێ چونکە کە هەر ناوی خوا براو یادی کرا ، ئەوە خۆی پەنهان دەکاو بزردەبێ .

ئیمانـداران و خواناسـان بەردەوامـە ، جـا بـۆ هـەموو پێغەمبـەرێك (بـۆ ئیماندارانیش) دوژمنێکیان لە شەیتانەکانی ئـادەمیزاد و پـەری سـازاندووە کە بەردەوام قسەی زل و ڕازاوە دەدەن بە گوێی یەکداو (خۆیان و خەڵکی) پێ سەرگەردان و گومڕا دەکەن .

جا هەروەها (ڕیوایەت) کراوە لە (ئەبو زەڕی غەفاری) (خـوا لێـی ڕازی بێت) ئەڵێ جارێـك چـووم مزگـەوت و ئـەبینم پێغەمبـەر (ﷺ) تەشـریفی لەوێیە پاشان دانیشتم و فەرمووی (يا أبا ذَرّ هَلْ صَلَيْتَ) واتە : ئەی ئـەبوو زەڕ نوێژی (تحية المسجد) ت کردووە ؟ ووتم نـا ، فـەرمووی : (قُـم فَـصلِ) واتە : هەر ئێستا هەستەو نوێژەکـەت بکـە، منـیش هەسـتام و نوێـژم کـرد ئەوجا پاشان فەرمووی (تَعوّذُ مِن شرِّ شياطين الإنْـس والجِـنِ) رواه أحمـد، واتە : لە شەڕی شەیتانی ئادەمی و جینـی پەنابـەرە بـە خـوا (ئـەبوو زەڕ ئەڵێ گووتم : باشە شەیتانی ئادەمیش هەیە ؟ فەرمووی بەڵێ هەیە).

**(تێبینی)**

جا هەروەها ئەم سورەتە فێری ئەوەمان دەکات کـە هـەموو کـات پـەنا بەرینە بەر خوای گەورەو لە هەموو ئیش و کارەکاندا وە خۆمـان بپارێزین لەوانـەی دەیانـەوێ بـە قـسەی لـووس و بـێ مانـا لـە خـشتەمان بـەرن ، بەتایبەت لە ئادەمیە (شەیتان و شەیتان کارەکان خـۆ بێگومانـە کـە گـەلێ کەس هەیە لە دێو (عفریت) و جنۆکەکان زۆر خراپترە و زیانی گەورەترە ، چوونکە شەیتانیش لەناو دەمارەکانی ئینسان هاتووچۆ دەکات وەك خوێن ، چۆن لەناو دەمارەکانی ئینـسان هاتوچـۆ دەکـات ، هـەروەکو پێغەمبـەر

(ﷺ) خەبەری داوە بۆیە پێویستە (موسڵمانان) هەمیشە وریابن و ئاگایان لەخۆ بێ و شەیتان فریویان نەدات ...).

جا خوایە بە میهرەبانی خۆت بمانپارێزە لە شەڕی شەیتان و نەفس لە پیلآنی جنۆکەو لە ئینسانی ناپاك و بەدخو و خراپەكان بمانپارێزە وە لەسەر ئایینەكەی خۆت دامەزراومان بكە .

## ( تنبیه – ئاگاداری )

عَن عائشة (رضي الله عنها) قالَتْ: (كانَ رَسُول الله (ﷺ) إذا أوى إلى فراشه جَمَعَ كَفيه وَنَفثَ فيهما وَقَرأ ﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ وَالمَوْعُذَتيْن ثُمَ مَسَحَ بِهُما ما إستطاع مِن جَسَده يبدأ برأسه وَوَجههُ وما أقبلَ من جَسده يَفعَلُ ذلك ثلاثاً) رواه أهل السُّنن ، واته : خاتوو عائیشه خوا لێی ڕازی بێت ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) هەموو شەوێ كە دەچووە جێگای خەو بۆ نووستنی ئینجا سێ جاران سورەتی﴿ قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴾ ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ ﴿ قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ ی دەخوێندەوە ئینجا فووی بەهەموو دەستیا دەكردو بەهەموو ئەندامەكانی لاشەیدا دەیهێناو بەتایبەت دەم و چاوی وە سەرجەم جێگایەكی دی كەدەستی پێی دەگەیشت .

## ( سونەتێكی گەورەیە بەر لە قورئان خوێندن – أعوذ باللە – ی بكەن )

جا هەروەها ووتنی ووشەی (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) كە ئەو ووشەیە (ئایەتێك) نییە لە قورئانی پیرۆز وە ئایەتێكیش نیە لە سورەتی فاتیحە

وەکو (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحِيم) بەلاّم خوای مەزن فەرموویەتی ﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ ﴾ سوورەتی النحل: ٩٨ جا هەر کە ویستت قورئان بخوێنی دەورت کـردەوە ﴿ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ سـوورەتی النحـل: ٩٨ ، واتە : پەنا بگرە بەخوا لە شەیتانی نەفرەت لێکراو ، .... بـەر لـەوە (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) بکەو هەر بەخوا پەنابەرە لە پیلاّن و (وەسوەسـەی) شەیتان دوورەوە خراو، هەتا نەتوانی لـە ووردبونـەوە لـە مانـاو مەبەسـتی قورئان ڕێت لێبگرێت، جا حـەزرەت (ﷺ) فـەرمانی داوە، کـە هـەر کـەس بیەوێت قورئان بخوێنێت لە پێشدا بلێت (أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ) [(١)].

واتە: خۆم ئەپارێزم بە خوا لە شەیتانی دەرکراو – دوورخـراو جـا هـەر کەسێ دەست بە قورئان خوێنـدن بکـات سـوونەتە لەپێـشدا ئـەو ووشـەیە بخوێنێ ، وە جیاوازی نییە خوێندنی قورئان لە نوێژدا بێت ، یان لە نوێژدا نەبێت ، وەلەلای هەندێ لە زانایان خوێندنی ئەم ووشـەیە لـەپێش قورئـان خوێندندا لـە نوێـژو لـە دەرەوەی نوێـژدا (فـەرزەو واجبـە)، بـەلاّم ئـەوەی ڕاستی بێت (جەماوەری زاناکان) دەڵێن بەر لە دەسـت کردنـی بـە قورئـان خوێندن سوننەتە (أعوذ بالله) بکرێ ، چوونکە بـاری ئـەوەی کـە سـوونەت بێت بەهێزترە، (ڕەحمەت) لەو کەسەی کە گووتوویەتی :

---

(١) بۆیە خوا ناوی شەیتانی بە ڕەجیم بردووە چوونکە (ڕەجیم) بە مانا دەرکراوو – دورخراوە ، واتە هەر کەس ڕوو لە بێ فەرمانی خوا بکات وە خەڵك لەڕێگە ئایینی خوا دوورخاتەوە ، ئەوە بە شەیتان ناوبراوەو (العیاذ بالله) .

جا أعوذ سوننەتە پێش خوێندنی ساڵە هەر جێگایەبێ دەست پێکردنی
بەڵام بسم الله لەپێش سورەتا واجیبە ئەمما لە ناوەند سونەتە
بەس لە سورەی تەوبە بسم الله نیە چ لەناوەند چ لەپێش هیچ نییە[1].

## ( چەند ئاگادارییەك )

هەروەها ئیمانداران و خاوەن باوەڕان پێویستە ئێمە ئاگاداربین و هەشیاربینەوە کە شەیتان دوژمنی ئێمەیە وە قەت نابێت بە دۆست ، جا ئێوەش بە دوژمنی بزانن و دۆستایەتی مەکەن وە لێی دوور بکەونەوە ، هەروەکو خوای گەورە ئێمەی ئاگادار کردۆتەوە لە زۆربەی ئایەتەکانی قورئان ، ئێمەی هەشیار کردۆتەوە چوونکە (شەیتان) خەڵك بێ باوەڕو (کافر) دەکات .

١) یەکێك لەم ئایەتانە ئەمەیە کە ئەفەرموێت: ﴿ كَمَثَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِذْ قَالَ لِلْإِنسَٰنِ ٱكْفُرْ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّنكَ إِنِّىٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سوورەتی الحشر: ١٦، وە موفەسیرەکان ئەفەرموون (نێوانی دووڕووەکان لەگەڵ جووەکان) وەك شەیتان وایە کە هانی ئادەمیزاد دەدات لە ڕێی (خەیاڵ و وەسوەسەوە) پێی دەڵێت وەرە (کافر) بە بە جوانکردنی هەموو جۆرە تاوانێك کە خوا پێی ناخۆشە ، جا کاتێك کە (کافر) بوو واتە (ئەو کارانەی ئەنجامدا کە شەیتان پێی ڕازییە ، پێی دەڵێ

---

(1) بڕوانە (وانەی کورد زوبان بۆ تەجویدی قورئان) لە نووسینی خوالێخۆش بوو ، مامۆستا (محمد شیخ طه بالیسانی) لاپەڕە ١١٣.

بەڕاستی من بەریم لە تۆ من لە پەروەردگاری جیهانیان دەترسم .

٢) ئەگەر شەیتان توانای نەبوو (کافریان) بکات ئەوا تووشی تاوان و گوناهیان دەکات و ئاژاوەو کێشە دەنێتەوە لەنێوان موسڵمانان هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ سوورەتی المائدة: ٩١، واتە : بڕاستی (شەیتان) هەر دەیەوێت لە ڕێگای (عەرەق) و (قومار)ەوە دوژمنایەتی و بوغزو کینە بخاتە نێوانتانەوەو لە یادی خواو لە نوێژکردن ڕێتان لێ بگرێ و وەرتان گێڕێ ئەدی کەینێ بەخەبەر دێن و دەست هەڵدەگرن؟).

٣) خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٠٢، واتە: بەڵام شەیتانەکان (کافر) بوون جادوویان فێری خەڵك ئەکرد.

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان شەیتانی (مەڵعون) بەوە ناوەستێت خەڵك (کافر) بکات و تووشی تاوان و گوناحیان بکات بەڵکو خەڵك لەکاری چاکەش دوور دەخاتەوە ، وە عیبادەت و خواپەرستیان لێ تێك دەدات ، بۆ ئەوەی خێرو پاداشتیان پێ نەگات ، هەروەکو ئەو (صەحابیەی) هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) ووتی : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) شەیتان نوێژی لێ تێك داوم کە دەستم پێکرد نوێژەکەم لێ تێك دەدات ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (ذَلِكَ الشَّيْطانُ

يُقال لَهُ (خِنزب) فإذا أحْسَسْتهُ (فتعوّذ باللهِ منْهُ) واتفل على يسارك (ثلاثاً) فَعَلتُ ذَلِكَ فأذهبَهُ الله عَني) رواه مسلم، واته : ئەم شەيتانە ناوى (خينزەبە) ئەگەر هەستت كرد نوێژەكەى لێ تێك داى سێ جار تف ڕوو كە لەلاى چەپت و بەنەعلەتى بكەو ئينجا بڵێ خوايە خۆم بەتۆ دەپارێزم ، وام كردو خودا (دەفعى) كرد.

خوايە بە (لطف) و كەرەمى خۆت عەفوومان كەى، خوايە لە شەڕى (نەفس) و شەيتان بمانپارێزى خوايە ڕووڕەش و شەرمەزارمان نەكەى، خوايە خەجاڵەتى دنيا و قيامەتمان نەكەى، خوايە لە بەلاّ و موسيبەتى دنيا و قيامەت بمانپارێزى ئامين، (وصلى الله على سيّدنا مُحَمَدِ وعَلى آلهِ أصْحابِهِ وأتْباعهِ أجْمَعين).

نبهني الله وإياكم نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لواء نبي المرسلين

# ئامۆژگاری بیست و نۆهەم

## باسی فەزلْ و گەورەیی زیكری خوا ئەكات

الَحمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ما توفيقي والإعتصامية عليه توكلت وإليهِ أنيب ، الحَمدُ لله ربِ العالمين أمر بذكره في كُل الأوقات في اللّيل والنّهار ، وفي الجَهرِ والأسرار ، خاصةً و خصوصاً بَعدَ الصلوات والأدبار ، وَأشهد أن لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ شهادة أرجو بها النَجاة وَأشهَدُ أنّ سيدنا مُحمداً عَبدهُ وَ رَسولَه أعلم النّاسِ بأذكار اللهِ ، وَلَهُ المَثل الأعلى في أذكاره وَفي إستغفاره عَمَلاً بقوله (صلى الله عليه وسلم) حيث قال (أستغفر الله ، سبحان الله، والحَمدُ لله وَلا إله إلا الله وَ الله أكبَر ، وَلا حَولَ وَ لا قوة إلا بالله العلي العظيم) والصلاة والسَلام عَليهِ وَعَلى ألهِ وأصحابه وسلم تَسليماً كثيراً ما تعاقَبَت الأوقات ، أما بَعدُ أيّها النّاس أتَقوا الله تعالى وأعلمُوا أن الله أمركم بالإكثار من ذكرهِ ، فَقالَ سُبْحانهُ وتَعالى)، واتە لەدوای هەندێ ئەی خەڵكینە تەواو پارێزگاری خوای تەبارەك و تەعالا بكەن وە هەر لەو بترسێن ، وە هەروەها بزانن كە بەڕاستی فەرمانتان پێ دەكات ، بەزۆری یادو زیكری خوای تەبارەك و تەعالا بكەن ، هەروەكو لە قورئاندا فەرموویەتی : ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴾ سوورەتی الأحزاب: ٤١

واتە : ئەی ئەو كەسانەی ئیمان و بڕواتان هێناوە یادی خوا بكەن یادێكی زۆر واتە بێ حەدو سنوور یادی خوا بكەن ﴿ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴾ سورة الأحزاب: ٤٢،وە هەموو بەیانی و ئێوارەیەك خوا بەپاك و خاوێن

ڕابگرن و هەردەم (سبحان الله بڵێن) جا هەروەها بێگومان ئەوەندە زیکرو یاد کردن بەلای خواوە سەنگینە هەر کەسێ (زیکری) بکا ئەویش (زیکری) ئەو کەسە ئەکات، چوونکە فەرمان ئەدا بەسەر بەندەکانیا (زیکر) و یادی ئەو بکەن ئەویش یادیان بکات ، هەروەکو خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ﴾ ، واتە: دەی کەواتە ئەی ئیمانداران ئەگەر یادی من بکەن منیش یادی ئێوە ئەکەم پاداشتان بە چاکە دەدەمەوە ، ﴿ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴾ سووروەتی البقرة: ١٥٢وەدەبێ هەر سوپاسی من بکەن و لە نازو نیعمەتەکان حاشا مەکەن هەرگیز ناسوپاسم مەکەن، واتە : سوپاسگوزاری من بن و سوپاس ناپەزێرو سپڵەیی بەرامبەرم مەکەن).

جا هەروەها ئەوانەی کە زیکری زۆر ئەکەن لە پیاوان و ئافرەتان ، خوای گەورە چاوپۆشی گوناهو پاداشتێکی گەورەی بۆ ئامادەکردوون ، هەروەها خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت ﴿ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ سووروەتی الأحزاب: ٣٥، واتە : ئەو پیاوو ئافرەتە ئیماندارانەی کە زۆر فیکرو یادی خوای گەورە دەکەن و هەمیشە زارو دەمیان بە زیکرو یادی خوای گەورە تەڕو پاراوە ، خوای گەورە لە دوارۆژدا خێر و پاداشت و لێخۆشبوونێکی زۆر گەورەو فراوانی بۆ حازرو ئامادکردوون).

وە هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (الأعراف) دا ئەفەرموێت ﴿

﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ [1] وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ﴾ سوورەتی الأعراف: ٢٠٥، واتە: یادی پەروەردگارت لە دڵو دەروونی خۆتدا بە لالآنەوەو ترسەوە بکەو بیّ دەنگ بەرزکردنەوە ، لەنێوان چپەو ئاشکرادا) بەیانیان و دەمەو ئێواران. قەت لەیادو زیکری خوا غافڵ واتە بیّ ئاگا مەبە وەکو ئەو کەسانەی کە لەخوا بیّ ئاگان.

## (ئاگادارییەکی گرنگ)

جا هەروەها خاوەن باوەڕان شایەنی باسە خوای گەورە لەچەند فەرموودەیەکی (قودسیدا) پیشانمان ئەداو پێمان ڕائەگەیەنیّ کە ئەگەر (عەبد) و بەندەی خۆی بیر لە سۆزو بەزەیی خوا بکاتەوە و خواش هەر بەم شێوەیە لەگەڵیا ئەجولێتەوە ، واتە : هەر کەسیّ هەستی وابوو کە خوا پاڕانەوەی لیّ وەرئەگریّ ئەوا لێی وەرئەگریّ وە هەر کەسیّ داوای چاوپۆشین لەخوا بکە هەروەها بەتەمابیّ چاوپۆشینی لیّ بکریّ ، ئەوا خوای گەورە چاوپۆشینی لیّ ئەکاو ، وە هەر کاتیّ زیکری خوا بکا خوا وا لەگەڵیا ، جا هەروەها ئەگەر (بەندە) لە دڵی خۆیدا یادی خوا بکا ، خواش لەلای خۆی یادی ئەو ئەکا ، وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یادی بکا ئەوە خواش لەناو کۆمەڵێکی لەو چاکتردا یادی ئەو ئەکا خۆ هەتا بەندە زیاتر

---

(١) وَخِيفَةً : واتە نهێنی (ٱلۡجَهۡرِ) واتە: ئاشکرا (بِٱلۡغُدُوِّ)واتە : کاتی بەیانیان ، (وَٱلۡأٓصَالِ) کاتی ئێواران.

لەخوا نزیك بێتەوە خوای گەورە زیاترو خێراتر و چاکتر لێی نزیك ئەبێتەوە ، جا فەرموو لەگەڵ ئەم چەند حەدیسە قودسیە[1]: (عن معاذ (رضي الله عنه) قالَ قالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم) قال الله تعالى : ﴿ لا يَذكرني عبدٌ في نفسهِ إلا ذكرتهُ في مَلاء من ملائكتي وَلايَذْكُرني في مَلأ إلا ذكرتُهُ في الرفيق الأعلى﴾ ، واتە : معاذ (خوا لێی ڕازیبێت) ئەڵێ : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : خوای گەورە فەرموویەتی (هیچ بەندەیەك نییە کە لە دڵی خۆیدا (زیکرم) بکات ئیلە لەناو کۆمەڵێك لە فریشتەکانمدا (زیکرو باسی دەکەم) وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکیشدا باسی کردم و ناوی هێنام ئەوا منیش لە (الرفیق الاعلی) [2] باسی دەکەم.

عَن إبن عَباس (رضي الله عَنْهُمَا) قَالَ : قـالَ رَسـول الله (صلى الله عليه وسلم) قالَ الله تعالى : ﴿عَبْدي إذا ذَكَرتَني خالياً ذكرتُك خالياً وإن ذكرتني في ملأٍ ذكرتُك في ملأٍ منهُم وأكبر ﴾ حديث صحيح ، واتە : ئيبن و عەباس (خوایان لێ ڕازیبێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ، خوای گەورەش فەرموویەتی ئەی بەندەی من ئەگەر تۆ لە جێگایەکی چۆڵدا (زیکرت) کردم ئەوا من لە تەنهایی خۆمدا ناوت ئەهێنم و ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا زیکرو باست کردم ئەوا من لەناو کۆمەڵێکی باشترو گەورەتر لەواندا منیش باست دەکەم و ناوت دەهێنم).

---

(1) بڕوانە : پەرتوکی (موسوعة الاحاديث القدسية) لە کۆکردنەوەی بەڕێز (عادل بن سعد) بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٤٣٣.

(2) الرفیق الاعلی : واتە جێگای پێغەمبەران و دۆستانی خوایە ، خوای گەورە بە نسیبمان بکات ئامین .

عَن أنس (رضي الله عَنهُ) قال : قالَ رسـول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) قـالَ الله تعـالى: ﴿ يـا إبـن آدم إن ذكـرتَني في نَفسِكَ ذكرتُـكَ في نَفـسي وإن ذكرتني في ملأٍ ذكرتُكَ في ملأٍ خيرٌ منهُم وإن دَنَوتَ مني شبراً دَنَوُت مِنكَ ذراعاً وإن دَنَوتَ مِني ذراعاً دَنوتُ مِنكَ باعاً وإن أتيتَني تَمْشي أتيتُ أُهَرولُ﴾ [1]، واته : ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : خوای گەورە دەفەرموێت : (ئەی بەنی ئادەم ئەگەر لەدڵی خۆتدا زیکرو یادم بکەی من لەلای خۆم یادت دەکەم وە ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا زیکرو باسم بکەیت ، لەناو کۆمەڵێکی چاکتر (وەکو لەناو فریشتەکان) باست دەکەم ، هەروەها ، ئەگەر بستێك لێم نزیك ببیتەوە من باڵێك لێت نزیك دەبمەوە ، وە ئەگەر باڵێك لێم نزیك ببیتەوە من باوشێك لێت نزیك دەبمەوە ، وە ئەگەر بە ڕۆیشتن بەرەو من هاتیت ، من بەڕاکردن بەرەو تۆ دێم ، هەروەها ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە کتێبی (الأذكار) دا ئەڵێ (زیکر) ڕێبازی ڕزگاریەو وە هەروەها ڕزگاربوونە لە سزای سەختی قیامەت (خوا پەنامان بدات).

(ما عَمَلَ أدميٌ عَمَلاً أنجى الله لَـهُ مِـن عَـذابِ الله مِـن ذِكـرِ الله) [2] واتـه : مرۆڤی ئادەمی هیچ کارێکی نەکردووە کە باشتر لە سزاو ناخۆشی خوا (کە دێتە پێشی) ڕزگاری بکات هێندەی زیکری خوای گەورە کە ڕزگاری دەکات

---

(1) بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(2) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

**( چەند فائیدەیەك )**

جا هەروەها (ڕیوایەت) کراوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا بەچەند (صەحابیەکی) خۆی فەرمووە (ألا أنبئُكم بخَير أعْمالِكُم وَ أزكاها عِندَ مَليككم وأرفعُها في درجاتكم وَخَيرٍ لَكُم مِن أنفاق الّذهب وَالوَرَق وخير لَكُم من أن تَلقوا عَدوكَم فتَضربُوا أعناقَهُم وَيَضربوا أعناقَكُم ؟ قالوا بَلى يا رسول الله ، قالَ ذكرُ الله [1]، واتە : ئایە خەبەرتان بدەمێ بە چاکترین و پاکترین کردەوەکانتان بەلای پەروەردگارەوە کە زیاتر پلەو پایەتان بەرز کاتەوە و چاکتر بێت بۆتان لە (خەرج) کردنی زێڕو زیو و وپارەو پول وە چاکتر بێت بۆتان لە گەیشتنتان بە دوژمنتان و ئێوە بدەن لە گەردنی ئەوان و ئەوانیش بدەن لە گەردنی ئێوە ؟ ووتیان : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی زیکرو یادی خوا .

هەروەها دیسان پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أن ما تَذكرونَ مِن جَلال الله عَز وَجَل مِن التَهليل وَالتَكبير وَالتَمجيد) يتَعاطفنَ حَولَ العَرشِ لَهُن دَويٌ كدوي النحلِ يذكرونَ بصاحبهن أفَلا يُحِبُ أحَدُكم أن يَكونَ لَهُ ما يُذكر بهِ؟) رواه أحمد وغيرها.واتە: بێگومان ئەیخاتە بەرچاوی ئیمانداران خوای گەورە کەوا ئەو زیکرو یادەی پەروەردگار (لا إله إلا الله) و (الله أكبر) و (الحمد لله) کە ئەی کەن بەدەوری عەرشی خوادا دەسوڕێتەوە بە وێنەی دەنگی پوورەی مێش هەنگ دێت و یادی خاوەنەکەی دەکات ، دوای ئەوە بەشێوەی پرسیارێکی هاندەر بۆ دەستخستنی ئەو چاکە گەورەو قازانجە

---

(1) رواه الترمذي وأحمد والحاكم ، وقال صحيح الاسناد

ئاسانه ئەپرسێ جا ئایا هەرەیەکێکتان حەز ناکات یادگەرێکی هەبێ[1]؟

**( بەهەرشێوەیەك زیکری خوا بکەی درووستە )**

هەروەها بێگومان خوای مەزن لە سورەتی (النساء) دا ئەفەرموێت : ﴿ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ﴾ سوورەتی النساء: ١٠٣، واتە: جا کاتێك لەنوێژ بوونەوە ئەوا یادی خوا بکەن (زیکر) بەپێوەبوون یان بەدانیشتنەوە یان بەراکشانەوە(یا بەهەر جۆرێك بۆتان گونجا) چوونکە بەڕاستی ئەوانەی یادو زیکری پەروەردگار بکەن تەنها ئەوان سوود مەند ئەبن بە بەڵگەکانی قودرەتی خوا بەئایەتەکانی گەردوون و جیهان باوەڕیان (زیاد) دەکات هەروەها ئەوانن خاوەنی ژیری (کامڵ) هەروەکو خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ ﴾سوورەتی آل عمران: ١٩٠ – ١٩١، واتە: بەڕاستی لە درووست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا وە لە ئاڵوگۆڕی شەوو ڕۆژدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند ، ئەوانەی یادو زیکری خوا دەکەن لە کاتێکدا کە بەپێوەن یان دانیشتوون یان بە ڕاکشانەوەن (لەهیچ حالەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن) (بزانن) بەزیکرو یادی خودا بەسەر دوژمنان زاڵ ئەبن

(1) بڕوانە پەرتوکی (زیکری خواناسان) لە نووسینی مامۆستا (حبیب محمد سعید) لاپەڕە ٦٢، لەگەڵ دەستکاری .

چوونکه بێگومان زۆر زیکر کردن لەکاتی (ساحەو مەیدانی) دوژمنـانی خـوا و ئیسلام و مرۆڤایەتیدا وا دەکات باوەڕداران دامەزراوو خۆگرو سەرکەوتوو بن لەجەنگ و ململانێدا هەروەك خوای گەورە لە قورئان دەفەرموێت ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمۡ فِئَةٗ فَٱثۡبُتُواْ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾ سوورەتی الأنفال: ٤٥، واتە : ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کاتێك دەگەنە دەستەیەك و ڕووبەڕووتان دەبنەوە لە (دوژمنانی ئیسلام) ئەوە دەبێ ئێوە خۆڕاگربن و سەنگەر چۆڵ نەکەن و زۆر زیکری خوا بکەن و لێی بپاڕێنەوە بۆئەوەی ئێوە سەرفرازو سەرکەوتوبن .

**( تێبینی )**

جا هەروەها بێگومان زیکرو یادی خوا سەرخەری باوەڕداران و شکێنەری زاڵمان لە مەیداندا هەمیشە یەکێك بووە لە ئاراستەکانی قورئان بۆ کۆمەڵی موسڵمانان و نەبێت هەر بەردەوام بێت تا دواڕۆژ دەستی لێ بەرنەدەن و ئاگایان لەو (حەبڵە قایم) و نەپچڕاوەی خوای مەزن بێت .

**( یاساو مەبەستی زیکرکردن )**

جا بێگومان مەبەست لە زیکرو یادی پەروەردگار پاك کردنەوەی دڵ و دەروون و بێدار کردنەوەی ویژدانە ، ئەوتا ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان ئەدا بەسەر پێغەمبەر و موسڵماناندا تا نوێژ بەجێ بگەیەنن چوونکە نوێژ موسڵمانان لە خراپە و تاوان و کرداری نەشیاو دوور ئەخاتەوە ، وە

هەروەها زیکریش ، جا خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ﴾سوورەتی العنكبوت: ٤٥، بەڵێ ئەم ئایەتە پیرۆزە وا ئەگەیەنێ دەری ئەبڕێ زیکری خوا زیاتر لە نوێژ موسڵمان لە خراپەکاری ناهەموار دوور ئەخاتەوە ، چوونکە ئەو کەسەی زیکر ئەکا کاتێ ڕووی دڵ و دەروونی بەچاکی ئەکاتە خوای گەورە زمانیشی خەریکی یادکردنەوەی ئەبێت خوای گەورە نوورو ڕووناکی خۆی پێشکەش ئەکا بەشێوەیەك ئیمان و یەقینی زیادو بەهێز ئەکا ، دڵی بەناسین و زانینی ڕاستی ئەگەشێتەوە و ئەحەسێتەوە ، بەڵێ یادی پەروەردگار مایەی حەسانەوەو پشودانی دڵە چوونکە (زیکری) خوای گەورە مایەی دڵ ئارامی و (سوکنایی) گیان و دامەزراوی باوەڕو کامەرانی هەردوو ژیانە ئەوجا هەروەها ئەوەتا قورئانی پیرۆز باسی حەسانەوەی دڵی ئیمانداران ئەکات کە بە زیکری خوا دەستیان ئەکەوێت ، هەروەکو ئەفـــــەرموێت ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴾ سوورەتی الرعد: ٢٨، واتە : ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو وە دڵ و دەرونیان ئارام دەبێت بە زیکرو پەیامی خوای پەروەردگار وە ئاگاداربن دڵەکان هەر بەیادی خواو قورئان خۆشنوود دەبن و ئارام و حەواە دەبن).

هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (أنفال) دا ئەفەرموەێت ﴿ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ

إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ سووره‌تی الأنفال: ٢، واته : بێگومان ئیمانداران ڕاسته‌قینه ته‌نها ئه‌وانه‌ن كه كاتێك ناوی خوا برا ئه‌وا دڵه‌كانیان ده‌ترسێت و ده‌هه‌ژێت كاتێكیش ئایه‌ت و فه‌رمانه‌كانی ئێمه‌یان به‌سه‌ردا بخوێندرێته‌وه ئه‌وا ئیمان و باوه‌ڕیان زیاد ده‌كات وه هه‌ر پشت به خوای په‌روه‌ردگار ده‌به‌ستن).

جا هه‌روه‌ها له سوره‌تی (الزمر) دائه‌فه‌رموێت : ﴿ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ ﴾ سووره‌تی الزمر: ٢٣، واته : به ڕاستی ته‌زوو و موچڕك دێت به گیان و پێستی ئه‌و كه‌سانه‌دا كه ترسی په‌روه‌ردگاریان له دڵ و ده‌روون دا هه‌یه پاشان گیان و پێست و دڵیان نه‌رم و ئاماده و چالاك ده‌بێت بۆیادی زیكری خواو خوا په‌رستی جا هه‌روه‌ها بێگومان خوای گه‌وره فه‌رمان به پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌كات كه سه‌برو ئارام بگرێت له‌گه‌ڵ ئه‌و خاوه‌ن دڵانه‌ی كه پڕن له (زیكرو یادی) خواوه ، وه‌كو ئه‌فه‌رموێت : ﴿ وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ ﴾ سووره‌تی الكهف: ٢٨، واته : (صه‌بر) و ئارام بگره ئه‌ی محه‌مه‌د (ﷺ) خۆت ڕابگره له‌گه‌ڵ ئه‌و كه‌سانه‌دا كه خواپه‌رستی ده‌كه‌ن و یادی په‌روه‌ردگاریان وێردی سه‌رزاریانه له به‌ره‌به‌یان و ده‌مه‌و ئێواراندا مه‌به‌ستیانه‌و ده‌یانه‌وێت كه ئه‌و زاته له‌خۆیان ڕازی بكه‌ن و (ڕوو له‌وانه وه‌رمه‌گێڕه) (عَن أبي موسى الأشعري رَضي الله عَنْهُ)، واته : له ئه‌بو موسای ئه‌شعه‌ریه‌وه (خوا لێی ڕازی بێت) ئه‌ڵێ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی : (مَثَلُ الَذي يَذكرُ رَبَهُ وَالذّي

لا يَذكر رَبَـهُ مثَـلُ الحّـي وَ الميّـت) رواه البخـاري و مـسلم ، واتـه نموونـەی کەسێك کە زیکرو یـادی خـوا بکـات ئـەوەش کـە نایکـات وەکـو نموونـەنی (زیندوو — مردوو) وان چوونکە دڵ بە یادی خوا زیندوو دەبێت و وە پچڕان لەخوا کوێرو مردوو دەبێت).

## ( مەجلیس و کۆڕی زیکر کردن زۆر دڵگیرە )

ئیمـامی نـەوەوی (ڕەحمـەتی خـوای لێبێـت) ئـەڵێ (موسـەتەحەبە) موسڵمانان کۆڕی زیکر ببەستن وە بە کۆمەڵ زیکری خوا بکەن بەپێی ئـەم فەرموودانەی خوارەوە :

١) لە عەبدوڵلای کوڕی عومـەرەوە (خـوا لێیـان ڕازی بێـت) ئەگێڕنـەوە حـەزرەت (ﷺ) فەرموویـەتی (إذا مَـرَرْتُمْ بِرِيـاضِ الجنّـة فـأرْتعُوا) واتـە : ئەگـەر بـەلای باخـچەکانی بەهەشـتا تێپـەڕین لابـدەن و بحەسێنەوە و لـە بەخشـشەکانیان بەهەرمەنـد بـن ، ئینجـا ووتیـان ئـەی پێغەمبـەری خـوا باخچەکانی بەهەشت کامانەن ؟ فەرمووی (حَلْقُ الذّكرِ فإن للهِ تَعالى سّيارات منَ الملائكة يَطلبُون حَلق الذكر فإذا أتوا عَليهم حَفـوا بهـم) رواه الترمـذي ، واتـە : کۆڕەکـانی زیکـرن ، خـوای گـەورە کۆمەڵـە فریـشتەیەکی تـەرخان کردووە کە سۆراخی مەجلیس و کۆڕەکانی زیکر ئەکەن جا کـاتێ گەیـشتە لایان ڕێز دەبن و بەدەوریان بازنەیەك درووست دەکەن .

٢) عَن معاوية (رضي الله عَنهُ) أنّ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) خَرَجَ عَلى حَلَقة مِن أصحابهِ فَقالَ ما أجلَـسَكُم ؟ قـالوا جَلَـسْنا نَـذكرُ الله وَنَحمـدَهُ على ما هَدَنا للأسلام وَمَن عَلْينا قالَ ما أجلَسَكم إلا ذلـك ، قـالوا ... اللهُ مـا

أجلسكُم إلا ذاك ؟ قالَ أما إني لَمْ أستَحلِفكُم تُهمةً لَكم وَلكن آتاني جبريل فأخبرني أنّ الله يُباهي بكُم الملائكة) رواه مسلم و الترمذي والنسائي وه هەروەها له موعاويەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە ووتویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی تێپەڕی کرد بەلای ئەڵقەیەکی هاوەڵاندا کە دانیشتبوون فەرمووی چی ئێوەی کۆکردۆتەوە و بۆچی لێرە دانیشتوونە ؟ ئەوانیش ووتیان دانیشتووین (زیکری) خوای مەزن دەکەین وە هەروەها (سوپاسی دەکەین) کە هیدایەتی داوین بۆ ڕێبازی ئیسلام ، وە هەروەها منەتباری (نیعمەتەکانی) خوای گەورەین ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی هەر بۆ ئەوە دانیشتوون هیچی تر مەبەستان نیە ، ووتیان سوێند بەخوا هەر بۆ ئەوە دانیشتووین جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی بۆ ئەوە سوێندم نەدان کە گومانی خراپتان پێ ببەم بەڵکو حەزرەتی جوبرەئیل هات بۆلام و هەواڵی دامێ کە خوای گەورە شانازیتان پێوە ئەکا بەلای فریشتەکانیەوە).

٣) عن أبي سعديد الخذري و أبي هريرة[1] (رضي الله عنهما) قالَ : قالَ رَسول الله (صلى الله عليه وسلم) لا يَقعُدُ قَومٌ يَذكرونَ الله تعالى إلا حَفَتهُم الملائكة وَغَشيتهُمْ الرَحمة ، وَنَزَلَتْ عَليهُم السَكينةُ وَذَكرهُم الله فيمن عندهُ) رواه مُسلم، لە ئەبوو (سەعیدی خدرییەوەو لە ئەبوو هورەیرەش (ڕەزای خوایان لێبێت) هەردووکیان ئەم فەرموودەیە ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەری

---

(١) ئەم حەدیسە (شەریفە) : ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزە وەریان گرتووە لە پێغەمبەر (ﷺ) ئەمە حەدیسێکی (متواتر)ە. بڕوانە (نظم المتناثر من الحديث المتواتر) لەنووسینی بەڕێز سەید(محمد جعفر الحسيني الشهير بالكتاني.

خوا (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : هەر کۆمەڵێ دانیشتن و زیکر و یادی خوا بکەن ئەوا فەریشتەکان دەوریان دەدەن (ڕەحمەت) بە لێشاو دەبارێ بەسەریانا و هێمنی و ئاسایش دائەبەزێتە خوارەوە و ئەچێتە ناو دڵەکانیان و ئینجا خوای گەورەیش لەناو ئەوانەدا کەوان لای خۆی ناویان ئەبات).

٤) عَن أبي هُريرة (رضي الله عنه) قالَ كانَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يسيرُ في طريق مكة فَمَر على جَبَلٍ يُقال لهُ (جُمدان) فَقَالَ يسيرونَ جُمدان سَبَق المفردون قالوا وَما المُفردُون يا رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) الذاكرون الله كثيراً والذاكرات) رواه الشيخان والترمذي، لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ واتە : جارێکیان پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا لە ڕێگای شاری مەککەدا دەڕۆیشتن و ڕابوردن بەلای شاخێکدا کە پێی دەوترا (جُومدان) حەزرەت (ﷺ) فەرمووی بڕۆن پێشڕەوی بکەن و ئەوە جومدان لەو پێش ڕەفتە بوون و ڕزگاریان بوو (مفردون) ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کێن مفردون ؟ فەرمووی ئەو پیاوو ژنانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن (مفردەکان) واتە تاکەکان.

٥) وعَن عبدالله بن بسر (رضي الله عنه) قالَ : قالَ رَجلٌ للنبي (صلى الله عليه وسلم) أن شرائع الإسلام قَد كَثُرَت عَلَي فَمرني بأمرٍ أتثبت به فقالَ (لا يَزال لِسانُكَ رَطباً مِن ذكر الله) رواه الترمذي وە لە عەبدڵڵای کوڕی بوسرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) واتە: پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە یاساکانی ئیسلام و عیبادەتەکان زۆر بوون و من نازانم کامیان جێ بەجێ بکەم ؟ وە خەریکی چ لایەکی خوا پەرستی بم ئەوجا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکم پێ بڵێ و تا دوا هەناسەی ژیانم

دەستی پێوە بگرم ؟ ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی (با بەردەوام دەم و زمانت تەڕ بێت بە (زیکر) و یادی خواوە).

**( پاشکۆ )**

خوێنەوارە ئازیزەکانم ، زیکرو یادی خوای گەورە لە هەموو شت بڵندترو بەرزترە ، چوونکە بێگومان زیکرو یادی خوا بە (ظاهر) و بە (باطن) حیکمەت و فائیدەو سودی گەلێ زۆرە لە ژمارە نایەت ، وە هەروەکو زانای بەناوبانگ پێشەوا (ابن القیم) (رەحمەتی خوای لێبێت) هەندێکی دەستنیشان کردووەو ئینجا ئێمەش بە کورتی هەندێك لەم سوودو فائیدانە ئەخەینە بەرچاوی خوێنەران :

١) بەزیکر شەیتان هەڵدێ و لێت دوور دەکەوێتەوە .

٢) بەزیکر خودای گەورەو میهرەبان لێت ڕازی دەبێت (انشاء الله).

٣) غەم و خەفەت و پەژارەو دڵتەنگی لادەبات.

٤) زیکری خوا مایەی خۆشی و ڕزگاری یە .

٥) زیکر دڵ و لاشە بەهێز دەکات .

٦) زیکری خودا دڵ و دەروون و ڕووخسارو سیمای موسڵمانان نورانی دەکا .

٧) زیکر ڕزق و ڕۆزیت گوشاد دەکات .

٨) زیکری خودا بەرگ و پۆشاکەو پارێزگاریە بۆ خاوەن باوەڕان.

٩) زیکر مایەی خۆشەویستی خودایە بۆ بەندەو عەبدەکانی .

١٠) زیکری خودا موسڵمان دەباتە قۆناغی چاودێری (المراقبە)

١١) زیکر سام و (هەیبەت) و ترسی پەروەردگار لە دڵدا درووست دەکات.

١٢) زیکر مایەی ژیانی دڵەکانە لە ژەنگ و چڵکی تاوان و گوناه....هتد.

(اللّهُم إجْعَلنا من الذّاكِرين الشاكِرين والحمْدُ للهِ رَبّ العَالَمينَ ، وصلى الله علَى سيّدنا مُحَمّد وعلى آلهِ وصحبه وسلم ، والسّلام عليكم ورَحْمَة الله وبَرَكاتُهُ) نبهني الله إياكم من نومة الغافلين وحشرني واياكم تحت لواء سيد المرسلين اللهم أغفرلنا آمين.

# ئامۆژگاری سیهەمین

## باسی فەزڵ و گەورەیی (الإستغفار)

## یا (أستغفر الله) ئەكات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله معيدُ الخيرات وَمنّزلُ البركات وَمضاعف الحسنات وَمكفر السيئات وَمدير اللّيل والنّهار وَمحّول الحَوْلِ وَالأحْوال نَحمَدهُ وَ نَشكرهُ وَنَستدَهيه وَنَستَغفرهُ ونَستعينه ونعوذ بالله مِن شرور أنفُسِنا وسَيئاتِ أعْمَالنا ، وَنَشهَدُ أنْ لا إله إلاّ الله وَحْدَه لا شَريكَ لَـهُ كتَبَ للمؤمنين الرّحْمةَ والمَغْفرةَ ، وَنَشهَدُ أنّ سَيدنَا وَمَولانا مُحمداً عَبدهُ وَ رَسولَهُ وصَفيهُ وَخليلهُ وَالصّلاة والسّلام عليهِ وَعَلى آله وأصْحابه وأتْباعهِ وأُمّته إلى يوْم الدّين وَسَلم تسليماً كثيراً) أمّا بَعدُ أيّها المُسْلمون أوصيكم بِتَقوا الله وطاعَتِه وَلزُم أوامرهِ) واته : لەدوای هەندێ ئەی موسڵمانان وەسیەتتان لێ دەكەم بە تەقوای خوای گەورە وە هەروەها پەیڕەوی بكەن و دەرمەچوون لە كارو فەرمانەكانی خوای گەورە ، جا هەروەها بێگومان پێویستە بۆ دڵە زامدارەكانمان تۆبەو (إستغفار) بكەین كە داواكردنی لێخۆش بوونە لە خوای گەورەو میهرەبان چوونكە ئەگەر سەیری قورئانی پیرۆز بكەین دەبینین زۆر جار باسی تەوبەو گەڕانەوەی لێمان كردووە هەروەكو لێرەدا فەرمانمان پێ ئەكات و ئەفەرموێت ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ سوورەتی النور: ٣١، واتە: ئەی ئیمانداریینە هەر هەمووتان بە پیاوان و ئافرەتانەوە ڕووبكەنە خودا بە پەشیمان بوونەوەو تەوبەكردن و (بەرەو لای خوا بۆ بەدەست هێنانی

ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە) بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفراز بن)، جا هەروەها جارێکی تر خوای گەورە (ئەمر) دەکات بە داوای لێخۆش بوون هەروەکو دەفەرموێت ﴿ وَٱسْتَغْفِرُواْ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾ سووروەتی المزمل: ٢٠، واتە: داوای لێخۆش بوون هەر لەخوا بکەن و دڵنیابن ئەو خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە ، هەروەها جارێکی تر خوای مەزن (مەدحی) ئەو کەسانە دەکات کە بەردەوام زۆر (إستغفار) دەکەن بەتایبەتی لە سپێدەو بەرەبەیاندا ، هەروەکو ئەفەرموێت : ﴿ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴾ سورة آل عمران: ١٧، واتە : لە بەرەبەیانەکاندا داوای پاڕانەوەو لێخۆش بوون دەکەن ، وە هەروەها جارێکی تر خودای مەزن باسی ئەوە دەکات لە قورئاندا کە ئەوەی داوای لێخۆش بوونی لێبکات خودای گەورە عەفوی دەکات و هەروەکو دەفەرموێت : ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾ سووروەتی النساء: ١١٠، واتە: هەرکەسێ خراپەیەك بکات یا زوڵم و ستەم لەخۆی بکات لەوەو دواو داوای لێخۆش بوون لەخوا بکات ئەوا خوایەکی لێخۆشبوو و میهرەبانی دەست دەکەوێت ، جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لە حەدیسێکی قوەدسیدا دەفەرموێت (يا إبنَ آدمْ لَوْ أَتَيْتَني بِقُراب الأرضِ خطايا ثُمَ لَقيتني لا تُشرك بي شيئاً لا أتَيْتُكَ بِقُرابِها مَغفرةً) رواه الترمذي وغيرها ، واتە: ئەی ئادەمیزاد بەڕاستی ئەگەر بە ئەندازەی یا قورسایی و فراوانی زەوی بەگوناهەوە بێیە لام ئەمجا (شەریکم) واتە هاوبەشم بۆ پەیدا نەکەیت ئەوجا منیش بەو ئەندازەیە لێبوردنت بۆ دێنم و عەفوت دەکەم .

**( تێبینیەك )**

ئیمانــداره بــەڕێزەکان بەڕاســتی (إســتغفار) پاداشــتی گــەلێك زۆره هــەروەکو لــە دایکــی ئیماندــاران خــاتوو (عائیــشه) (ڕەزای خــوای لێبێــت) دەگێڕنەوه کەوا فەرمویەتی (طوبى لِمَن وَجَد في صَحيفَتهِ إستغفاراً كَثيراً) واته : سەربەرزی و خۆشەویستی بۆ ئەوەی له دەفتەرەکەی (إستغفارێکی) زۆری دەست بکەوێت ، هەزار ڕەحمەت لەو کەسه بێت که ووتویەتی :

| | |
|---|---|
| خودایه گیان گەرچی من تاوانبارم | له ڕابردووی خۆم پەست و بێزارم |
| زۆر پەشیمانم لەوەی کردوومه | لەو خراپانەی له ژین بردوومه |
| تەوبەو پەشیمان بەڵێن لەمەودوا | نەچمەوه سەریان تەنها لەبەر خوا |
| ڕووبکەمه چاکه نەفس وەلانێم | تاکو ئەو کاتەی بەرەو گۆڕ ئەبرێم |
| خودا ببوره له بەندەی هەژار | مل کەچ وەستاوه کزۆڵەو غەمبار |
| لێبوردنی تۆ بۆمن شادیه | چاکی و بێ خەمی هەر ئازادی یه |

**( ئەنجام دانی تاوان و گوناه ئەبێتە مەنعی عیلم و زانست و ڕزق و ڕۆزی )**

جا هــەروەها بێگومــان حــەزرەتی پێغەمبــەر (ﷺ) لــە فەرموودەیــەکی ڕاست و درووست ئەفەرموێت (إن العَبْدَ لَيُحرَم الرِّزْقَ بالذَّنبِ يُصيبهُ) رواه ابن ماجة والحاكم ، واته : بەڕاستی (عبد) واته بەنده بێ بــەش دەبێــت لــه ڕزق و ڕۆزی که خوا بۆی داناوه بــه هــۆی گوناهێــك کــه دەیکــات هــەروەها خۆشەویست له فەرموودەیەکی تردا ئەفەرموێت : (إذا ظَهَرَت المَعاصي في أُمّتي عَمَهُم الله بعذابٍ مِن عِندهِ) رواه احمد في مُسندهِ ، واتــه : بێگومــان ئەگەر (ئومەتەکەم) تاوان و گوناهیان ئەنجامداو به ئاشکرا و (لەبەر چاوی

خەڵك) ئەوا خوای گەورە گشتیان بە سزایەك لەلایەن خۆیەوە سزا دەدات (ئەمەش شتێکی ڕوون و ئاشکرایە بێ شك)

**( سەرنجێکی گرنگ )**

جا هەروەها ڕیوایەت کراوە لە (إبن أبی الدنیا) وە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ (إنّ الأرض تَزَلزَلَت عَلى عَهدِ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) فوَضَع عليهاثُمَ قالَ اُسكُني فأنْ لَم يأذن لك بَعدُ ثُمَ فالْتَفتْ الى أصحابهِ فقال إنّ رَبَكُم لَيَسْتعتبكُم فأعْتَبوُه) رواه إبن أبي الدنيا مُرسَلاً ، واتە : لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) زەوی لەرزی پێغەمبەریش (ﷺ) دەستی پیرۆزی خۆی لەسەر زەوی داناو فەرمووی (صەبرو ئارام بگرە هێشتا ماوتە ، واتە ڕۆژی قیامەت جارێ نەهاتووە و ماویەتی ئینجا لەپاشان ڕووی کردە (ئەصحابەکانی) و فەرمووی پەروەردگاری ئێوە سەرزەنشت و لۆمەتان لێ ئەکا و کە گوناه ئەنجام دەدەن (دە بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن).

دیسان (ئیبنو ئەبی دونیا) لە پەرتووکی (مەوسوعەکەیداو) [1] ئەڵێ دەگێڕێتەوە ، کەوا لەسەردەمی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) جارێکی تر زەوی لەشاری مەدینە دەستی بە لەرزین کرد جا ئیمامی عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) ڕووی کردە خەڵکی و فەرمووی (یا أيّها النّاسُ ما هذا ؟ ما أسرع ما أحدَثتم لَئن عادَت لا أسكنكم فيها) (واتە ئەی خەڵکینە ئەوە چی یە ؟ ئێوە ئاوا زۆر پاش پێغەمبەر (ﷺ) چوونە سەر تاوان و گوناه ،

---

(1) بڕوانە پەرتوکی : (موسوعة الإمام إبن أبي الدّنيا) دانراوی (الحافظ ابي بكر عبدالله بن محمد القرشي، ب ج، ٥،لّ ٩٣)

واتــه زەوی لــەرزین لەبــەر تــاوان و گوناهــەو ئەگــەر جــارێكی تــر زەوی بلەرزێتەوە من لەم شارە لەگەڵتان جیّ نـشین نـابم) ، هـەروەها حـەزرەتی (عەلی)ش (ڕەزای خوای لێبێت) ئەفەرموێت (ما نَزَلَ بَلاءٌ إلا بِذَنبٍ وَما رَفَعَ إلا بِتَوبةٍ) واتە : هەر بەلآیەك بەسەر ئەم خەڵكە دا دابـەزێت تـەنها بـەهۆی تاوان و گوناهەوەیە ، ئەم بەلآیەش لاناچێت مەگەر بەتەوبە نەبێت .

هــەروەها عەبــدوللآی كــوڕی مەســعودیش (ڕەزای خــوای لێبێــت) ئەفـەرموێت (إنـي لأحسَبُ أنّ العَبدَ ينـسي العِلمْ بالـذّنْبِ يُـصيبهُ) واتـە : بەراستی من دەزانم كە بەندە (عـیلم) و زانستی لـەبیر دەچێتەوە بـەهۆی گوناهێك كە دەیكاو ئەنجامی دەدات چوونكە بێگومـان (عـیلم) و (زانـست) ڕووناكیەكە خوای گەورە دەیهاوێتە دڵ و دەروونی ئەو كەسەی كە گونـاهو تاوان ئەنجام نادات و نایكات ، چـوونكە گونـاه ئەیكوژێنێتـەوە ، هروەكـو ئەگێڕنــەوە كاتێــك ئیمــامی (شــافیعی) لەبەردەســتی ئیمــامی ماڵیــك (مەسئەلەیێكی شەرعی) باسكرد ئەوجا (ئیمامی مالیك) پێی سەرسام بـوو لەبەر زیرەكی و بیر تیژی و جـوان تێگەیشتنی بۆیـە پێـی فـەرموو : (مـن وادەبینم كە خوای گەورە ڕووناكیەكی خستۆتە دڵتەوە جا نەیكوژێنیتـەوە بە تاریكی گوناه ، هەندێكی تریش لە زانایـان ئەگێڕنـەوەو ئـەڵێن ئیمـامی شافیعی لە كاتی فەقیّ یاتی جارێـك تووشــی (نـەزەرێك) دەبێـت كـاتیّ لـە ڕێگادایە دەڕوا بۆلای مامۆستا یەكەی ، نـاوی (وەكیـع) دەبـیّ كـە دەچـیّ بـۆلای مامۆســتاكەی وەك جــاران نییــە لــە دەرس و واناكــانی ، ئینجـا مامۆستاكەی دەزانێت و پێی دەڵێت گوناه مەكـە چـوونكە زانـست (عـیلم) نـووری خودایـە ئـیتر بێگومـان خـوای گـەورەش نـووری خـۆی نـادات بـە

گوناهباران)، هەروەك ئیمامی شافیعی خۆی ئەم ڕووداوە ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ :

**شكَوتُ إلى وَكيعٍ سُوءَ حِفظي**

**فأرشَدَني إلى تَرك المَعاصي**[1]

**وأخبَرَني بأنّ العِلمَ نورٌ**

**وَنور اللهِ لا يُهدى لِعاصي**

منیش لە وەرگێڕانی ئەم دوو بەیتە ئەڵێم: (سكالآم بردە لای شێخم كە پیری حافیزەم چۆڵە* بێگومان چ ماندووبنی ئەكێشم لە زانینی زیهنەكەم كۆڵە) (پێی ڕاگەیاندم بە گوناهو تاوان دڵ ئەبێ تاری* بەڵام عیلم و نووری حەق ناچێتە ناوی بە ئەمری باری).

## ( چەند ئاگادارییەكی گرنگ )

یەكەم باشترین داوای لێخۆش بوون ئەوەیە كە سەرەتا مەدح و سەنای خوای لەگەڵدابێت لە پاشان دان بە تاوانەكانی بكات ، جا هەروەها بێگومان پێغەمبەر (ﷺ) خۆی فەرموویەتی (سَیدُ الإستغفار أنْ یَقولَ العَبدُ اللّهم أنتَ رَبي لا إله إلا أنت خَلَقتَني وَأنا عَبدُكَ وَأنا عَلى عَهدِكَ وَ وَعدِكَ ما أستَطعتُ أعوذ بِكَ مِن شَر ما صَنَعتُ أبوُ لَكَ (أي أعتَرِف بِذَنبي) بِنِعمَتِكَ عليَ وَ أبوُ بِذَنبي فأغفر لي فإنه لا يَغفر الذنوب إلا أنت)[2]، واتە خوایە تۆ

---

(1) بڕوانە پەڕتووكی : (النور الشافي في الفقه على مذهب الإمام الشافعي) دانراوی (الحاجة دريّة خليل) لاپەڕە ٢٥٠.

(2) رواه الامام البخاري (عَن شداد بن أوس) رضي الله عنه.

بەڕاستی پەروەردگاری منی ، جگە لەتۆ هیچ خوایەکی بەهەق و ڕاست و شایانی پەرستن نییە ، واتە : بەڕاستی تۆ منت درووست کردووە ، هەروەها ژیانت پێ داوم من بەندەی تۆم لەسەر ئەو بەڵێن و پەیمانەی کە پێم داوی بەپێی توانا نەیشکێنم خوایە خۆم بەتۆ دەپارێزم لەو زەرەرو زیان و خراپانەی کە تۆ درووست کردووە دان بەو نازو نیعمەت و چاکانە دەنێم کە لەسەر منت کردووە لەگوناهو تاوانەکانم دەگەڕێمەوە لای تۆ وە پەشیمان دەبمەوەو دان بەهەڵەو تاوانەکانم دەنێم و دەی کەواتە لێم خۆش ببە چوونکە بەڕاستی لەتۆ بترازێ ، کەس تاواناو دەسەڵاتی لێخۆش بوونی نییە لە (گوناهو تاوانەکان) .

دووەم) لە عەبدوللآی کوڕی عەباسەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (مَن لَزَمَ الإستغفار جَعَلَ الله لَهُ مِن كُلِ هَمٍ فَرَجاً وَمن كُل ضيق مَخرجاً وَرَزَقَهُ مِن حَيثُ لا يَحتَسبُ) رواه أبو داود والنسائي و ابن ماجة) واتە : هەر کەس خەریکی ووتنی (أستغفر الله) بێت خوای گەورە بۆ هەموو خەم و خەفەت و پەژارەیەك دەرگای ڕزگاری و سەرفرازی بۆ ئەکاتەوە بەشێوەیەك ڕزق و ڕۆزی ئەدا کە هەرگیز نەیەت بە خەیاڵیدا) جا عبدالله ی کوڕی عەباس (ڕەزای خوای لێبێت) دەڵێ ئەگەر بەندەیەك ، تەوبەی کرد خوای گەورەش لێی خۆش دەبێ جا ئەو (فریشتانەی) کە تاوانەکەیان لەسەر نووسیوە ، ئەو کردەوەیان لەبیر دەچێتەوە .

سێ هەم) لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) دەگێڕنەوە کە گوتویەتی لە یەك دانیشتنا بۆ پێغەمبەری خودا (ﷺ) سەد

جارمان ژمار ئەکرد کە ئەی فەرموو (ربي إغفر لي وَ تُب عَلَي إنَكَ أنتَ التَواب الرحيم) رواه ابو داود والترمذي

واتە : پەروەردگار لێت ئەپاڕێمەوە لێم خۆش ببە (هەرچەندە پێغەمبەر (ﷺ) گوناهو تاواناشی نەبووە) تەوبەو پەشیمانیم لێ وەربگرە چوونکە بەڕاستی هەر بەخۆت تەوبە وەرگری وە خاوەن ڕەحم و بەزەییەکی یەکجار زۆری .

چوارەم) خاوەن باوەڕان خودای بەرزی بێ وێنە لەم سوورەتە پیرۆزەدا ڕوو دەکاتە پێغەمبەر (ﷺ) پێی دەفەرموێت (بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنَ الرَّحِيم) ، واتە : بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان ﴿ إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ﴿١﴾ ﴾ سوورەتی النصر: ١واتە : ئەگەر سەرکەوتنی خودا هات و سەرکەوتی بەسەر دوژمنەکانت ، خودا فەتحکردنی مەککەی بۆ کـــــــــردی ﴿ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ﴿٢﴾ ﴾ سوورەتی النصر: ٢، واتە: دیتت خەڵکی پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی خواوە بەتایبەتی (عەرەبەکان) پاش ئەو خۆگرتن و ململانێیە ﴿ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ ﴾ سورة النصر: ٣، واتە : ئەو کاتە ناوی پەروەردگارت بهێنەو بە بەزەیی و بە دوری لە گشت کەم و کورتی و عەیبێك ناوی پیرۆزی ڕابگرە حەمدو ستایشی بکە ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا ﴿٣﴾ ﴾ سوورەتی النصر: ٣، واتە داوای لێخۆش بوونی لێبکە چوونکە بەڕاستی خوا زۆر چاوپۆشی دەکات و (تەوبە) وەرگرە .

پێنجەم) جا هەروەها بێگومان بەڕاستی ئەو خوایە زۆر تەوبە وەرگرە و

چاوپۆشیکاره ، بەڵێ مرۆڤ دەبێ ڕووی پەشیمانی هەر بۆ دەرگای خوا بەرێ ، بۆیە پێغەمبەران (صلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت) پاش (هیجرەت و جیهادێك)ی زۆرو بێ ووچان ئینجا زیاتر سەری بەندایەتیان دانەواندووە و داوای لێبوردنیان لە خوا کردووە ، ئەوەتە پێغەمبەر (ﷺ) لە سوژدەو (رکوعی) نوێژەکانیدا بەردەوام دەی گووت : (سُبحانَكَ اللّهم رَبَّنا وَبِحَمدِكَ اللّهم أغفر لي (فتح الباري ٨/٦٠٥) واتە : خوای گەورە و بەخشندە بە بەزەیی و میهرەبانی خۆی لە ئێمەش خۆش ببێ و کارە چاکەکانمان لێوەرگرێ و قەڵەمی بەخشینیش بەسەر گوناهو تاوانەکانماندا بێنێ.

(مي نگويم طاعتم بپـــذير          قلم عفو عفو بر طناهم كش)

شێخی (سعدی) لەپەرتووکی (گلستان)[1] داو ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ شێخ عبدالقادری گەیلانی یان دی (رەحمەتی خوات لێ بێ) لەحەوشی (بەیت) رووی لەسەر وردەبەردەکان دائەناو ئەیوت (ئەی خوایە بم بەخشەوە ئەگەر شایانی سزام لەقیامەت بەکوێری هەڵم سێنەوە، تا لە رووی چاکانا شەرمەزار نەبم.

شەشەم) خوێنەوارانی ئازیزم: ، پێغەمبەری خودا (ﷺ) بە هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتە کە لەپێش ئێستادا بوو تێپەڕی هەروەها بە هاتنە خوارەوەی ئەم سورەتەی (نەسرە) بۆ دەرکەوت کە کاتی (ئەجەلی) نزیك بۆتەوە ، چوونکە دایکی ئیماندارانیش خاتوو عائیشە (خوا لێی رازیبێت) ئەگێڕێتەوە لێی ووتویەتی : پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەپێش

---

[1]) بروانە (گوڵستان سەعدی) لەوەرگێرانی مامۆستا مەلا (مستەفا– سەفوەت) ل١١٧.

وەفاتیا زۆری ئەفەرموو (سُبحانَ اللە وَبِحَمدە ِ أسغفراللە وَ أتوب إلیـە) متفـق عَلیە، واتە : بـەم زیکـرو (ئەورادانـە) پێغەمبـەر (ﷺ) سـوپاس و حەمـدو شوکرانەی خوای دەرئەبڕی وە داوای لێخۆش بوونی لێ ئەکا وە بە تـەوبـەو پەشـیمانی ئەگەڕێتـەوە بـۆلای خـودای میهرەبـان و پـەروەردگاری ، بەهەزاران (درودو صەلاواتی خوای گەورەت لێ بێت) ئەی خۆشەویستمان.

حەوتەم) دە تۆ تەماشا بکە کە ئەو پێغەمبەرە (ﷺ) بـێ تـاوان و بـێ گوناهو (معصوم) ە ڕۆژێ چەند جارو کەڕەت (تۆبە)و پەشیمانی بەرامبـەر خوای گەورە ئەنجام داوە هـەروەکو (ئیمـامی بوخـاری) لـە فەرمودەیەکدا هێناویەتی ئەمەش دەقی عەرەبیەکەیەتی وَ قالَ رسول اللە (صلى اللە علیـە وسلم) واللە إني لا أستَغفر اللە وَ أتوب إلیە ِ في الیَـوم أکْثَـر مِـنْ سَبْعینَ مَـرَةً) رواە البخاري.واتە : پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ : سوێند بەخوا مـن بەتەنها لە ڕۆژێکدا ٧٠ جار داوای لێخـۆش بـوون لـە خـوای گـەورە دەکـەم بـەرەو لای خـوا تەوبـە دەکـەم و دەگەڕێمـەوە ، وە هـەروەها لـەم فەرمودەیەشدا ئەڵێ (یا أیّها النّاس تُوبوُا الى اللە فإني أتـوبُ في الیَـوم إلیـە ِ مائـةَ مَـرةً) رواە مـسلم، واتـە : پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێ ئـەی خەڵکینە بگەڕێنەوە لای خواو تەوبە بکەن لە گوناهەکانتان خۆ من بـەخۆم تەنها لە ڕۆژێکدا /١٠٠/جـار داوای لێخـۆش بـوونی لێدەکـەم واتـە : تەوبـە دەکەم) ، هەروەها دیسان پێشەوا (موسـلم) ئـەم فەرموودەیەشـی هێنـاوە هەروەکو پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : (مَن قالَ أستغفرُ اللە العظیم الذّي لا إلە إلا هوَ الحَيُّ القَیّوم وأتُوبُ إلیـە ِ غَفَـرَ لَـهُ وإن کـانَ فَـرَ مِـن الزَحـف ِ) رواە مسلم. واتە : هەرکەسێ بلێ ئـەی خـوای گـەورە داوای لێبـوردنم هەیـە لـە

گوناهو تاوانەکانم خۆشبە هیچ خوایەك نیە تەنها ئەو خوایە نەبێ کە (الله یە) و هەمیشە زیندووە تەوبە بەرەو لای ئەو ئەکەین ، خوای گەورە لێی خۆش ئەبێ ئەگەر لەجەنگی دژ بە (کافرانیش) هەلأتبێ).

خوێنەوارە ئازەکانم حەزرەتی حاجی کاکە (ئەحمەدی شێخ رەحمەتی خوای لێ بێ) لە (مەکتووباتە) ئەفەرمووی ئەی برای خۆشەویست چارەی گوناهباری بەپەشمانیو بەداواوتکای لێخۆشبوونە لەخوای گەورە وەکوو حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی(**الا أنبئكم برائكم ودوائكم؟ قلنا بلى قال ان داءكم الذنوب و دواءكم الاستغفار**) واتە دەردی ئێوە گوناهەو دەرمانتان داوای عەفوو پاڕانەوەیە لەخوا – ئەی خۆشەویست بۆ ئەم دەرمانە (ئەجزای) تر هەیە کەبریتییە لەدەست بەرداربوون لەگوناە بەیەکجاری ، بەلأم بەجۆرەش (حەدیس) هاتووەو ئەفەرمووێت (الاستغفار بلا انقلاع توبه الكـژبين) واتە بەزمان داوای لێ خۆشبوون کردن بێ دەسبەرداربوون لەتاوان و گوناە ئەمەتەوبەی درۆزنانەو بڕوانە (مەکتوباتی کاکە ئەحمەدی شێخ) لەوەرگێڕانی مامۆستا مەلا (عبدالكريمی مدرس) بەرگی چوارەم ، لاپەڕە ٧٢.

## (باسێك لە تەوبە كردن و گەڕانەوە لای خواو (ئیستیغفار) واتە پەشیمان بوونەوە)

دەگێڕنەوە پیاوێك هاتە لای شێخ حەسەنی بەسری[1] (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ووتی یا شێخ لە گێڕانەوەیەکی تردا ووتی ئەی لە خوا ترس ، ئاسمان بارانی لێ ناباریێ شێخ حەسەنیش پێی ووت برۆ (استغر الله) بکەو ئەمجا پیاوێکی تر هات و گووتی من سکالاَ لەدەست هەژاری دەکەم جەنابی شێخ حەسەن پێی ووت برۆ (استغفر الله) بکە . جا کابرایەکی ترهات ووتی یا شێخ زەویمان گیاو گۆری لێ سەوزو ناڕوێ شێخ حەسەن هەروەها فەرمووی برۆ (استغفر الله) بکە ئینجا پیاوێکی تر هات و پێی ووت قوربان زەوی لە بێ ئاوی ووشك بۆتەوە ، ئەوجا بەویشی ووت (استغفر الله) بکە ئینجا دانیشتوان لە شێخ حەسەنیان پرسی: باشە خۆ ئێمە سەرسام بووین جەناب هەرچیان هات و سکالاَی لا کردی تۆ هەر ووتت (استغفر الله) بکەن جا شێخ حەسەنیش فەرمووی ئایە ئێوە ئەو فەرموودەی خواتان نەخوێندۆتەوە کە ئەفەرمووێت ﴿ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾ ﴾ سوورەتی هود: ٥٢ .

---

(١) شێخ حەسەن : یەکێکە لە زانا هەڵکەوتووەکانی (تابعی) ، و هەروەها یەکێك بووە لە پێشەواکانی ئوومەتی ئیسلام ، هەندێك (سیرەت) نووسانی ئەم زاتە ئەڵێن چەن (قطر) ە شیری (أم سلمی) ی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) خواردووە لە پاشان لە ماڵی پێغەمبەر (ﷺ) گەورە بووە ، ئەڵێن بە خزمەت ٧٠، ئەصحابەی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتووە .

واتە: ئەی قەومینە لەسەرخراپەکاری و بت پەرستن و وێنەدانانتان ، بۆ خودای تاك و تەنها تەوبە بکەن و داوای لێخۆش بوونی لێ بکەن پاشان بگەڕێنەوە بۆلای ئەو بە پەشیمان بوونەوە لە کردەوەکانی پێشووتان ، ئەوکاتە خودای گەورەش بارانی زۆرتان بەسەردا دەبارێنێ پاش ئەوەی کە وەستاندویەتی و لێی گرتۆتەوە ، وە هێز و توانای زۆرتان پێ دەبەخشێت لەوەی خۆتان هەتانە ئێوە بە گوناهو خراپەکاری پشت مەکەنە ئەوەی کە پێتان ڕادەگەیەنم .

**( هەندێ لە زوهدوو خوا پەرستی ئەم زاتە ، خوا لێی ڕازی بێت )**

جا هەروەها هاتووە لە کتێبی (صلاح الأُمة) [1] دائەڵێ (قالَ السید محمد باقر (رحمة الله عَلیه) ذاكَ الذي یشبه کَلامه کلام الأنبیاءِ) واتە : ئەفەرموێ ئەم زاتە سەید (محمد باقر – ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەربارەی شێخ (حەسەن بەسری) دەڵێ ئەم زاتە کە سێکە قسەی لە قسەی پێغەمبەران (علیهم السلام) دەچوو ، هەروەها یەکێکی تر لە زانایان دەڵێ (کانَ الحسن البصري یصوم البیْض وأشهر الحرم والإثنین والخمیس) واتە : شێخ حەسەنی بەسری (ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە بەڕۆژوو دەبوو وە هەروەها لە هەموو مانگێکدا (١٣–١٤–١٥) ی ئەو مانگە بەڕۆژوو دەبوو هەروەها چوار مانگە (حەرامەکەش) کە پێیان دەوترێ (أشهر الحرام) هەر بەڕۆژوو دەبوو ، (وَکانَ یَقولُ توبُوا إلی الله مِن کَثرة النَوم

---

(1) بروانە پەرتوکی (صلاح الأمة ، في علو الهمة) لە نوسینی (الدکتور سید بن حسین العفاني) بەرگی/١ لاپەرە ٤٧٣.

وَالطّعامِ) واته : دەیوت هۆ خەڵکینە (تەوبە) بکەن لەزۆر خەوتن و زۆر خواردن (وكانَ يَقول ، إذا لَم تقدر على قيام اللّيل وَلا صيام النّهار فأعلم أنّكَ مَحْرُومٌ قَدْ كَبّلَتْكَ الخَطايا وَالذّنُوبَ) واته : هەروەها ئەیفەرموو ، ئەگەر نەتوانی شەو نوێژ بکەیت ڕۆژووەکەشی بەڕۆژوو نەبێت ئیتر بزانە تۆ بێبەش و تاوان و گوناهی زۆر دەست و پێیان بەستووی (ثُمَ استغفر الله و بَكى وَقالَ القلبُ الذي يُحب الله يُحبالتَعب وَ يؤثر النصَبَ هَيهاتَ لا ينال الجنّة من يؤثر الرّاحةَ مَن أحَبَ ما عِند الله سَخا بِنَفسه إن صَدق وتَرك الأمانيّ) واتە : زۆرجار (استغفر الله) ی دەکردو دەگریاو دەیووت : ئەو دڵەیخۆشەویستی خوای پەروەردگاری تێدابێ ، حەزی لە ماندووبوونەو فەزڵی دەدات بەسەر (ئیسراحەت) دا هاوار بۆ ئەو دڵەی ئاوا نەبێ ئەگەر دڵی وانەبێ ئەوا بەهەشت نابینێ هەر کەس بەش و پاداشتی خوای خۆش بوێت گیانی خۆی بۆ دەکاتە قوربانی خۆی ناداتە دەست هەواو ئارەزوو).
جا هەروەها ئەم زاتە ئەفەرموێت (أكثروا من الأستغفار في بيوتكُم وَعَلى مَوائيدكَم وَفي طُرقكم وَفي أسواقكم وَفي مَجاليسكُمْ فانكم ما تَدرونْ مَتى تُنْزِلُ المَغفرةُ) [1] واته : هەروەها شێخ حەسەنی بەسری (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێت (استغفر الله) زۆر بکەن (بە بەردەوامی) و بەتایبەتی لە ماڵەکانتان و لە بازاڕەکانتان و لە کۆڕو کۆمەڵەکانتانا وە لەسەر سفرەی خواردن لەهەر کوێەك بوون چوونکە ئێوە نازانن لە چ کاتێکدا لێخۆش بوون دادەبەزێتە خوارەوە .

---

(1) بڕوانە پەڕتوکی (جامع العلوم والحكم) لە نووسینی (عبدالرحمن بن شهاب الدين الشهيرباني رجب الحنبلي) لاپەڕە ٣٣٣. .

## ( چەند سەرنجێك لە بارەی تەوبەكردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا )

١) لە پەرتووكی (التّوابُون) دا (ابن قدامه) ی مەقدسی ئەگێڕێتەوە لە (عەلی كوڕی رەبیعە) ئەڵێت ئیمامی عەلی كوڕی (ئەبی طالب كرّم الله) وجههُ ئەم زاتە لە پاشكۆی خۆی دا هەڵی گرتم دوای ئەوە كە بەرەو (حرە) دا بردمی ئینجا حەزرەتی (عەلی – رەزای خوای لێبێت) سەری بۆ ئاسمان بەرز كردەوەو فەرمووی خوایە گیان لە گوناهەكانم خۆش ببە چوونكە بەڕاستی جگە لەخۆت كەس نیە لە گوناه خۆش ببێت دوای ئەوە ئاوڕێكی بۆلام دایەوە ئیتر پێكەنی ووتم ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەم (دوعا) كردنت چاوپۆشی پەروەردگارتەو بەلام ئاوڕدانەوەكەت بۆلای من و پێكەنینەكەت چی بوو ؟ فەرمووی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە پاشكۆی خۆی دا هەڵی گرتم دوای ئەوە بەرەو (حُره) بردمی دوای ئەوە حەزرەت (ﷺ) سەری (موبارەكی) بۆ ئاسمان بەرز كردەوە و فەرمووی (اللّهُم أغفر لي ذنوبي فإنّهُ لا يَغفر الذنُوب أحدٌ غَيرَكَ) واتە خودایە لێم خۆشبەو لە گوناهەكانم ببورە چوونكە بەڕاستی ئەگەر تۆ لە گوناهەكانم خۆش نەبی و كێ هەیە لەتۆ زیاتر (عەفومان) كاو لە گوناهمان ببوریّ) ئینجا دوای ئەوە ئاوڕێكی بۆلای من دایەوە و پێ كەنی منیش ووتم ئەی پێغەمبەری خوا ئەم دوعاو داواكردنەت چاوپۆشی پەروەردگارتە بەلام ئەو ئاوڕدانەوەت بۆ لام و پێكەنینەكەت چی بوو ؟ ئەوجا پێغەمبەریش لە وەلامدا فەرمووی (ضَحكتُ لِضَحك ربيّ لعجبهِ لِعَبدهِ أنّه يَعلمُ أنه لا يغفر الذنوب أحدٌ غيرهُ) ، واتە : بۆ ئەو پێكەنینەی پەروەردگارم پێكەنیم كە سەری لە بەندەكەی سوڕ دەما لەوەی كە دەیزانی جگە لە خوای خۆی كەسێكی تر نییە لە گوناهەكانی خۆش ببیّ .

**( چەند سوودێك )**

١) جا هەروەها بێگومان هەندێ لە زانایانی ئایینی ئەفەرموون ، تەوبە کردن هەندێ مەرجی هەنەو ئەبێ ئەو مەرجانە جێ بەجێ بکرێ :

یەکەم) وازهێنان لە تاوان و گوناهو هەروەها پەشیمان بوونەوە لەوەی کردویەتی یا پەشیمان بوونەوە لەوەی کە لە دەستت چوو چوونکە هەروەها ووتراوە پەشیمان بوونەوە (تەوبەیە).

دووەم) بڕیاردان لەسەر ئەوەی نەگەڕێتەوە سەری ، هەروەها ووتراوە لەگەڵ ئەوانەشدا چاکەو خێرکردن بەردەوام بێت .

سێ هەم) ئەوە ئەگەر گوناهەکە لەنێوان تۆو خودا بێت پێویستە لە بەینی خۆی و خودای خۆی (تەوبە) بکات ، بەلاّم ئەگەر لەنێوانی تۆو خەڵکی دابوو ئەوا دەبێت لەگەڵ ئەو شەرتانە واتە مەرجانەی پێشوودا ، زاڵم (حەقی) مەزڵومەکە واتە حەقی زوڵم لێکراو بداتەوە ، هەروەها واز لە زوڵم کردنەکەی بهێنێ هەروەها مافی خەڵکی بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکانیان[1] .

٢) جا هەروەها هەندێ لە (ئەصحابەکانی پێغەمبەر) (ﷺ) ووتویانە : ئێمە دوو ئەمانمان هەبوو لەدوای وەفاتی پێغەمبەر (ﷺ) یەکێکیان ڕۆیشت کە پێغەمبەر بوو (ﷺ) وەفاتی کردو چووە جێگای هەق ، دووەم ئەوەی لە دەستمان ماوە (استغفار کردنە) و لەگەڵمانەو مایەو ئەگەر

---

(١) بڕوانە پەرتوکی (الأداب الشرعية والمنحُ المرعّية) دانراوی (شمس الدين محمد بن مفلح المقدسي الحنبلي) لێکۆڵینەوەو پێداچوونەوەی بەڕێز (بشير محمد عيون) بەرگی یەکەم ، لاپەڕە ٩٩).

ئەویش بڕوا ئەوا بە (هیلاك) دەچین و ماڵ وێران دەبین).

٣) دەگێڕنەوە لە (لوقمانی حەکیم) (سەلامی خوای لێبێت) بەکوڕەکەی خۆی ووت کوڕی شیرینم (تەوبە کردن قەت دوا مەخە چوونکە مردن لە ناوەختدا دێ و مۆڵەتت نادات) چوونکە بێگومان (ئایەت) و (حەدیس) لەبارەی تۆبەو (استغفار) گەلێ زۆرن هەروەها هەندێ لەم فەرموودانە ئەخەینە بەرچاو لە کتێبی ناوبراو[1] هاتووە ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (التَوبة مِن الذَنبِ أن يَتوبَ مِنهُ ثُمَ لا يَعودُ فيه) رواه أحمد ، وە هەروەها ئەفەرموێت (التائِبُ مِن الذَنبِ كَمَن لا ذَنبَ لَهُ)رواه ابن ماجة وروي عَن النَبي (صلى الله عليه وسلم) أنه قال (النَّدمُ تَوبةٌ) ، قيلَ : (التوبة النَصوح) تَجمَعُ أربعة أشياء ، النَوم بالقَلب و الإستغفار باللّسان ، وإضمارُ أن لا يعود وَمجانبُة خلطاءُ السّوءِ.

**( پاشکۆ )**

حەزرەتی شێخ (عبدالقادری) گەیلانی (قُدّس سِرهُ) واتە : خوا نهێنی پیرۆز بکات) تەوبە کردن بە سێ پلەدا تێپەڕ دەبێ بە واتای یەکەم (التوبة) دووەم (الإنابة) سێ هەم (الأوبة)

یەکەم) هەر کەسێك لە ترسی سزابێ ئەوە (تەوبە) یە .

دووەم) هەرکەسێك بە (تەماعی) پاداشت و لەترسی سزا بێت ئەوا (إنابە)یە.

سێ هەم) هەر کەسێك بە (ریعایەت) کردنی فەرمان و گوێڕایەڵی خوا

---

(1) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو .

بێ ئەوە (آوبة) یە ، جا هەروەها ووتراوە (تەوبە) لە ڕەوشتی موسڵمانانە چوونکە خوای گەورە ئەفەرموێت﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ سوورەتی النور: ٣١

(الإنابة) لە ڕەوشتی ئەولیاو نزیکانی خوایە ، خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ ﴾ سورة ق: ٣٣، الأوْبة لە ڕەوشتی پێغەمبەرانە ، چوونکە خوای گەورە، هەواڵی (ئەیوب) پێغەمبەرمان(ﷺ) پێ دەداو ، لەە وەسفیدا دەڵێ﴿ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾ سوورەتی ص: ٤٤[١] .

## ( کۆتایی )

چەند موشایەخێکی (ئەهلی تەصەوف) فەرمویانە پێویستە لەسەر موسڵمان خۆی خاوێن بکاتەوە لەهەموو لایەنە (ماددی و مەعنەوییەکان) :

١) جا هەروەها لەسەر خاوەن باوەڕو باوەڕدار پێویستە خۆی خاوێن وپاك بکاتەوە لەخوا پەرستیدا لەبەر چاوی ڕواڵەت و ڕیایی و چوونکە (ریا) شرکی بچووکە بەڵکو لە خوا پەرستیەکەی مەبەستی ڕەزامەندی خوا بێت چوونکە خوا فەرموویەتی ﴿ فَٱعْبُدِ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴾ سوورەتی الزمر: ٢.

٢) خۆی پاك بکاتەوە لە نەزەری (حەرام) بەچاو نەڕاوانێتە (حەیا) و

---

(1) بڕوانە پەڕتوکی (الغنية ، لطالبي طريق الحّق عَزّ وَجَل) دانراوی (الشيخ السّيد عبدالقادر الجيلانی الحسينی) بەرگی ٢، لاپەڕە ٦٢٥.

شەرمی خەڵکی چوونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ يَعْلَمُ خَآئِنَةَ ٱلْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِى ٱلصُّدُورُ ﴾ سوورەتی غافر: ١٩.

٣) خۆی پاك بكاتەوە لە گومانی خراپ و بەرامبەر بە خەڵکی چوونکە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ﴾سوورەتی الحجرات:١٢.

٤) هەروەها پێویستە موسڵمانی ڕاستەقینە خۆی خاوێن بكاتەوە لەهەموو تاوان و گوناهو[1] وە تەوبەیەکی (نصوح) بکات هەروەکو ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾ سوورەتی البقرة: ٢٢٢، اللّهُمَ إجْعَلْنا مِنَ التَوابِينَ المُتَطّهِرينَ ، وَصلى الله على سَيِدنا مُحَمَدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبهِ وَسَلَم).

---

(1) حەزرەتی حاجی کاکە ئەحمەدی شێخ لە (مەکتوباتا) ئەفەرمووێ (لەحەدیسێکا هاتووەو ئەفەرمووێ (ئەی تاوانبار ئەمین مەبە لەناشیرین (عاقیبەت) کە گوناه ئەکەن‌و (تەوبەی) لیٚ ناکەن ئەو تەوبە نەکردنەش ئەبێتە تاوانی لەسەر تاوان‌و ئەم حاڵەتە لەگوناهەکەت گەورەترە هەروەها پێکەنین‌و خۆشحاڵیت لەپاش گوناهەکە ئەویش لەگوناهەکەت گەورەتر کە خەم‌و پەژارەنیکت پیشان نەدا لەگوناهەکەت گەورەترە کەترست لەخەڵك هەیە بەگوناهەکەت بزانن ئەوە لای خوا لەگوناهەکەت گەورەتر چونکە پێویستە لەخوا بترسیٚ نەلەخەڵك چونکە ریوایەت ئەگێڕنەوە کەواحەزرەت (ﷺ) بەلای کۆمەڵێکا رابوورد کەدەورەی شتێکیان دابوو فەرمووی ئەم (قەرەباڵغە) چییە؟ عەرزیان کرد تەماشای ئەو (شێتە)ئەکەن فەرمووی ئەمە شێت نییە بەڵکو (نەخۆشە) فەرمووی شێت ئەوکەسەیە لەسەر گوناه دەوام ئەکات‌و بەهۆی (تەوبە) خۆی رزگار ناکات بڕوانە (مەکتوبات) بەرگی٤، ل١٠٤.

# ئامۆژگاری سی و یەکەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( سبحان الله )

## یا ( تسبیحات ) ئەکات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ، الحَمدُ لله ولا يحمدُ سِوى الله ، ولا إلـه إلا الله ، وسبحان الله وَلا يَنبَغي التَسبيحُ إلا لله وَلا حَولَ وَلا قوةَ إلا بالله العلي العظيم ، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدهُ لا شَريكَ لـه ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ سوورەتی الإسراء: ٤٤، وَ أشهَدُ أن سَيدنا مُحَمداً عَبدَهُ وَرَسولُهُ المُصطَفى من خيارِ الخيارِ نبيٌّ شقّ لَـهُ القَمَرُ وَسَبَح بكَفـه الحَجَرَ وَجاءَت لِدَعوَتـه الأشجارُ وَالصلاةُ وَالسَلامُ عَليـه وَعلـى آلـه وأصْحابه نجومَ الأرضِ والبدورِ السافرة (أما بعدُ أيّها المُسلِمونَ أوصيكُمْ عِبادَ اللهِ أولاً بِتَقْوا اللهِ وَطاعَتـه وَلـزومِ أوامـره) لـە دوایـی هەنـدێ ئیمانـدارەکان بـرا موسـڵمانە بـەڕێزەکان ، پێـشەکی وەسـیەتتان لێ دەکـەم ئـەی بەنـدەکانی خـودا بەتەقوای خوای گەورەو پەیڕەوی کردنی ئەمرو کارەکانی جێ بەجێ بکەن بە درووستی).

جا هەروەها برا موسڵمانەکان ئەو ئایەتەی /٤٤/ی سورەتی (الإسراء) لە ووتاری پێشودا تێپەڕی ئەمە پوختـەی مانایەکـەیتی ، واتـە بێگومـان خوایەکی ئەوتۆیە کە هەر حەوت ئاسمانـەکان و زەوی و هەرچیەکیش کـە تیایاندایـە لـە (فریـشتەو ئـادەمیزاد و گیانـداران و درەخـت و گـشت

دروستكراوەكانی تر بـە گـەورەو بـچوكيانەوە ، هەريەكـەو بـە شـێوەيەك ناوی خودا بە پاك دادەنـێن و هـەردەم (زيكـری) خـوا دەكـەن و ستايـشی دەكەن (چوونكە بێگومان هەر شتێكی هەيە هەمووی (زيكری) خوا دەكات ، بەلأم ئێوە لە زيكرو ستايشی ئەوان ناگەن ، چـوونكە بـە زووبـانی ئێـوە تەسبيحات ناكەن ، بەڵكو بە زوبانی تايبەتی خۆيـان دەيكـەن ، هـەروەكو ئادەميزاديش هـەر (قەومـە) بـە زووبـانی خـۆی قسە دەكـات وە كەسـيان لەوەی ترنيـان ناگـەن ، ئەگـەر خۆيـان فێرنـەكردبێ ، هـەروەها خـودا زۆر لێخۆش بووە بۆ ئەو كەسانەی كـە تەوبـە دەكـەن و پەشـيمان دەبنـەوە ، خودای تاك و تەنيا دەپەرستن و فەرمانەكانی جێ بەجێ دەكەن .

**( سەرنجێك )**

جا هەروەها خوێنەوارە ئازيزەكانم لەبەر تيشك و ڕووناكی ئـەم ئايەتـە پيرۆزەدا وە چەندين ئايەتی تر بۆمان دەرئەكەويێت كە هەموو شـتێك لـەم كەون و بوونەوەرەدا (تەسـبيحات) و (زيكـر) ی پـەروەردگار دەكـات هـەتا بـەردێكی ڕەق و تـەقيش بـەلأم هـەروەك ئايەتەكـە ئەفـەرمووێ ﴿وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ﴾ واتە ئێوە لە پاكانەو تەسبيحاتيان تێ ناگەن).

ئەگەر كەسێ پرسيار بكاو بڵێ (جەمادات) چۆن (تەسبيحات) ئـەكات ؟ لە وەلأمدا هەندێ (موفەسيرەكانی) تازە تأويلی ئەم ئايەتەيان ئاوا كردووە نموونە وێنەی ئەوەی كە دەرگـای خـانوو پێوەئـەدەی دەنگێكـی لێ پەيـدا ئـەبێ بـەزمانی حـاڵی خۆيـدا ئەمـە (زيكـرە) بـەلأم ئێمـە تێـی ناگـەين و هەروەكو ئايەتەكە ئامارەی بۆمان كردووە ، يان وێنەی ئەوەیكـە بـەردێك

له بەرد ئەدەی (تەقەیەکی) لێ پەیدا ئەبێ بە زوبانی حالّی خۆی ئەمە (تەسبیحات) و (زیکره)...هتد.) هەروەکو له پێشەوه گووترا (والله أعلم).

## ( ئاگادارییەکی گرنگ )

بۆ تەفسیرو راڤەکردنی ئەو ئایەتەی پێشوو ، مامۆستای پایەبەرزو خوالێخۆش بوو مەلا (عبدالکریمی مدرس) له تەفسیری (نامی) [1] دا چەند باسێکی گرنگی لەسەر هێناوەو ئینجا ئەفەرموێت ﴿ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴾ سوورەتی الإسراء: ٤٤، (خودای عالەم خودایەکی وەهایە هەر حەوت ئاسمانەکان (تەسبیح) و (تەنزیهی) ئەکەن له (شەریك) واته له هاوبەشی هەروەها عەرز به ووشك و تەڕیەوه ئەو کەسانەیش وان له ئاسمان و عەرزدا له ئادەمیزادو له (جین و فریشتەو هیچ شتێ نیە له کائیناتا تەسبیح و تەنزیهی خودا نەکا له عەیب و کەمی بەتایبەتی له هاوڕێ بەلاّم ئێوه له تەسبیحاتەکانیان تێ ناگەن چوونکه ئەوەندە (مەشغولی) یادو ناوی خودا نەبوون هەتا حالّەتێك و مەلەکەیەکی نەفسی وەهاتان بۆ پەیدا ئەبێ که لەو تەسبیحاته حالّی ببن وه لەگەلّ ئەوەدا که سەعی ناکەن بۆ گەیشتن بەو پایه ، بەڕاستی خودا حەلّیم و خاوەن (لوطفة) که لەسەر ئەوانه تۆلّەتان لێ ناسێنێتەوه ، وه تاوانبەخشه که

---

(1) بڕوانه تەفسیری نامی بۆ قورئانی پیرۆز ، دانراوی مامۆستا (عبدالکریمی مدرس) بەرگی چوارەم ، لاپەڕە ٥٩٧.

لەبەر (غافلّ) بوونەکەتان سزاتان نادا ، جا مادام خودا ئەوەندە گەورە بێ کە (کائینات) هەموو تەسبیح و تەنزیهی بکا سەناو ستایشی زاتی بکەن چۆن ڕەوایە ئەو (کافرە) موشریکانە بڕیاری (شەریك) بدەن بۆ ئەو زاتە موقەدەسە ؟ (بزانن) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا گەلێ لە خاوەن تەفسیرەکان فەرموویانە ئەم (تەسبیحاتە) بریتیە لە (تەسبیحێك) کە بە زمانی حالّ بێت واتە لەم ڕووەوە کە ئەمانە لە مومکیناتی وە صیفەتی ئیمکان شت موحتاج ئەکا بە (صانیع) و پەروەردگار وە حادیثنی و (حودوث) و دەرچوونی لە نەبوون بۆ پایەی بوون ، پێویستی بە (فاعیل) هەیە ئەمانە دەلالەت ئەکەن لەسەر (وجودی) صانعی (واجب الوجود) و تاق و تەنیا ، وەئەم تەسبیح و ستایشە بە جۆرێکی تر نیە ، بەلاّم من بە ئیستیناد لەسەر (زاهیری) ئایاتی زۆر چەن حەدیسێکی (شەریفا) ، بە دەلیلی عەقلّی و ئیستیدلال بە (ئاثار) باوەڕم وایە ، کە ئەم تسبیحات و سوپاس و ستایشە هەموو (بەتەرتیبێکی) وایە شیاوی ئەو شتانە بێ غەیری دەلالەتی حالّ لەبەر ئەوە خودا توانایەو ئایەت و حەدیسەکانیش زاهیرن بۆ مەبەستی ئێمە ئیتر پێویست نییە لا دەین لە (زاهیر) .

**( دەلیل لە ئایەت )**

یەکەم : ئەم ئایەتە کە ئێستا باسی ئەکەین وە بەتایبەتی (جوملەی) ﴿ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾ چوونکە ئەگەر مەبەست دەلالەتی حالّ واتە دەلالەتی ئیمکان و حدووث بێ ئەوە هەموو زانایەکی میانە ئەیزانی جا کە وابێ مانای تەسبیحەکە وەکو کەلیمەی (سُبحانَ اللهِ وَبحمدهِ) وێنەی ئەوانە

.دووەم: ئایەتی ﴿ يُسَبِّحُ لِلَّهِ ﴾ .

سێ یەم : ئایەتی ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ ﴾ .

چـــــوارەم: ئایـــــــەتی ﴿ إِنَّا سَخَّرْنَا ٱلْجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحْنَ بِٱلْعَشِىِّ وَٱلْإِشْرَاقِ ﴾ سـوورەتی ص: ١٨، چـوونکە ئەگـەر مەبەسـت دەلالـەتی حـالْ بـێ ئـەوە (خاص) نییە بەیانی و ئێوارە ، بـەلْکو هـەتا زاتـی ئـەو شـتـە هـەبێ ئـەوە دەلالەتە لازمی ذات و ماهیەتی تیا نیە .

پێنجەم: ئایەتی ﴿ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾ سوورەتی البقرة: ٧٤، کە زاهیرە لـەوەدا بـەردی ڕەقـی ووشك لە خودا ئەترسێ و شەق و پەق ئەبێ ، زیاد لەمانەش گـەلێ ئایـەتی تر هەیە .

## (دەلیل لە حەدیث)

وەکو ئەوە حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (لَايَسْمَعُ صوت المؤذّن جِنّ وَلا إنسٌ وَلا شَجَرٌ وَلا حَجَرٌ وَلا مَدَرٌ وَلا شيء إلاّ شَهَدَ لَهُ يوم القيامة) واتـە : دەنگی بانگدەر نابیسێ جنی یا ئادەمی یا دار یا بەرد یا گلْ مۆتك یا شتێ ئیللا لە ڕۆژی قیامەت شایەتی بۆ ئەدا ئەوە (مەعنای) وایە کە لـە دونیـادا ئەو شـتانە هـەموو بانگەکـەیان بیـستووە بۆیـە ڕۆژی قیامـەت لـە حـزوری خودادا شایەتیان بۆ ئەدەن ، وە هەروەها لە (بوخـاری شـەریفدا لـە ئـیبن مەسعودەوە (ریوایەت) ئەکاو کە فەرمویەتی (كُنا نأكلُ الطّعامَ مَعَ رسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم) ونَحنُ نَسمَعُ تسبيحَهُ) وە لە صحیحی (موسلیمدا

(ریوایەت) ئەکا لە جابرەوە لە ئیبن و سومرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێت پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إنّي لأعْرِفُ حَجراً بِمكّةَ كانَ يَسلِمُ قَبلَ أن أُبعَثَ إني لأعْرِفهُ الآن) هەروەها (حەدیثی) نالآندنی ئەولقە دار خورمایە کە حەزرەت (ﷺ) وەختی خۆی پاڵی پێوە ئەدا لەکاتی (خوطبة) خوێندنا وە لە پاشا گوێزرایەوە لەوێ و ئینجا ڕۆیشتە سەر میبنەر ... ئەو حەدیسە زۆر (مەشهورە) لەناو (محدثین) بە متواتری دائەنێن و وە هەروەها ئیبن و عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) ریوایەتی کردووە کە حەزرەت (ﷺ) ڕابوورد بەلای دوو (قەبرا) فەرمووی ، ئەمانە سزا ئەدرێن و سزاکەیان لەسەر گوناحێکی گەورە نییە ، یەکێکیان ئەڕۆیشت لە ناو خەڵکدا چلۆ چۆیی[1] ئەکرد وە یەکێکیشیان لەکاتی (تارەتا) خۆی پاك نەدەکردەوە لە مین) جا (ئەمری) فەرموو لقە خورمایەکیان بۆ هێنا ئەویش کردی بە دوو پارچەوە هەریەکی لەوانە لەسەر (قەبرێ) واتە گۆڕێ چەقاند وفەرموی تکام وایە لە خوای میهرەبان سزاکەت سووك ببێ و مادام ئەم دارە تەڕبێ و ئەمەش (ئیشارەیە) بۆ ئەوە مادام ئەو دارە تەڕبێ و (تەسبیحی) خودا ئەکا و جا هەرچەن ئەمە نابێ بە (دەڵیل) بۆ (تەسبیحی) جەمادات شتی وەشك و بێ ڕوح ، بەڵام ئەبێ بە دەلیل و بەڵگە (تەسبیحی) بێ زمان وەکو داری هیشك و بەرد و گەستەك و شتی تر...هەتا دوا کۆتایی....هتد).

وە هەروەها ئەبو زەڕی غەففاری (خوا لێی ڕازی بێت) ریوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (ﷺ) حەوت بەردی بچووکی هەڵگرت بەدەستی

---

(1) چل و چۆیی : مەبەست قسە هێنان و بردنە ، واتە فەسادی و دووزمانی لەنێو خەڵکا.

خۆی و ئێمە (تەسبیحی) ئەو بەردانەمان بیست لەپاشان خستنیە دەستی ئەبوبەکرو ئینجا لەدەستی ئەویشا (تەسبیحیان) کرد جا خستیە دەستی (عومەرەوە) لە دەستی ئەویشا (تەسبیحیان) کرد ، جا خستیە دەستی (عوسمانەوە) لە دەستی ئەویشا (تەسبیحیان) ئەکرد ئەم حەدیسە ئیمام (بّزار)و طبرانی و بەیهەقی (ریوایەتیان) کردووە ، وە هەروەها لە (ریوایەتی) لە (طبرانی)یدا ئەڵێ هەر کەسێ لەوە حەلقەدا بوو هەموودەنگی تەسبیحەکەیان ئەبیست ، وە کاتێ کەوتنە دەستی ئێمە دەنگیان نەبیسرا وە هەروەها ئەمانە هەموو دەڵێن لەسەر ئەوە کە (تەسبیحاتی) جەمادات بە شێوەی قسەی بیسراو بووە[1]

## باسێك لە گەورەیی (تەسبیحات) کردن

(عَن أبي هريرة – رضي الله عنه) قالَ رَسُولَ الله صلى الله عليه وسلم) واتە : لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێبێت) ئەڵی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (كَلِمَتانِ خَفيفَتانِ عَلى اللِّسان ثَقيلَتانِ في الميزانِ حَبيبَتانِ إلى الرّحمانِ(سُبحانَ اللهِ وَ بِحَمدهِ سُبحانَ الله العظيم) متفق عليه، واتە : بێگومان ئەم وێردو زیکرەیە دوو ووشەیە : کە لەسەر زمان زۆر سووك و ئاسانن لە تەرازووی خودا زۆر قورسن وە بەلای خوای گەورە زۆر خۆشەویستن وەك پاك و بێگەردی و سوپاسی خوای گەورە ئەگەیەنن) (عَن أبي ذَرٍ (رضي الله عنه) قالَ رَسول الله (صلى الله عليه وسلم) ، ألا

---

(1) بڕوانە تەفسیری (نامی بۆ قورئانی پیرۆز) دانراوی مامۆستا مەلا (عەبدولکەریمی مودەریس) بەرگی ٤ لاپەڕە ٦٠٠.

أخبرك بِأحب الكَلام إلى الله تعالى ؟ إن أحب الكَلام إلى الله تعـالى سُبحان اللهِ وَبحَمدِهِ، واته : له ئەبو زەڕەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی پـێم یـا پێـی ڕاگەیانـدم و فـەرمووی هـەواڵت بـدەمێ لـەبارەی خۆشەویـست تـرین ووتەیـەك لـەلای خـوا ؟ چـوونكه بەڕاسـتی خۆشەویست ترین ووشەیە كه لەلای خوا (سبحان الله وَ بِحَمدِهِ) رواه مسلم ، وفي روايةٍ عِندَ الترمذي والنسائي(سُئِلَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) أيِ الكَلامِ أفضَلُ ؟ قالَ ما أصطفى اللهُ لِمَلائكَتِهِ أو لِعِبادِهِ سُبحانَ الله وَبِحَمدِهِ) رواه الترمذي والنسائي ، وه هـەروەها لـه گێڕانەوەیـەكی ئیمـامی ترمـذي و نسائي) دا هاتووه كەوا پرسیار كرا له پێغەمبەر (ﷺ) چ ووتەیەك لـەلای خوا گەورە چاكترو باشترینه ، جا فەرمووی ئەوەی كه خوای گەورە هـەڵی بژاردووه بۆ فریشتەكانی یان بەندەكانی كه بیڵێن (سُـبحان الله وَبِحَمـدِهِ)، چونكه بێگومان له(حەدیسا) هاتووه زیكری (سـبحان الله وه بحمیـده) یـا (الحمد لله) خێری ئەوەنده زۆره نێوانی ئاسمانو زەوی پڕ دەكەن لەبوونی خۆشداو لای خواو فریشتەكان.

(عَن جابرِ – رضي الله عَنه) قالَ قالَ رسول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) مَن قالَ سُبحان الله العظيم وَبَحمده غرسَت له نخلَـةٌ في الجَنـة) رواه الترمـذي وحَسَنَهُ) له جـابرەوه (ڕەزای خـوای لێبێـت) ئەگێڕێتـەوه ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـــەتی، هەركەســێ ئـــەم (زیكـــره) بڵـــێ لـــه بەهەشـــتا دار خورمایەكی بۆ دەچێنرێت واته ، دەڕوێنرێت).

## باسێك لە پلەو پایەی زیكركردن و پاداشتەكەی

عن جابر بن عبدالله (رضي الله عنهما) قال سمعت رسُول الله (ﷺ) يقول (إن افضَل الدعاء الحمد للهِ وافضل الـذكرِ لا الـه الا الله) رواه الترمـذي وابـن ماجه.

واته لەجابری كوڕی عەبدوڵڵاوە (خوایـان لـێ رازی بێـت) ئـەڵێ گـوێم لەپێغەمبـەر خوابـوو (ﷺ) ئەيفـەرموو باشـترين دوعـا (الحمـد لله) واتـە سوپاس بۆ خوا كردنەو وەگەروەترين (زيكر)يش زيكرى (لا الـه الا الله)يـە جا هەروەها لەفەرمودەيێكى تردا. لەئەبى هورەيرەوە (خوای رازی بێت) ئەگێڕنەوە كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموويەتى هەركەسێ بڵێ (لا الـه الا الله وحده لا شريك له له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير)[1] لەرۆژێكـدا سەدجار وەكو ئەوە وايە گەردنى (دە) بەندەى ئازاد كردبێتو سەدچاكەی بۆ نووسرابێ وسەد خراپـەى لـێ سـڕابێتەوەو دەبێتـە پارێزگـارى بـۆی لـە شەيتان لەو رۆژەيدا تا ئێوارە دەكاتەوە.

وەهيچ كەسێك لەوچاكترى نەكردووە مەگەر كەسێك لەوەزياتر ئـەنجام بدات وەهـەروەها دەفـەرمووێت (هەركەسـێك بڵـێ (سـبحان الله و بحمـده) لەرۆژێكدا (سەدجار) ئەوەگوناهەكانى لـێ دەوەرێـت بـا بەئەنـدازەى كـەف دەريابێت.

---

[1] ئەم فەرموودانە پێشەوا بوخارى موسليم –ريوايەتيان كردووە.

## پاشکۆ

جا هەروەها بێگومـان (موشـایەخەکانی ئـەهلی عیرفـان و تەصـەووف) ئەفەرموون هەندێ زیکر و(تەسبیحات) هەیە گونجاوە لەگەڵ هـەموو کـاتو ساتێکداو وەکـو وێنـەی (لا الـه الا الله والله اکـبر والحمـد لله وسـبحان الله) بـەڵام زیکـری (الله) واتـە زیکـری (لا الـه الا الله) واتـە (ئەفیوئیـسباتە) (لا الـه)نەفیـە (الا الله) ئیـسباتەکەتی[1]. جگـە لەمـەش ئـەم ویـردوو زیکرانـە لە(باقیات الصالحاتە) وهەروەکو حەرزەتی.

ئەبوو هوەیرە ئەگێڕێتەوە لەپێغەمبەر (ﷺ) دەقـە کـە ئەمەیـەو (عـن ابـی هریـره (رضـي الله عنـه) قـال – قـال رسـول الله (ﷺ) (سـبحان الله الحمد لله ولا اله الا الله والله اکبر هن الباقیات الصالحات) رواه احمد وغـیره (واتــە لەئــەبوو (هــورەیرەوە)ئــەڵێ پێغەمبــەر خــوا (ﷺ) ئەفــەرمووێ (سـبحان الله والحمـد لله ولا الـه الا الله والله اکـبر) ئەمانـە ئـەو چـاکانەن کەدەمێننەوەو نافەوتێن).

(سبحان ربك ربّ العزة عما یصفون وسـلام علـی المرسلین والحمد لله رب العالمین)

---

(1) بەڵام ئەبێ بزانین هەندێ زیکریش هەنەو تایبەتە بەکاتو شوێنی خۆیەوەو ..هتد

# (ئامۆژگاری سی و دووهەم ،
# باسی فەزڵ و گەورەیی ( الحْمدُلله ) ئەکات )

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله ما توفيقي وَالإعْتصامية إلاّ بالله عليهِ تَوكلت وإليه أنيبُ وَ أتوب إليهِ الحَمدُ كُل الحَمدُ لله تَبارك وَتعالى أحمْده حمْداً كثيراً ،أحمَدَهُ والإهتداء لِحَمدهِ من أعْظَم الإنعام وأشكرهُ شُكراً عَلى نِعمَةَ الإسلام والإيمانِ ، الحَمدُ للهِ الذّي هَدانا لِهذا وَما كُنا لِنَهتَدي لَولا أن هَدانا الله) وَ أشهَدُ أن لا إله إلا الله الحَميدُ المَجيد وَلَهُ الحَمدُ وَهوَ عَلى كُل شيء قدير ، وَ أشهَدُ أنْ سَيدَنا وَ مَولانا مُحَمداعَبدُهُ وَرَسولَه أفْضَلُ الحَامدينَ فصلاواةُ الله وَسَلامهُ عَليهِ وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ وَأتباعهِ وأنْصَارهِ وأحبابهِ ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴾ سوورەتی الأحقاف: ١٤.

أما بَعدُ فَيا أيّها المؤمنون الكِرام/ واتە لەدوایی هەندێ ئەی برایانی خاوەن ئیمان و بەڕێزانم (أوصيكم بتقوا الله وطاعَتهِ وَ كَثرَةَ مَخافَتهِ) واتە : وەسیەتتان دەکەم بە تەقوای خواو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا هەروەها پەیڕەو کردن و بە ترسانێکی زۆر لەخوای پەروەردگار چوونکە هەرکەسێ بە درووستی لە خوا بترسێ و بێ ئەمری خوا نەکا .

جا خاوەن باوەڕان/ ئەگەر بەڕاستی و بە ووردی بیر لە گەورەترین پەڕەتووکی – ئاسمانی بکەینەوە کە قورئانی پیرۆزە بۆمان ڕۆن ئەبێتەوە کە خوای مەزن لە قورئاندا لەدوای (بِسْمِ اللهِ الرّحمَنَ الرّحيم) دا فەرموویەتی (الحَمدُ للهِ) واتە سوپاس بۆ خودا جا هەروەها پێویستە هەرکاتێ (قەصدی) کارو فەرمان و کردەوەیەکی چاکت کرد لەپاش ناوی

خودادا (حەمدو سەنای) خوات لەیاد نەچێ بەقەدەر توانا حەمدی خوا بکە تا لە دونیاو قیامەت دەست بکەوێ و لەهەردوو دنیا دا سەربەرزبی و جا هەر لەبەر ئەو (حیکمەتانەیە) کە زاناکانی ئایینی ئیسلام لە پێشەکی هەموو (نوسوراوەکانیاندا) لەدوا ناوی پیرۆزی خودا (بسم الله) و ناوی خودا (حەمد) و سوپاس و شوکرانەی خوایان تێدا کردووەو . هەروەها بەرێزان پێغەمبەری خۆشەویستمان (دروودی خوای لەسەر بێت) لە فەرمودەیەکدا فەرموویەتی (إن الله يُحب أن يُحمَدَ) رواهُ الديلمي : واتە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە حەمدو ستایشی دەکەن و ، جا هەروەها (خاوەنی کتاب) ی (إعانة الطالبين) [1] دا ئەڵێ (وَ أعلَم أنه جاءَ في فضلِ الحَمد أحاديثَ كَثيرةٌ) واتە بێگومان بزانن لە بارەی حەمدو ستایشی خواوە فەرموودەیەکی زۆر هاتووە ، چوونکە ئەگەر تۆ حەمدو ستایشی خوای گەورەت کرد ئەوە ئەو نازوو نیعمەتانەت بۆ ئەمێنێ و دەوام ئەکات و دەبێتە (ئەمان — کە خوای گەورە) لێ بسێنێتەوە هەروەکو حەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (حَمدُ الله أمانٌ لِنعمَةِ مِن زَوالِها) هەروەها سوننەتیشە دوعاکردنی جل و بەرگ لەبەرکردن کە ئەوکاتەی لەبەری ئەکەیت و بڵێ (الحَمدُ اللهِ الذّي كَساني هذا الثَوبَ وَرَزقنيهِ مِن غَيرِ حَولٍ مِني وَلا قُوة) رواه أصحاب السنن، واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەم بەرگ و پۆشاکە داپۆشیم وەبێ هەوڵ و هێزی خۆم ئەم بەرگ و پۆشاکەی پێدام)..

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (حاشیەی) (إعانة الطالبين على فتح المعين) دانراوی (زين الدين عبدالعزيز الميلباری الشافعی) بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٢.

## ( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )

١) سوننەتی پێغەمبەرە (ﷺ) کاتی (نان و ئاوت) خوارد پێش ئەوەی دەستی پێ بکەیت بڵێ (بسم الله) بکەن و ناوی خوا بهێنن وەکاتی کە دەستی لەسەر هەڵدەگرن (الحَمدُ لله) بکەن و شوکرانە و ستایشی خودای لەسەر بکەن و بڵێن (حەمدو ستایش) بۆ خوای بەخشندە کە گێڕاویەتی بە ئاوێکی شیرین و خۆش بە (رەحمەتی خۆی)، وە هەروەها نەی گێڕاوە بە سوێر و ترش و تاڵ بەهۆی گوناهو تاوانەکانمانەوە هەروەکو ئەفەرموێت (الحَمدُ لله الَذي جَعَلَهُ عَذباً فُراتاً وَلَم يَجعَلهُ مِلحاً أجاجاً بِذنوبنا) چوونکە بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) لە حەدیسی صەحیحدا ئەفەرموێت: (إنَ أفضَل الدُعاءِ الحَمدُ للهِ وَأفضَلَ الذكرِ لا إله إلا الله)[1] رواه مسلم في صحيحه، واته : بێگومان باشترین دوعا (الحمدُ لله) یەو ، هەروەها باشترین زیکریش (لا إله إلا الله) یە ، ئەگەر خوا حەزکات لە جێگای خۆی (فەزائیلی – لا إله إلا الله) دەنووسین .

٢) لە کاتی پژمیندا سوننەتە بڵێی (الحَمدُ لله) ، عَن أبي هريرة (رضي الله عَنهُ) عَن النَبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ، إذا أعطس أحَدُكم فَليَقُل – الحَمدُ لله – وَليَقُل لَهُ أخوهُ أو صاحِبهُ –يَرحَمُكَ الله – فإذا قالَ لَهُ يَرحَمُكَ الله فَليَقُل : يُهديكُم الله وَيُصلِح بالَكُم) رواه البخاري.واته : ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی بابڵێ (الحمدُ لله) واتە سوپاس بۆ خودا ئەوجا براکەی یان هاوڕێکەشی پێی بڵێ (يَرحَمُكَ الله) واتە خوا رەحمەت پێ بکات) ئینجا

---

([1]) ئەم فەرموودەیە لەپێشەوەش باسکراوە.

ئەویش پێی بڵێتەوە (يَهْدِيكُم الله وَيُصْلِحْ بَالَكُم) واتە : خودا (هیدایەت) و ڕێنومابیت بکات و حاڵت باش بکات)، جا هەروەها لە حەدیسێکی تردا هاتووە هەروەکو ئەڵێ : عَن أبي موسى الأشعَري (رضي الله عنه) قالَ سَمِعتُ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول (إذا أعطَسَ أحَدُكُم فحمد الله تعالى فَشَمِتوهُ فإن لَمْ يَحمْد الله فَلا تُشَمِتوه) رواه مسلم و أحمد).واتە: لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ئەڵێ بیستم پێغەمبەری خوا دەیفەرموو ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی و سوپاسی خوای کرد ئێوەش پێی بڵێن (يَرحَمُكَ الله) بەلأم ئەگەر سوپاسی خوای گەورەی نەکرد پێی مەڵێن (يَرحَمُكَ الله) واتە خوا رەحمت پێ بکات).

٣) جا ئەگەر غەیری موسڵمان پژمی ئەوە تۆ چی پێ دەڵێیت ؟ دیسان ئەبی موسای ئەشعەری (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ : (كانَ اليَهُودُ يَتَعاطسونَ عِندَ رَسول الله (صلى الله عليه وسلم) يَرجونَ أن يَقولَ لَهُم يَرحَمُكم الله فَيَقول : (يَهديكُم الله وَيَصلح بالَكُمْ) رواه الترمذي و ابو داود ، واتە : لە (ئەبو موسای ئەوشعەریەوە) ئەڵێت ، جوولەکەکان لەلای پێغەمبەر (ﷺ) دەپژمین ئەوجا بە ئومێدی ئەوە بوون کە پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ خوا رەحمتان پێ بکات کەچی پێغەمبەر (ﷺ) ئەی فەرموو (خودا هیدایەتتان بدات و حاڵتان چاك بکات).

**( سەرنجێکی گرنگ )**

ئەی ئیمانداره بەڕێزەکان بەڕاستی ئەگەر ئێمە بەووردی سەرنجی گەورەترین پەرتووکی ئاسمانی بدەین کە قورئانی پیرۆزە ئەبینین کە

خوای گەورە لە قورئاندا لەگەڵ جێگەدا باس و ئاماژەی (الحمد لله) ی کردووە ، هەروەکو لە سورەتی (فاتحه) واتە سەرەتای قورئان لەدوا ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ فەرمویەتی ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ جا هەروەها ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە وەك پێمان بڵێی ئەی ئینسان ئەی نەوەی ئادەم وریابە وەکو وێردێکی سەر زمانت بێ و ئەمە لەیاد نەکەی و فەرامۆشی مەکە ، هەر کاتێ خەیاڵی کارو فەرمان و کردەوەیەکی چاکت کرد لەپاش ناوی خوا (حەمدو سەنای) خوات لەبیر نەچێ بەقەدەر توانا حەمدی خوا بکە تا بەهرەی دونیاو قیامەتت دەست کەوێ جا هەروەها بێگومان لە یاساو نیزامی ئایینی ئیسلامدا جاری وا هەیە حەمدی خوای گەورە لەسەر ئینسان فەرزە ، هەروەکو لە هەموو ڕکاتەکانی نوێژدا پێویستە (الحَمْدُ للهِ رَبِّ العَالَمِين) بخوێنی ، هەروەها یەکێ لە مەرجەکانی ووتاری هەینیدا دەبێ ووشەی (الحَمْدُ لله) بەکاربهێنی و ئەگەرنا ووتارەکە (بەتاڵە) جا هەروەها بەڕاستی (حەمدو سەنای) خوا زۆر گەورەیە ، ئەوجا پێویستە ئێمەش حەمدو سەنای خوای گەورە زۆر بکەین چوونکە حەمدو سەنا (نازو نیعمەت) زیاد دەکا هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) کاتێ تەشریفی لەخەو هەڵدەستاو پێش هەموو شتێك ئەو زیکرەی ئەکردو ئەیفەرموو: (الحَمْدُ للهِ الَّذي أحْيانا بَعْدَ مَمَاتِنـا وإليـهِ النّشور) رواه البخاري ومسلم ، واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی زیندوو کردەوە دوای ئەوەی کە ئێمەی مراند و گەڕاندەوە زیندوبوونەوەشمان هەر بۆلای ئەوە ، جا هەروەها ئیمامی (النووي) لە پەرتوکی (الأذكار) دا ئەڵێ (كانَ إذا أتـاهُ الأمرُ يَسرٌ قالَ (الحَمدُ لله الَـذي بِنَعمَتـه تـتَم الـصّالحاتِ) واتە : پێغەمبەر

(ﷺ) ئەگەر شتێکی دڵخۆشکەری بۆ هاتبایە دەیفەرموو سوسپاش و ستایش بۆ ئەو خوایە بەرزو بەڕێزەی کە بە نازو نیعمەتی ئەو ، هەموو شتە چاك و پاکەکان تەواو دەبێت وە هەروەها ئەڵێ (إذا أتاهُ الأمرُ يَكرهـهُ قالَ (الحَمدُ لله عَلى كُل حالٍ) رواه الحاكم وغَيْرِه، واتە : ئەگەر کارێکی بۆ هاتبایە کە دڵتەنگ و تووشی خەمی بکردبایە دەیفەرموو (سوپاس و ستایش بۆ خوای کردگار لە هەموو کات و سات و لەسەر هەموو حاڵ و بارێکدا) هەروەها لە ئیمامی عومەری کوڕی خەتابەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە فەرموویەتی گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) دەیفەرموو (مَن لَبِسَ ثَوباً جَديداً فَقالَ (الحَمدُ للهِ الذي كَساني ما أُواري بِـهِ عَورَتي وَأَتَجَمَّلُ بِهِ في حَياتي) واتە : هەر کەسێ پۆشاکێکی تازەی لەبەر کرد ئەم زیکرەی ووت کە تیایە سوپاسی خوای گەورە ئەکا کە ئەم پۆشاکەی پێ بەخشیوە تا (عەورەتی) پێ داپۆشێ وە لە ژیانیا خۆی بڕازێنێتەوە ، وە لە ڕیوایەتێکی تردا بڵێ (الحَمدُ لله الّذي كَساني هذا الثَّوبَ من غَير حَول مني وَلا قوة غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنبِهِ) رواه الترمذي، واتە : سوپاس و حەمدی ئەو خوایە ئەکەین کە ئێمەی پۆشیوە بە بەرگ و جلْ و لیباسەوە کە بێ ئەوەی هێزو تاقەتێکمان هەبێ ئەگەر ئەو پێمان نەبەخشێ و هەرکەسێ دان بەوە دابنێ خوای گەورە لە گوناهی ڕابردووی خۆش ئەبێ) ، وە هەروەها پێغەمبەریش فەرموویەتی (وَأَفضَلُ المَحامِدِ أَنْ يَقول العَبدُ الحَمدُ لله حَمداً يُوافي نِعمَهُ وَيُكافِيء مَزيدَهُ)[1] .

---

(1) واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت (چاکترین حەمدو سوپاسی خوا ئەوەیە کە بەندە بیکات و بیڵێت (الحمدُ لله حَمداً يُوافي نِعمَهُ وَيُكافِيء مَزيدَهُ) رواه الجماعة.

## (فائدة) واتە سودێك

(وَقالَ بَعضُ العارفين(الحَمدُ) ثَمانية أحْرُفٍ كأبواب الجنة قَالَها عَن صَفاء قَلبٍ إستَحَقَ أن يَدخُلَ الجَنة مِن أيّها شَاءَ)[1] ، واتـە: هەنـدێ لـە زانايـان و عارفان و پیپاو چاكان و خواپەرستان فەرمويتيان (الحمدُ لله) هەشت پيتەو ، هەروەها دەرگاكانی بەهەشتيش هەشتن و جـا هـەروەها گووتويانـە هـەر كەسێك بە دڵێكی پاك و صاف و بە ئیمان و باوەڕەوە ئـەو هەشـت پیتانـە بڵێ ئەوە شايەنی ئەوەيە بۆی ببنە (كليلی) كردنەوەی بەهەشت و دەرگای بەهەشت ، ئەوەی ئەو حەز بكات.

## (ئاگاداری)

جا هەروەها بێگومان ئەوەی ڕاستی بێت (الحَمدُ لله) مانای وايە حەمـدو سەنا هەركەسێك بيكا بۆ هەركەسێكی بكا بەهەر زمانێك بێ لەبەرامبەر هەر چاكەيەكدابێ ئەوە لە ڕاستی و حەقيقەت و (نفس الامر) دا هەر بۆ خوايـەو چوونكە هيچ كەس لە (حەقيقەتا بە حەقيقەت) موستەحەقی حەمدو سـەنا نييە خوا نەبێ ، ئينجا هەروەكو قورئانيش پێمان ئەفـەرموێت ﴿لَهُ ٱلْحَمْدُ فِى ٱلْأُولَىٰ وَٱلْءَاخِرَةِ﴾سوورەتی القصص: ٧٠، واتە : حەمدو سەنا لە دونيـاو قيامەتا هەر بۆ خودای گەورەيـە ، ئـەی خـاوەن بـاوەڕان، ئـەی ئوممـەتی پێغەمبەر (ﷺ) حەمدو سەنای خوای گەورە زۆر بكەن ، چوونكە بێگومان

---

(1) بروانە: (حاشية اعانة الطالبين على حل الفاظ فتح المعين) دانراوی (زين الدين عبدالعزيز المليباری) ج١، لاپەرە ١٢.

خوای گەورە زۆری پێخۆشە (عەبد) حەمدو سەنای خوا بکاو بۆ ئەوەی سەواب و پاداشتی زۆری بداتەوە ، چوونکە خوای مەزن فەرمان بە پێغەمبەر (ﷺ) ئەکاو پێی ئەفەرموێ : ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ ﴾ سوورەتی الأنعام: ١٦٢، واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) بەئیمانداره‌کان بڵێ بە ڕاستی نوێژو حەج و درووشمەکانی (سەرجەم چاکەو بەندایەتیم هەروەها ژیان و مردنم تایبەتە بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەوە).

جا هەروەها بێگومان پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك لە بن تیشکی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا بڵێت ئەی خوای گەورە نەك هەر خۆم بە (عەبدو) بەندەی تۆ دەزانم ؟ بەڵکو هەر چاکەو کردەوەیەك دەیکەم وەکو نوێژەکانم و ڕۆژەییەکانم هەموو عیبادەت و کردەوەکانم و ژین و حەیاتم هەروەها مان و نەمانم هەمووی بۆ خوایەو بەدەست خوایە ، ئەو خوایەی کە تاك و تەنیایە و شەریکی نییە (وای ئەمر) پێکردووم حەمدو سەنای خوای گەورە دەبێتە هۆی چوونە بەهەشتی ئینسانی خاوەن ئیمان لە دوارۆژدا ... چوونکە بێگومان هەروەها لەبەر گرنگی و گەورەیی (حەمدو سەنای) خوای گەورەیە کە خوای مەزن لە قورئاندا ئەفەرموێت : ﴿ وَقُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ ﴾ سوورەتی النمل: ٩٣، واتە : ئەی پێغەمبەر (ﷺ) تۆ بڵێ حەمدو سوپاس و سەنا بۆ خوا لێرە بەدواوە دەیان (موعجیزەو) بەڵگەتان نیشان دەدەم کە (دەلالەت) دەکەن لەسەر خوایەتی خوا) هەزار ڕەحمەت لەو کەسەبێ کە گوتوویەتی :

ئەی خوایەی ڕەوانەی کرد بە (لَولاکَه)

گەر لەبەر خاتری تۆنەبا خەلقی نەدەکرد ئەفلاکە

ئەو لە ڕۆژی قیامەت چ ڕۆژێکی سمناکە

کەسێ خۆشەویست شەفاعەتکاربێ ئەوە بێ باکە

شێخی سەعدیش لە گولستاندا[1] ئەفەرموێت :

چەغم دیوار اممت راکەدارد چون توپشتیبان؟

چەباك ازموج بحرآن راکە باشد نوح کشتیبان؟

واتە—قایمە دیواری ئوممەت تۆی هەبێ بۆ پشتیوان

کێ لە گێژی بەحر ئەترسێ نووح کە ببێتە کەشتیوان؟

## (تێبینیەکی گرنگ)

عَن أبي مالك الحارث إبن عاصم الأشعَري (رضي الله عنه) قالَ : قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) واتە : لە ئەبو مالیکی (ئەشعەری) دەگێڕنەوە کە دەڵێ حەزرەت (ﷺ) دەفەرمووێ (الطهوُر شَطر الأيمان) واتە : پاك گرتنی لەش و جلّ و بەرگ و ناو دلّ نیوەی ئیمانە، واتە : پاك و خاوێنی نیوەی باوەڕە هەروەها ووتنی (وَالحَمدُ لله تَملأُ الميزان) واتە : هەرکەسێك حەمدو سەنای خوای گەورە بکات خێرو پاداشتی ئەوەند زۆرە تەرازووی ڕۆژی قیامەت پڕدەکات، وە هەروەها ووتنی : (سُبحانَ الله وَالحَمدُ لله تَملأنِ أو تَملأ ما بينَ السموات والأرضِ) واتە: ووتنی ئەم دوو

---

(1) بڕوانە: پەرتوکی گولستانی سەعدی شیرازی لە وەرگێڕانی مامۆستا (سەفوەت) لاپەڕە، ١٩.

ووشەیە (سُبْحانَ الله وَ الحَمدُ لله) بەیەکەوە خێری ئەوەندە زۆرە نێوانی ئاسمان و زەوی پڕدەکەن لە خێرو خێرات و (ئەجر) و پاداشتەکان وەهەروەها پێغەمبەر (ﷺ)دەفەرموێ (الصلواةُ نورٌ) واتە نوێژ کردنی تەواو ڕووناکیە بۆ ناو کۆڕی تاریك (والصَّدَقة بُرهان) واتە خێرکردن بەلگەیە لەسەر باوەڕی خاوەنەکەی لە دونیاو لە قیامەتدا . (والصبرُ ضیاءٌ) واتە سەبرو ئارامگرتن لەسەر خراپە نەکردن خوا پەرستیە (والقرآن حُجّة لَكَ أوْ عَلَيْك) واتە قورئانی پیرۆز شایەتە بۆتۆ لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر ڕەفتاری پێکردبێ (وە یان شایەت لەسەرت ئەگەر کردارت پێ نەکردبێت) (کلّ النّاسِ تَغْدوُ فبائعٌ نَفسَهُ فَمُعتَقِها أو مَوبِقِها) رواه مسلم ، واتە هەموو کەسێك کە ڕۆژ داهات بەکارێك خۆی خەریك دەبێ جا هی وا هەیە خۆی ئەفرۆشێ بەخوای گەورە ئەمە خۆی ئازاد ئەکات لە ئاگری دۆزەخ و هی واشیان هەیە خۆی بە (شەیتان) ئەفرۆشێت وە خۆی ماڵ وێران ئەکات لە ڕۆژی دواییدا (خوا بمانپارێزێ بە لوتف و کەرەمی خۆی ئامین) .

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەراستی (تەعریفی) ئەهلی بەهەشت دەکاو ئەفەرموێت : ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سوورەتی یونس: ١٠واتە : دوعاو پاڕانەوەیان لە بەهەشتدا ئەمەیە) پەروەردگارا پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە ئەی خوای

میهرەبان چاکی و چۆنیشیان لەوێ سەلام کردنە ، دوامیین گوفتاریشیان دوای هەموو نازو نیعمەتێك دوای هەموو بەخشیشێك ئەوەیە کە پڕ بەدڵ ناخی دەروونیانەوە بەڕاستی دەڵێن (الحَمدُ لله رَب العالَمين) ... ئەوەبوو بە کورتی باسی تەفسیری (الحَمدُ لله) و باسی حەمدو سەنای خوای گەورەمان کرد ، خوایە گیان لەبەر خاتری خوایەتی خۆت (حەمدو سەنامان) قەبووڵ و گیرابکەو عەفومان بکە وەلە موسیبەت و دەردو بەلاّ بەدوورمان بخە ئامین).

(أقول قولي هذا وأستغفرالله لي ولَكُم ولِسائر المُسلمين ، وَ آخر دعواي أن الحمد لله ربّ العالمين).

# ئامۆژگاری سی وسێ

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( لا إله إلا الله ) ئەکات

الحَمدُ لله ثُمَ الحَمدُ لله مُوقظ القلوب الغافلة بالوَعظِ والتذكيرِ الآمر بالدّعوة إلى سبيلهِ بالحِكْمة والمَوْعِظَةِ الحَسَنَةِ والتَبَـصيرِ القائـل في كتابـه المـنير ... قَــــال تعــــالى ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾ سـوورەتی محمـد: ١٩، فيَجِـبُ علـى المُـؤمِنِ دائِمـاً يـذكر الله تعالى وَلاسيَما الذكر القَوْلي (بالتهليل والتسبيح والتحميد والتكبير) لأن هـذا النوع مُتيسَر للإنسان في كل أحوله سواءٌ كان راكباً أو ماشياً أو هو قـائمٌ أو قاعدُ أومضطجعٌ لأن الرسُول (صلى الله عليه وسلم) يقول : (وَأفـضَل الـذكرِ لا إله إلا الله) فينبغي الإكثار منها قالَ (عليه الصلاة والسلام) خـيرُ مـا قلـتُ أنا والنَبّيُّون مِن قَبلي لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَرَيكَ له لَـهُ المُلـك وَ لَـهُ الحَمـد وَهوَعلى كل شيء قدير) وَلما كانت هذه الكلمة العظيمة بهذه العالية من بين أنواع الذكر تعلق بها أحكام وصارَ لَها شرُوط ولَها معنـى ومقتـضى فليـست كلمةٌ تقال باللّسان فقـط وهـذه الكلمـة يعلنهـا المسلمون في الأذان والإقامـة والخُطَب) وهي كلمة قامَتْ بها الأرضُ والسّموات ، وخلقت مـن أجلِهـا جَميـع المخلوقـات ، وَهـيَ كلمـة الإسـلام ومفتـاح دار الـسلام ، وهـي كلمـة التقـوى والعروة الـوثقى وهـي كلمـة الإخـلاص وبهـا تكـون النّجـاةُ مِـنَ الكُفْـرِ والنّـار والخلاصِ ، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَـهُ ، وَ أشـهَدُ أن سـيدنا محمداً عَبدَهُ وَرَسوله والصلاة والسلام عليه وَعَلى أله وأصحابه والتابعين لَهُم

بإحسانٍ الى يوم الدين).

أما بعد أوصيكم عيباد الله اتقوا الله) واتـه : لـەدوای هەنـدێ موسـڵمانە بـەڕێزەكان وەسـیـەتتان لێ دەكـەم بەتـەقواو لـەخوا ترسـان و، وە فەرمانەكانی جێ بەجێ بكەن وەیادی خـودا زۆر بكـەن بەتایبـەتی زیكری ووشەی (لا إله إلا الله) چوونكە ئەو (زیكرە) خێرو پاداشتێكی زۆر گـەورەی هەیە ، وەكو ئـەم فەرموودانـە كـە لەمـەودوا دێـن روونـی ئەكەنـەوە ، جا هەروەها لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێبێت) ئەگێڕنەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (ما قالَ عَبدٌ لا إله إلا الله مُخْلِصاً إلاّ فُتِحَت لـه أبـوابُ السّماء حتّى يقتضي إلى العرش ما اجْتنبت الكبائر) رواه الترمذي : واتـە : هەرعەبدو بەندەیەك بە (ئیخلاص) واتە بە پاكی و بێگەردی بڵێت لا إلـه إلا الله ئەوا دەرگاكانی ئاسمانی بۆ ئەخرێتە سەرپشت هەتا ئەو ووتەیە بگاتـە (عەرش) بەو مەرجەی لە گوناهە گەورەكان خۆی بپارێزێت .

## ( چەند ئاگادارییەكی گرنگ )

١) مانای (لا إله إلا الله) پێویستە لێرەدا بزانین كە مانای ووشەی (إلـه) چی یە ؟ لە زمانی عەرەبیدا (إلـه) ئەوەیـە كـە شـایانی پەرسـتن بـێ واتـە یەكێكە لەو پەڕی دەسەلآت و هێز و پلەی بەرزی دایە لەبـەر ئـەوە شـایانە كە هەموو ئینسانێك بیپەرستێ و كڕنوشـی بـۆ ببـات و پـەیڕەوی بكـات و هەروەها مانای (إله) وا ئەگەیەنێ كە هـەرگیز پێویسـتی بـە كـەس نیـە وە هەروەها بەهیچ شتێ نییە بـەلآم هـەمووو كـەس پێویسـتی بـەو هەیـە وە ناچارن كە داوای یارمەتی لێ بكەن لەهەموو كاروبارێكی ژیاندا .

**تێبینی:**

جا هەروەها بێگومان مانای (إله) ئەوەی تێدایە کە یەکێکە مرۆڤ ئەو توانایەی نەدراوەتێ کە بتوانێ ببینێ هەروەکو حەزرەتی موسا (سەلامی خوای گەورەی لێبێت) داوای کرد خوای گەورە ببینێ هەروەك خوایە گەورە لە سورەتی (ئەعراف) دا ئەم باسەمان بۆ ئەگێڕێتەوە وەئەفەرموێت : ﴿ قَالَ رَبِّ أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَ ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٤٣.

واتە : موسا بۆ پتر دڵنیایی و خۆشەویستی بەپەرۆشەوە ووتی پەروەردگارم خۆتم پێ نیشان بدە زۆر ئارەزوومە بت بینم ﴿ قَالَ لَن تَرَىٰنِي ﴾ واتە: خوا فەرمووی موسا هەرگیز لەم دونیایەدا تۆ ناتوانی بمبینی ، چونکە بوینیە ئادەمیزاد ئێستا لەم دونیایە توانای بینینی خوای نیە ، چونکە بڕوانە پێغەمبەران (ﷺ) لەم بارەیەوە توانای دیتنی خوایان نەبێ ئەدی ئینسانێکی (عادی) وەکوئێمە چۆن ئەتوانێ خوای گەورە لەداری دونیادا ببینێ وە بۆ ئێمە مەمانان ئەمە مەحاڵە ، مەگەر فەخری عالەم نەبێ[1] بەڵام لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو گومانیەو چوونکە پێویستە هەموو موسڵمانێك ئیمان و باوەڕی ببێ کە لە قیامەت بە حضوری ذاتی خودا ئەگاو چاوی پێ ئەکەوێ بەبەڵگەو دەلیلی فەرمودەی خودا کەلە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ ﴾ سوورەتی القیامة: ٢٢

---

(1) جا هەروەها بێگومان لە (إسراو – میعراجدا) پێغەمبەر (ﷺ) خۆشەویستمان بە خزمەت خوا گەیشتو بەچاوی سەر خوای گەورەی بینیو ئاخاوتنی لەگەڵ کردو زۆر ڕێزی لێ ناو.

واتە: بەمەرجێك ئەو ڕۆژە ڕوخسارانێك گەشاوەو ناسك و ئاسودەن ﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ سـورة القيامـة: ٢٣چـوونکە هەریەکـەو بۆخـۆی تەماشـای پەروەردگاری دەکات لە تەماشاکردنی تێر نابێت جا بێگومـان جـەماوەری زانایـان وەك لـە چـەندین فـەرموودەی ڕەواو (صـحیح) وەرگـیراوە دەڵـێن مەبەست لەم ئایەتە ئەوەیە کە لەڕۆژی قیامەتدابەندە ساڵحەکان تەماشای خوای خۆیان دەکەن و بەچاوی خۆیـان دەبیـنن ، وەك چـۆن بـەئارەزووی خۆیـان تەماشـای مانگـە شـەوی چـواردە دەکـەن وەدەبینـنن هـەروەکو حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (إنكُم سَتَرونَ رَبكُم كَما تَرونَ القَمَرَ ليلة البَدر) رواه البخاري، واتە : ئێوە لەمەودوا لە ڕۆژی قیامەتدا خوای خۆتان ئەبینن هەروەکو مانگی چواردە چۆن ئەبینن یانی بێگومان ئێـوە لەمـەولا خـودای خۆتان بە ئاشکرا ئەبینن واتە بەچاوی خۆتان)[1].

٢) خودای مەزن بەزوبانی خۆی ناوی ئەهێنێ و ئەیبا بۆ نموونە هەندێ لەو میللەتانە بانگی ئەکەن و ناوی پیرۆزی ئەبەن بەم ووشانە کـورد ئـەڵێ (خوا) مەبەستی (الله) یە و واتە خوای مەزنـە ، وە (فـارس) ئـەڵێ خـودای بزرگ واتە خودای گـەورە وەهنـدی ئـەڵی (دیوتـا) ئینگلیـز ئـەڵێ (گـات – گۆت) ئەوهاش ئەنوسرێ (God) هەروەها بە ئینگلیزی هـەموویان مانـای ووشەی (إله) ئەگەیـەنن هـەروەها لـە زمـانی جیهـان دا ووشـەیەکی دیـاری هەیە کە مانای (إله) ئەگەیـەنێ (الله) نـاوی خـوای پـەروەردگارە ، کەواتـە

---

(1) لە پەرتووکی (مصباح القلوب ومفرج الكروب) دا ئەڵێ ئەم (حەدیسە) متواترەو (١٤–١٥) ئەسحابە ڕیوایەتیان کردووە ، بڕوانە (مصباح القلوب ومفرج الكروب) لەنووسینی (عبدالرحمن مەلا تەها عبدالعزيز) ج١، ص٥٠٤.

ڕستەی (لا إله إلا الله) ئەوەیە کە لەم جیهانە دا هیچ کەس و هیچ شتێ نییە شایانی ئەوەبێ کە ئینسان پێ پەرستن و کڕنۆش و (سوجدەی) بۆ بەرن بەشێوەی فەرمان بەری و بەگوێ کردن تەنها خوای پەروەردگار نەبێ چوونکە هەر ئەو شایانی پەرستنەو وە ئەم زاتە مەزنە خاوەن فەرمان ڕەوایەکی نیە تەنها خۆی نەبێ چوونکە دەسەلآت و قودرەت هەر ئی ئەوە خاوەنی ئەرزو ئاسمان هەر ئەوە هەر بوونەوەرو جانەوەرو کەون و ماف الکون هەر ئەو (مودەبیرە) تەنها خوای گەورە نەبێ وە ئەوخوایە ژیری مرۆڤ سەرسامە تیایا چونکە هیچ چاوێك دەرکی ناکا و بۆی نابینرێ لە کاتێکدا ئەو هەموو چاوەکان دەرك دەکا و دەبینێ و بەوردیش ئاگای لە هەموو شتێکە تەنها ئەویشە کار ناسك و ووردبین و ئاگادار بە هەموو شتێك) جا هەروەکو خوا خۆی ئەفەرموێت ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ ﴾ سوورەتی الأنعام: ١٠٣ [(1)].

٣) ووتنی (لا إله إلا الله) بە دڵسۆزیەوە : عَن أبي سعيد قالَ : قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) (مَن قال لا إله إلا الله مخلصاً دَخَل الجنّة) رواه البزار وغيره ، واتە : (أبو سعيد) (خوا لێی ڕازیبێت) ، دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (هەر کەسێك بڵێت (لا إله إلا الله) بە ڕاستی بە دڵسۆزی ئەوا دەچێتە بەهەشتەوە).

عَن أبي هريرة (رضي الله عنه) أنه قال قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) جَدّدوا إيمَانَكُم كَيفَ نُجَدد إيماننا قالَ أكثروا من قولِ (لا إله إلا الله)

---

(1) بڕوانە پەڕتوکی (بەرەو ڕێبازی ئیسلام) لەنووسینی بەڕێز (مستەفا عەبدوڵلآ) لەگەڵ دەستکاری ،ل٨٦/ بڕوانە تەفسیری ڕەوان لە مانا و مەبەستی قورئان، لاپەڕە ٢٤٦

رواه أحمد بأسناد حسن، واته : له ئـەبو هـورەیرەوه خـوا لێـی ڕازی بێـت ئەگێڕنەوه ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: ئیمـان و باوەڕتـان تـازه بکەنەوه هاوەڵەکانیشی فەرموویان ووتیان ئەی پێغەمبـەر (ﷺ) جـا چۆن ئیمان و باوەڕمان تازه بکەینەوه ؟فەرمووی بـه ووتنـی ووشـەی (لا إلـه إلا الله) زۆر دووباره بکەنەوه .

عَن جابر (رضي الله عنه÷ قال : قالَ رسول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) واته له جابرەوه (خوا لێی ڕازیبێـت) ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (أفْضَل الذّكر لا إله إلا الله وَ أفضَلُ الدُّعاءِ الحَمْد لله)[1]. رواه النسائي وإبـن ماجة والحاكم ، واته : بێگومان چاکترین زیکر ووتنـی ووشـەی (تەوحیـده) یـانی (کلمـه التوحیـد) واتـه : ووشـەی یـەکتا پەرسـتی چـوونکه هـەموو پێغەمبەرەکانی خوا (صلى الله عليهم اجمعين) بانگەوازیان بۆ ئەم ووشـەیه کردووه هەروەکو خوای گەوره له قورئانـدا ئەفـەرموێت ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِىٓ إِلَيْهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدُونِ ﴾ ســـــوورەتی الأنبياء: ٢٥، واته : ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) پێش ناردنی تۆ هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێ پێمان ڕاگەیاندووه که جگه لـەخۆم هـیچ خودایـەك نییه کەوابوو تەنها من بپەرستن و بەدادوەرم دابنێن ، کەوا بوو هەر کەسێ کەسێکی تر جگه لەخوا بپەرستێ یان به دادوەری دابنێ شوێنکەوتووی بێ یەکتاپەرستی لەدەست ئەچێ و ئەبێته (مشرك) واته: دانەری هاوبـەش بـۆ

---

(1) واته : چاکترین پاڕانەوه سوپاسکردنی خوایه، ئەم فەرموودەیه دیسان دووباره کراوه لەبەر پێویستی باسەکه.

خوا هەروەك خوای گەورە لـە قورئـان فەرموویـەتی ﴿ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴾ سوورەتی الأنعام: ١٢١واتە: گەر گوێڕایەڵی ئەوان بن لە حـەرام و حەلال بێگومان ئێوە (مشرکن) واتە هاوبەشتان بۆ خوا داناوە[1].

٤) برایانی خاوەن باوەڕم فەزڵ و ووشەی (لا إله إلا الله) گـەلێ زۆرە لـە (حیـساب) نایـەت بۆنموونـە ئـەوەی باسـی ئەکـەین ئـەوە قەترەیەکـە لـە دەریاوە خاوەنی کتێبی (منهـاج الـصالحین) [2] ئـەڵێ (لا إلـه إلا الله) جـواز خـروج الإنـسان مـن حـضیرة الکفـر والـشرك والإلحـاد إلی حـضیرة الایمـان والتوحید والاسلام ، لا إله إلا الله لا إله غیره ولا رَبَّ سِـواهُ ، (لا إلـه إلا الله) والعبادة له وَحْدهُ والاستعانة به وحده ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ ، عن عثمان بن مالك (رضي الله عنه) قال : قالَ رسول الله (صلی الله علیه وسلم) إن الله تعالی قد حرم علی النار من قـال لا إلـه إلا الله یبتغـي بـذلك وجـه الله تعالی) رواه الشیخان، واتە: عوسمانی کـوڕی مالیـك (خـوا لیـی ڕازی بیـت) ئـەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (ئـەوە خـوای گـەورە لەسـەر ئـاگر حەرامی کردووە هەرکەسێك کە بڵێت (لا إلـه إلا الله) مـەرام و مەبەستیـشی ڕەزابوونی خوا بێت).

عن أبي سعید الخدري (رضي الله عنه) عن النبّي (صلی الله علیه وسـلم) أنه قالَ، قالَ موسی (علیه الصلاة والسلام) یـاربِّ علّمـني شـیئاً أذکـركَ بـە

---

(1) بڕوانە: پەرتوکی (عەقیدەی ئیسلامی لەسەر زاراوەی (أهل السنه والجماعه) لە نوسینی (مامۆستا عبدالله هەرتەل) لاپەرە ٩.

(2) بڕوانە (منهاج الصالحین من احادیث وسنة خاتم الأنبیاء والمرسلین) لە نووسینی بەڕێز (عزالدین بلیق)، ل١٢٦.

وَأدعوكَ بهِ) له ئەبو سەعیدی خدریەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی حەزرەتی موسا (سەلاّت و سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی ئەی خوایە فێرم بکە شتێکی وابکەم کە تۆم بێتەوە بیر (یان شتێکی وام فێربکە کە بەردەوام یادت بکەم و بپاڕێمەوە لەبەرت).قالَ قُل (لا إله إلا الله) قال یارب کل عبادك یقول هذا قالَ قُل (لا إله إلا الله) قالَ إنما أريدُ شيئاً تَخُصني بهِ قالَ يا موسى ، لَوْ أنّ السموات السّبع والأرضينَ السّبع في كفّة وَ (لا إله إلا الله) في كفةٍ مالَتْ بهم لا إله إلاّ الله) رواه النسائي وإبن حيان والحاكم ، واتە : خوای گەورە فەرمووی یا موسا بڵێ (لا إله إلا الله) ئینجا حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێبێت) فەرمووی ئەی خوایە هەموو خەڵك و بەندەکانی تۆ ئەم زیکرە ئەکەن و ئەوەیان لە فیکرەو ئەوە دەزانن ؟ بەڵام من شتێکم دەوێ هەر تایبەت بێ بۆ خۆم بێت ئەوجا خوای گەورە فەرمووی بە حەزرەتی مووسا ئەی موسا بەڕاستی ئەگەر هەر حەوت ئاسمان و هەرچی لەناویاندایە وە هەر حەوت کوڕەی زەوی و ئەوەی لەناویاندایە هەموو (غەیری) من وەهەروەها تەواوی زەوی بێتە لایەك لەگەڵ هەر حەوت ئاسمانەکان و هەمووی بێتە لایەك وە ووتەی (لا إله إلاّ الله) لایەك بێ گرانتر ئەبێ و ئەوەستێ خێرو پاداشتی قورسترە لای خوا .

٥) عن علي (رضي الله عنه) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) حَدّثَني جبريل (عليه السلام) قالَ يقول الله تعالى ، لا إله إلا الله حُصْني فَمَن دَخَلَهُ أمَنَ عَذابي) رواه ابن عساكر ، واتە : لە ئیمامی عەلیەوە (ڕەزای خوای لێبێت) لە پێغەمبەرەوە ئەگێڕنەوە ئەفەرموێت کەوا حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێبێت) خەبەری پێداوم کەوا خوای گەورە فەرموویەتی

(ووتـەی : (لا إلـه إلاّ الله) قـەلاّی منـه هـەر کەسێك بێتـه نـاو ئـەو قەلاّیـه بێگومان پارێزراو ئەبێ لە ئازاری من).

٦) عن أبي الدرداء (رضي الله عنه) أنه قالَ : قال النبيّ(صلى الله عليه وسلم) ليْسَ مِن عَبدٍ يَقولُ (لا إله إلا الله) مائة مَرة إلا بَعَثَـهُ الله يَـومَ القيامـة وَوَجهُهُ كَالقَمَرِ ليلة البَدرِ وَلَمْ يَرفَع لأحَدٍ يَومئذٍ عَمل أفضل مِن عَمَلـهِ إلا مَـنْ قال مِثل قَوله أو زاد) رواه الطبراني، واتـه : هـەروەها لـه (ئـەبی الـدرداوه ریوایەت) کراوه (خوا لێی خۆش بێت) ئەڵێ پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی (بەڕاسـتی هـەر بەندەیـەك سـەد جـار (لا إلـه إلا الله) بکـات و بڵێـت خـوا زیندووی ئەکاتەوه لـه ڕۆژی قیامەتـداو ڕووخـساری وەکـو مـانگی چـوارده ئەبێ وه هەروەها هیچ کەس کاری وەك ئەم کاره گەوره نییـه مەگـەر ئـەو کەسه که ئەوەندەی ووتبێ یا زیاتری وی).

٧) عَن ابي بكر (رضي الله عنه) قـالَ : قـال رُسُـولُ الله (صـلى الله عليـه وسلم) (عَليكم بذكري (لا إله إلا الله) والإستغفار وأكثروا منها فإن ابليس قالَ أهْلَكْتُ النّاسَ (بالذنوب) وَأهلَكوني بلا إله إلا الله والإستغفار فَلَما رأيتُ ذَلِكَ أهلكتهُم بالأهواء وَهُم يَحسَبون أنهم مُهتَدون) رواه أبو يعلي وغيره ، واتـه : له حەزرەتی ئەبوبەکر وەرگیراوه (خوا لێی ڕازی بێـت) کـەوا فەرموویـەتی پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی ئێوه زۆر زیکری ووشەی(لا إله إلا الله) بکـەن و بڵێن لـه گـەڵ (إستغفار) و پاڕانـەوه لـەخوای مـەزن چـوونکه بێگومـان شەیتان ووتویەتی بەڕاستی مـن خـەڵکی دونیـام بـه (هـیلاك) بـردوون بـه گوناهو بێ (شەرعی) کردن وه ئەوانیش دیسان منیـان هـیلاك کـردووه بـه زیکرو ووتنی (لا إله إلا الله) و پاڕانـەوه و ئیـستغفار کـردن ئـەوجا شـەیتان

ئـەڵێ ئـەمجا منـیش ، هـەواو هەوەسـیان بـۆ پەیـدا ئەکـەم ئـەوانیش وا تێدەگەن کەلەسەر کردەوەو ئیشی باشن .

## ( پاشکۆ )

جا هەروەها لە عبدالله ی کوڕی عومەرەوە (خوایـان لێ ڕازیبێـت) ئـەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (أُمِرْتُ أنْ أقاتِل النّـاسَ حَتـى (يَشهَدوا أنّ لا إله إلا الله وَأنّ محمداً رسول الله) ويقيموا الـصلاة ويؤتـوا الزكـاة فـإذا فَعَلـوا ذلك عَصَموا مني دمائهم وَ أموالَهُم إلا بِحَقِّ الإسلام وَحِسابَهُم علـى الله) رواه الشيخان، واتە: بەڕاسـتی فـەرمانم پێکـراوە لەلایـەن خـوداوە هـەتا خـەڵك شايەدی نەدەن (لا إله إلا الله وأن محمـداً رسـول الله) وە نوێـژ نەکـەن و زەکات نەدەن بجەنگم دژیان جا کاتێ ئەوەیان کرد خوێن وماڵیان لـە مـن ئەپارێزن بە مافی ئیسلام نەبێت وەلێ پرسینەوەشیان لەسەر خوایە[1].

جا هەروەها بێگومـان زۆربـەی ئـەهلی (حـديث) ئـەم فـەرموودەیان لـە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتووە هێناویانە کە حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (مَنْ كانَ آخِرُ كَلامِهِ لاَ إله إلاّ الله دَخَلَ الجَنة) ، واتە : هەرکەسێ دوا ووشەی قسەی پیرۆزی (لاإله إلا الله) بێـت دەچـێتە بەهەشـتەوە) أقـولُ قَـولي هـذا وأسغفر الله لي ولَكُم ولِسائِرِ المُسْلمينَ فَاسْتَغفروهُ إنَهُ كانَ غَفاراً).

---

(1) ئیمامی نەوەوی ئەڵێ ئەم فەرموودەیە زۆر گرنگ و (مهیمە) چوونکە بزانە (کافر) واتە بێ باوەڕ بەتەنها بە (شادە) هێنان مرۆڤ ئەبێتە موسڵمان و (خوایە لەسەر ئەم ووشە پیرۆزە بمانمرێنە ئامین).

# ئامۆژگاری سی و چوارەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی (واللە أکبر وَلا حَولَ وَلا قوة إلاّ باللە) ئەکات [1]

الحَمْدُ للهِ الذّي جَعَلَ ذكرهُ تَعالى مِنْ أجلِ الأعْمالِ لأنَ بِذكره تَطْمَئِنَ القُلوب وتتحسن الأحوال نحمده تعالى ونشكره علَى كُلّ عطاء ونوال ونستغفرهُ ونتُوبُ إليهِ من سيءِ الأقوال والأفعال ونشهدُ أن لا إله إلا الله الكبير المتعال ونَشهَدُ أنّ سّيدنا مُحَمَداً صَادِقُ الأقوالِ والأفعالِ (صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه الأبطال الذّينَ حارَبوُا كُلّ كُفْرٍ وضلال حتّى علا الدّين الحَنيف على كُل المَلَلِ مَن يطع الله ورسوله فقد سعد وأصاب ومن يعص الله وَرَسولَهُ فَقَد خَسِر وَخاب) .

(أما بعد أوصيكم عيباد الله إتقوا الله) واتە : لەدوای هەندێ موسڵمانان وەسیەتتان دەکەم ، بە تەقواو لە خوا ترسان وە هەروەها فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن وە یادی خوای گەورە زۆر بکەن بەتایبەتی ئەو وێردو (زیکرانەی) کە لە زاری پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگیراون و (مأثورن) واتە لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراون و جا بۆنموونە هەندێکیان باس ئەکەین :

١) جا هروەها حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (لأن أقول (سبحان الله والحمد لله ولا إله إلا الله والله أكبر) أحبُ إلي مِما طَلَعَت عليه الشمسُ) رواه

---

(1) ئەم زیکرە پیرۆزانە (استغفر الله ، سُبحانَ الله ، والحَمدُ لله، ولا إله إلا الله، والله أكبر، ولا حَولَ وَلا قوة إلا بالله) کۆتایی پێ هات بە شەرح کردنی فەزائیلی ئەم ووشە پیرۆزانە).

مسلم .واته : ئەفەرموێت (ووتنی ئەم چوار کەلیمەیە واتە ووشەیە بەلام خۆشەویست ترە لەهەرچی کە خۆر لێی هەلاتووە .

٢) هەروەها لە ئەبو زەڕی غەففاریەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە کە حەزرەت (ﷺ) پێی فەرمووە (ألاَ أُخْبِرُك بأحَبِّ الكَلام إلى الله) ، واتە : فەرمووی ئەایە هەواڵی خۆشەویست ترین ووتەت بدەمێ بەلای خواوە ؟ وتم هەواڵم بدەرێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : (أنّ أحَبَّ الكَلامِ إلى الله (سبحانَ الله وَبِحَمده) رواه مسلم والترمذي ولفظه (أحب الكَلام إلى الله عَزَّ وَجَل ما أصطفى الله لملائكته (سُبحانَ رَبي وَبحمده ... سُبحانَ رَبي وَبحَمدهِ) واتە: ئەفەرموێت ئەم (زیکرە) خۆشەویست ترین ووتەیە بەلای خواوە کە بۆ فریشتەکان هەڵی بژاردووە[1] واتاکەشی بریتیە لە دەربڕینی وپاك و بێگەردی و سوپاس بۆ خوا.

٣) جا هەروەها لە ئەبو سەعیدەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە کەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (أكثروا مِنْ البَاقِياتِ الصَّالِحاتِ) واتە : ووتنی ئەو ووشە پیرۆزەو چاکانە کە ئەمینێتەوە ئینجا ئێوەش زۆری دووبارە بکەنەوە .

ئەوجا ووترا ئەمانە کامانەن ئەی پێغەمبەری خوا ، جا ئەویش لە وەلامدا فەرمووی (التكبير ، والتهليل ، والتسبيح ، والحمد لله ، ولا حَولَ ولا قُّوةَ إلاّ بالله) رواه النسائي والحاكم ، واتە : ئەم زیکرانەیە .

---

(١) باشترین ووتار لەلای خوای گەورەو سەروەر ئەم ووشانەیە کە هەڵی بژاردووە بۆ تەسبیحاتی فریشتەکانی کە ئەمەیە (سُبحانَ رَبي وَبحمدهِ ... سُبحانَ رَبي وَبحَمدهِ)

## (تێبینیەکی گرنگ)

جا هەروەها بێگومان هەندێك لە (موفەسیرەکان) ئەفەرموون (الباقیات الصالحات) ئەم وێردو زیکرانەی ڕابردوون کە باسمان کردن جا چۆن وانییە ؟ ئەوەی ڕاست بێت ، هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بە زمانی (قال و بە زمانی حالّ) تەسبیح و تەنزیهی خوا دەکەن ، هەروەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد ، جا هەروەها لەم بارەیەوە خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ سوورەتی الحدید: ١، هەرچی لە ئاسمانەکان و هەرچی لە زەویدا یە سەرجەم (تەسبیح) بۆ خودا دەکەن واە لەژێر فەرمان و دەسەلآتی ئەودا دەجولێنەوە ، هەر ئەو خوایەیە دەسەلآتداری کار جوان و کار درووست ، هەروەکو لە ئایەتێکی تردا ئەفەرموێت ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ ﴾ سوورەتی الأنعام: ١، واتە : هەرچی سوپاس و ستایشە بۆ زاتی ئەو خودایەیە کە هەموو ئاسمانەکان و زەوی لە نەبوون درووست کردووە ، وە هەروەها تاریکی و ڕووناکی درووست کردووە ، کەچی لەگەلّ ئەم بەلّگە ڕوونەشدا لەسەر خودایی خوداو یەکتایی ئەو (کافرەکان) واتە: بێ باوەڕەکان لە فەرمانی خودا لادەدەن وە هاوبەشی بۆ پەروەردگاریان دادەنێن وە بت ئەکەن بە هاوبەش بۆی ؟

کە بەڕاستی ئەمەشیان لە هەموو شتێ زیاتر جێگەی سەرسوڕمانە ، کە مانەندی بۆ دادەنێن .

## ( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )

١) عَن مُصعَب بن سعيد (رضي الله عنهما) عَن أبيه قالَ كُنا عِنـدَ رَسـول الله (صلى الله عليه وسلم) ، فقال أيَعْجز أحَدُكم أنْ يَكسِب أحَدنا ألف حَسَنة قالَ فساله سائل من جُلسائه كَيْف يكسب أحدنا ألف حسنةً يُسَبح ما ئـة تـسبيحة فَيُكتـب لـهُ ألـفَ حَسَنة أو يحّـطَ عَنـهُ الـف خطيئـةً) رواه مـسلم والترمذي. واته : موصعەبی کوری سەعد (خوایان لیٚ ڕازی بێت) ئەڵێ باوکم ئەڵێ ئێمە لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین (ﷺ) جا فەرمووی ئێوە کامتـان دەتـوانن هـەموو ڕۆژێ هـەزار چـاکە پەیدابکـەن ؟ ئینجـا یـەکێ لـە دانیشتوانەکانی خزمەتی عەرزی کرد قوربان چۆن چۆنی هەزار چاکە پەیدا بکەین ؟ فەرمووی: هەرکەسێ لەسەر هەر گووتەیێ سەد جار (تەسبیحات) بکا هەزار چاکەی بۆ دەنووسرێ ، وە هـەزار گوناهیـشی لێ هەڵئـەوەرێ و ڕەش ئەبێتەوە).

٢) عَن جابر (رضي الله عنه) عَن النبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ : مـن قالَ (سُبحانَ الله العَظيم وَبِحَمده غُرِسَت لَهُ نَخلَةٌ في الجنـة)[1] رواه الترمـذي، واتـە : لـە جـابرەوە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) لـە پێغەمبـەرەوە (ﷺ) ئەفەرموێت : هەر کەسێ یـەکجار بـە بـاوەڕەوە بڵـێ ((سُـبحانَ الله العَظـيم وَبِحَمده) لەبەهەشتدا دار خورمایەکی بۆ ئەڕوێنن و ئەیچەقێنن (ماشـاءالله)

---

([1]) ئەم فەرموودە لەپێشەوە باسکراوەو بەلام (شەرحەکەی) بەشێوەیەکی تر (ڕونکراوەتەوە)

٣) عَن عبدالله (رضي الله عنه) عَـن الـنبي (صـلى الله عليـه وسـلم) قـالَ لقيتُ ابراهيم لَيْلة إسْرى بي فقَال يا مُحَمد أقرِيء أمتَكَ مِني السّلام وأخْبِرهُم أن الجَنةَ طيبة التُربة عَذبة الماء وأنها قيحان وَأن غرَسها (سبحان الله والحمد لله وَلا إله إلا الله وَالله أكبر) رواه الترمذي والطبراني[1] واتـه : لـه عبـدالله وه (خوا ليّی ڕازی بێت) له پێغەمبەرەوه (ﷺ) ئەفەرموێت ئـەو شـەوەی كـه چووم بـۆ (میعـراج) گەیـشتم بـه خزمـەتی حـەزرەتی (ابـراهیم) پێغەمبـەر (سەلامی خوای لێبێت) ئینجا فەرمووی : ئەی محمد سـەلامم بگەیەنـە بـە ئوممەتەكەت وە هەواڵیان بـدەرێ كـه بەهەشـت خۆڵەكـەی پـاك و خاوێنـه ئاوەكەی شیرین و سازگاره زەویەكەی دەشـتایی و نەرماییـه ، هـەر خـوا داینـاوه بۆ ناشتنی نەمانی ئەم زیكره پیرۆزه (سبحان الله والحمد لله وَلا إله إلا الله وَالله أكبر) واته : خودای مەزن و گـەوره پاكـەو بـەدووره لـه هـەموو نەنگی و كەم و كوڕی و ناتەواویەك ، سـوپاس و سـتایش هـەر بۆ خودایـه (خودا نەبێ خودای تر نیه له غەیری ئەو زاته چوونكه خودا لەهەموو كەس گەورەتره و مەزنتره) .

---

(1) ئیمامی طبراني (رەحمەتی خوای لێبێت) ئەوەشی زیاد كردووه (ولا حول ولا قوه إلاّ بالله)

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها بێگومان ئەگێڕنەوە لە ئەبو موساوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی : (ألا أدلُكَ عَلى كَنزٍ مِن كنـوز الجَنـة ؟) واتە : فەرمووی ئایە خەزنەیەکت لە خەزنـەکانی بەهەشـت پیـشان بـدەم؟ ووتم بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ، فەرمووی : (لاحَولَ وَلا قوة إلا بالله) متفق عليه ، واتە : فەرمووی ووتنی ئەم زیکرەیە کـە موسـڵمان بـەدڵ پـشت بـە خوا ئەبەستێ و بڕوای دێتە سەر ئەوە هیچ هێزێك دەسـەڵاتی هـەبێ جگـە لەغەیری هێزی خوای گەورە (نَبَهَني الله وَإياكُم مِن نومة الغـافلِين وحَـشَرني وأياكُمْ تَحْـتَ لِـواء سَّـيد المُرسَلِين، وَأستَغفر الله العَظـيم لـيَ وَلَكُـم وَلِـسائر المُسلمين ، ربّنا آتينا في الدُنيا حَسَنَة وفي الآخرةِ حَسنة وَقِنّا عذاب النار).

# ئامۆژگاری سی و پێنجەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( دوعا ) و پاڕانەوە ئەکات

الحَمدُ لله رَبِّ العَالَمين أمرَ بالدُعاء ووَعَدَ بالإجابة وَ أشهَدُ أنَ لا إلـه إلاّ الله وَحدُ لا شَرِيكَ لَهُ لَهُ المُلك ولَهُ الحَمْد وَهوَ حيٌّ لا يَموت بيده الخير وَهـوَ عَلـى كُل شـيءٍ قـدير وبالإجابـة جَـدير ، تَوَعَـدَ المجـرمين بالعقـاب الألـيم ووَعَـدَ المُـتّقين بالإثابَـة مِـن الله الكـريم وَأشـهَدُ أن سَـيدنا مُحَمـداً عَبـدُهُ وَ رَسـولهُ والصَلاة وَالسلام عَليه وَعلى آله وَأصحابه وَسلّم تَسليماً كثيراً). أما بعد أيّها النّاس إتّقوا الله تَعالى وأعْلَمُوا أنّ الدّعاء أعظمُ أنواع العبادة[1] واتە : لەدوای هەندێ ئەی خەڵکینە تـەقواو پارێزگـاری خـوای مـەزن بکـەن وە هـەروەها بزانن کە بەڕاستی و بێگومان کە (دوعاو) پاڕانەوە گەورەترین و گرنگترین جۆرە لە عیبادەت و خواپەرستی).

فَعَن النعمان بن بشير (رضي الله عنهما) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ : (الدُعاءُ هُوَ العِبادةُ ثُم قـرأ[2] ﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدْعُونِىٓ أَسْتَجِبْ لَكُمْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴾

سوورەتی غافر: ٦٠، واتە : پەروەردگارتان فەرموویەتی ئێوە هانـاو هـاوار

---

(1) بڕوانە : (الخطب المنبرية في المناسبات العصرية) دانراوی (د. صالح بن فوزان بن عبدالله) لاپەڕە ٢٢١.

(2) لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : پاڕانەوە لە خوا خواپەرستیە دوایی ئەم ئایەتەی خوێندەوە ....

بۆمن بهێنن و ئەوە من دوعاو نزاتان قەبوڵ و گیرا دەکەم، چوونکە بەڕاست ئەوان خۆیان بە گەورە دادەنێن و لووت بەرزی دەکەن لە ئاستی پەرستنی مندا لە ئایندەدا بەسەر شۆڕی و خەجاڵەتیەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە ، لە تفسیری (اللباب في علوم الكتاب)دا [1] لەسەر ئەم ئایەتەدا ئەفەرموێت (وَهذا إحسان عظيمٌ مِن الله تعالى حيثُ ذَكَرَ الوَعيد الشديد على ترك الدعاء ، وروي أبو هريرة (رضي الله عنه) قالَ : قالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) مَن لَم يَدعوا الله غَضَبَ اللهُ عَليه) رواه إبن ماجة و أحمد و الحاكم ، واتە : ئەمەچاکەیەکی زۆر گەورەیە لەلایەن خوای تەبارەك و تەعالا کە فەرمانی بە ئیمانداران کردووە لێی بپاڕێنەوە وە هەروەها دووبارەش خوای گەورە هەڕەشەیەکی داوە بە گوێی ئیماندارانا (کە ئەفەرموێت بپاڕێنەوە) چوونکە ئەوەی لێم ناپاڕێتەوە ئەوا لێی توڕەمەو دۆزەخ بەشیەتی ، هەروەکو ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەر (ﷺ) وەرگرتووە کە ئەفەرموێت (هەر کەسێك لەخوای گەورە نەپاڕێتەوە خودا لێی توڕە دەبێت).

## (باسێك لە واتای دوعا) [2]

ئەصڵی دوعا ... بەواتای بانگی کرد یا داوای کرد یا داخوازی کرد ،

---

(1) بڕوانە تەفسیری (اللباب في علوم الكتاب) دانراوی (العلامه المفسر أبي حفص عمر بن علي أبي عادل الدمشقي) ج١٧ ، ل٧٦.

(2) دوعا لە (لوغەتدا) واتە لە زاراوەدا بەمانای دەرخستنی ئەوپەڕی ملکەچی و پێداویستی بۆ خوای گەورە ، هەروەها بە واتای چەمینەوەو لاڕیوونەوەش هاتووە ، هەرکاتێ (موحتاج) بووی بۆ پەروەردگارت).

یەکەم (داعی) بۆ خواو پێغەمبەرە (ﷺ) هەروەکو ئەم ئایەتە ئەفەرموێت ﴿ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴾ سورة الأحزاب: ٤٦ ، هەروەها بێگومان کۆتایی دوعا لە بەهەشتدایە و لەکۆتا مەنزڵگای شادی دایە وەکو قورئـان ئەفەرموێت ﴿ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ سوورەتی یونس: ١٠.

قال الإمام الطبري في تفسيره[1]: قوله تعالى ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٨٦هذه الآية نزلت في سائلٍ سأل النبي (صلى الله عليه وسلم) فقال يا مُحَمد أقريبٌ رَبنا فنناجيه أم بعيدٌ فنناديه؟) واتە : پێشەوا (تەبەری) لە تەفسیرەکەیدا ئەفەرموێ لەسەر ئەم ئایەتە کە دابەزی بۆ پێغەمبەر (ﷺ) هۆی ئەمەبوو ، پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) گووتی ئاخۆ خوا نزیك بێت تا بە چپەو هێواش بانگی لێ بکەین؟ یان دوورە تا بانگی لێ بەرز بکەینەوە (واتە بەدەنگی بەرز بانگی بکەین) ئینجا خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرمووی ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ﴾ واتە : هەر کاتێ بەندەکانم لەبارەی من پرسیارت لێ دەکەن ، ئایە من دوورم لێیانەوە یان نزیك ؟ دەبێ بزانن من زۆر نزیکم لێیانەوە ﴿ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ﴾ واتە :

---

(1) بڕوانە (جامع البيان عن تاويل القرآن) دانراوی (أبي جعفر محمد بن جرير الطبري) بەرگی دووەم ، لاپەڕە ٩٣٠.

بەهاناو پارشانەوە دوعاو گۆیانەوە دێم و وەلاٌمیان دەدەمەوە هەرەکە لێم پاڕنەوە ﴿ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي ﴾ دەبا ئەوانیش فەرمان و داخوازی من وەلاٌم بدەنەوە فەرمانەکانم پشتگوێ مەخەن ﴿ وَلْيُؤْمِنُواْ بِي ﴾واتە باوەڕی تەواوو پتەویان بەمن هەبێ ﴿لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ سوورەتی البقرة: ١٨٦ ، واتە : بەشکۆیی ڕاست بۆخۆ بەدی بکەن ، بەڵی پاڕانەوەو نزاو لاڵە لە دەرگای پەروەردگاردا بناغەی بڕواو دڵسۆزی نیشان دانە بۆیە پێغەمبەران (صەلاٌت و سەلامی خایان لەسەر بێت) بایەخێکی زۆریان بە (دوعا) دەدا چوونکە خوای گەورە لە فەرموودەیەکی (قودسیدا) ئەفەرموێت ﴿ أنا عِندَ ظَنِ عَبدي وَأنا مَعَهُ إذا دَعاني...﴾ رواه أحمد، واتە : خوای گەورە دەفەرموێت (من لە ئاستی گومانی بەندەکەم دام وە منیش لەگەڵیدام کاتێك لێم دەپاڕێتەوە).

## (ئاداب و سونەتەکانی دوعاو پاڕانەوە)

١) بِسْمِ اللهِ الرَّحمَنَ الرَّحِيم: چوونکە هەروەکو لە پێشەوە ووتمان (كُل شيءٍ لَم يَبدأ بِبِسْمِ اللهِ فَهُوَ أبتر) رواهُ أبو داود.

٢) هەروەها سوننەتە بە سوپاس و ستایشی خوای گەورەو میهرەبان دەست پێبکات لەگەڵ (صەلاوات) لێدان لە دیداری حەزرەت (ﷺ) لەگەڵ ئەصحابەو ئالو بەیتەکەی .

٣) سوننەتە لە کاتی دوعا کردندا ڕوو بکەیتە قیبلە واتە ڕووگە.

٤) بە دڵسۆزی و ئیخلاصەوە دوعاو پاڕانەوە بکات.

٥) جا هەروەها دووبارە کردنەوەی دوعا سێ جار سێ جار سوونەتە وە

نەڵێت ئەمە بۆ گێڕانەبوو .

٦) ئامادەبوونی دڵ و هۆش لەکاتی پاڕانەوەدا .

٧) گومانی چاك بردن بە خوای گەورە کە دوعاکان قەبوڵ و گیرا دەکات.

٨) ئەبێ بزانێ هەروەها دڵنیابوون لەوەی کە خوای گەورە دوعاکان ئەبیسێ و ئاگادارە پێی.

٩) سوونەتە هەردوو دەستەکان بەرز کەیتەوە لە دوعاو پاڕانەوەدا .

١٠) پێویستە (تەوبە) کردن لەگەڵ گەڕانەوەی مافی ئەوانەی مافیان لەلاتەو خاوەن مافن.

١١) جا سوونەتە بەدەست نوێژ دوعا بکەیت هەروەها پاك و خاوێن بی .

١٢) هەروەها یەکێ لە مەرجەکانی دوعا گیرابوون خواردن و خواردنەوەکەت حەلاڵ بێت .

١٣) هەروەها یەکێکی تر لە ئادابی دوعا ئەوەیە لەپێشدا بۆخۆی ئینجا بۆ باوك و دایکی.

١٤) نابێت بپاڕێتەوە بە گوناهو پچڕاندنی سیلەی رەحم.

١٥) هەروەها ئەبێ فەرمان بکە بە چاکەو قەدەغە بکات لە خراپە.

١٦) هەروەها ئەبێ دوورکەوێتەوە لە هەموو خراپەیەکی نهێنی و ئاشکرا.

١٧) بێجگە لەخوا لەکەس نەپاڕێتەوە ، مەگەر پیاوچاکێك بکات بە (وەسیلە)و چوونکە وەسیلە شەرعاً درووستە .

١٨) هەروەها شەرعا درووست نیە دوعای خراپ بکات لەخۆی و ماڵ و منداڵەکەی و کەس و کاری[1] .

---

(1) بڕوانە پەرتوکی:(الوابل الصّيب من الكلم الطيّب) لەنووسینی (العلامة ابن القيم الجوزية) لاپەڕە ٥٦.

## ( چەند ئاگادارییەك: ئەو كات و شوێن و جێگانەی كە دوعایـان تێیـدا قەبوڵ ئەبێت )[1]

١) لە كاتی (سجدە) واتە كڕنۆش بردندا بۆ خوای گەورە دوعـا قەبوڵـە هەروەكو لە حەدیسدا هاتووە ، عَن ابي هريرة (رضي الله عنـه) قـالَ : قـالَ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) أقربُ ما يَكونُ العَبدُ مِن رَبـه وَهـوَ سـاجداً فأكثروا الدّعاءَ) رواه مسلم وغيرها : واتە : ئەبو هو رەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (نزیكترین كاتی بەندە لـەخوای خۆیەوە لە (سجدە) واتە كڕنۆش بردندایە دەی ئێوەش زۆر بپاڕێنەوە .

٢) لەنێوان بانگ و قامەت كردن دوعـا قـەبوڵ و گیرایـە ، هـەروەكو لـە ئەنەسی كوڕی ماڵیك (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە كـە حـەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی : (الدُّعاءُ لا يرُد بينَ الأذان والإقامة) رواه الترمذي، واتە دوعـاو پاڕانەوە ی نێوان بـانگ و قامـەت ناگەڕێتـەوە دواوە خـوا قـەبوڵ و گـیرای ئەكات .

٣) هەروەها سات و كاتێك لە ڕۆژی هەینیدا ، هەروەك ئەفـەرموێ (عَن أبي هريرة (رضي الله عنه) قالَ : قالَ رسول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) إنّ في الجُمُعَةِ لَساعةٌ لا يُوافِقُها مُسلِمٌ يسّألُ الله فيها خـيراً إلا أعطـاهُ إيّـاه) قـالَ (وَهيَ ساعةٌ خفيفة) متفق عليه.

واتە : ئەبی هورەیرە دەفەرموێت پێغەمبەری خـوا (ﷺ) دەفـەرموێت ڕۆژی هـەینی كـاتێكی تێدایـە هـەر موسـڵمانێك لـەو كـات و سـاتەدا داوای

---

[1] جاهەروەكو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆكرد دوعا چەند مەجرێكی هەیەو ئەبێ مەرجەكانی بێنەجێ.

چاکەو پاڕانەوە بکات ئەوە بێگومان خوای گەورە دەیداتێ وە دەفەرموێت : (ئەو کاتە کاتێکی کەمەو زوو ڕوودەدات) .

٤ ،٥، ٦) وەهەروەها دوعاو نزای دایك و باوك موسافیرو ستەم لێکراو ، ئەمانە وەلاّم دەدرێتەوە وە دەگاتە بارەگای خوایی (حیجاب) لائەبرێ و هەروەکو ئەمەش دەقی حەدیسەکەیە (عن أبي هريرة – رضي الله عنه– قالَ : قالَ رسول اله (صلى الله عليه وسلم) (ثلاث دعوات مُستَجابات لاشك فيهن (دعوة الوالد ، ودَعوة المسافر و دعوة المظلوم) رواه أبو داود ، واتە : لە ئەبی هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت: (سێ دوعای وەلاّمدارەوەی بێگومان هەن کە لای خوا وەلاّم دەدرێتەوە ، دوعای دایك و باوك ، دوعای (موسافیر) واتە گەشتیار ، دوعای ستەم لێکراو .

٧،٨) دوعای ڕۆژووان و ئیمامی (عادل) ، واتە دادپەروەر : دیسان پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێت : (ثَلاثةٌ لا تَرَد دَعوَتَهُم : الصائم حتّى يفطر والإمام العادل ...) رواه الترمذي ، واتە: سێ دوعا هەیە لای خوا ناگەڕێتەوە وە گیرا دەبێت ، ڕۆژووان تا ڕۆژووەکەی دەشکێنێ پێشەوای دادپەروەریش).

٩) دوعاو پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برای موسڵمانی لەپاش ملەو/یان بەنهێنی یا حازر نەبێ : عَن أبي الدرداء (رضي الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) كانَ يَقول (دعوة المرء المُسلم لأخيه بِظهر الغيب مُستَجابة عِندَ رأسهِ ملك مُوكلّ كُلما دعا لأخيه بخير ، قال الملك الموكل به آمين وَلَكَ بِمثله) رواه مسلم و ابو داود.

واته: لـه ئـهبو دەرداوە (ڕەزای خـوای لێبێـت) ئـەڵێ پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەفەرموێت دوعای ئینسانی موسڵمان بۆ برای خۆی له (پاش مڵە) و بـه نهێنــی و ئامــادە نــەبوونی براکــەی لای خــوا قــەبوڵ و گیرایــه وەڵام دراوەتــەوە لای ســەری ئــەوەی دوعاکــە دەکــات بــۆ براکــەی بــەخێر فریشتەکەش دەڵێت خوایە وەڵامی بدەرەوە بۆ خۆشی بەهەمان شێوە).

١٠) دوعاو پاڕانەوە لەکاتی باران باریندا قەبوڵ و گیرا ئـەبێ ، روي عَـن النبي (صلى الله عليه وسلم) أنه قال : (أطلُبوا إستجابةَ الـدّعاءِ عِنـدَ نُـزُول الغَيثِ) أي المطر/ رواه الترمذي ، هەروەها (ڕیوایەت) کـراوە لـە پێغەمبـەر (ﷺ) کە فەرموویەتی داخوازی وەڵامدانەوەی دوعا بکەن لـە کـاتی بـاران باریندا).

١١) هەروەها شەوی قەدر (ليله القدر) يـش دوعـا قەبوڵـه ، عَـن عائـشة (رضي الله عنها) قالَتْ : قُلْتُ يا رسُول الله (صلى الله عليه وسـلم) أرأيـتُ إن عَملتُ (أي لَيْلة القَدر) ما أقول لها . قالَ (قولي اللّهـم إنَّـك عَفـوٌ تُحـبُ العَفْـوَ فأعْفُ عنّي) رواه الترمذي.

واتــه لــه خــاتوو عائیـشەوە دەڵێـت (خـوای لـێ ڕازی بێـت) ووتم ئـەی پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵم بدەرێ ئەگەر زانیم چ شەوێك شەوی (لَيْلَةُ القَـدر)ە من چی تیا بڵێم باشه ؟ فەرمووی بڵی خوایـه تـۆ لێبوردەیـت و لێبوردنـت پێ خۆشه دەی لێم ببورە (عەفوم) بکە.

١٢) هــەروەها لــەکاتی تێك پرژانــی سـوپای ئیـسلام و (کـوفر)دا دوعـا قەبوڵ و گیرا ئەبێ هەروەکو له حەدیسی (صەحیح)دا هاتووە، پێغەمبـەر (ﷺ) دەفــەرموێت (أطلُبُـوا إسـتِجابة الـدّعاءِ عِنْـدَ إلتِقـاء الجيُـوش) واتــه

داخـوازی دوعـا بکـەن لـەکاتی بەیەککەیـشتنی سـوپادا واتـە سـوپای موسڵمانان و (کافران) .

١٣) دوعـا قەبوڵـە لـەکاتی هەسـتان بـۆ نوێـژ کـردن ، هـەروەکو لـە (حەدیسی صەحیحدا) هاتووە کەوا حەزرەت (ﷺ) ئەفـەرموێت : (أطلُبُـوا إستِجابة الدّعاء عِنْدَ إقامَة الصَّلاة) واتە داخوازی وەرگرتنی دوعاو پاڕانـەوە بن لەکاتی هەستان بۆ نوێژەکانتان.

١٤) هەروەها دوعاوپاڕانەوە قەبوڵە لەکاتی شەو نوێژدا (صلاة التهجد) دا هەندێکیش ئەڵێن لەکاتی سێ یەکی کۆتایی شەودا

عَن أبي هريرة (رضيّ اللهُ عَنـهُ قـال) : قـالَ رسُـول الله (صـلى الله عليـه وسلم) ينزل الله إلى السّماءِ الدُنيا كُل ليلةٍ حينَ يَبْقى ثُلث اللّيل فيَقُول أنَا اللهُ أنَا المَلَكُ من الذّي يَدْعُوني فأسْتَجيبُ لَهُ مَنْ الذّي يَسْألني فأعْطِيهِ من الـذّي يستغفرني فأغفر لَـهُ) رواه البخـاري. واتـە : ئـەبو هـورەيرە (ڕەزای خـوای لێبێـت) ئـەڵێ بەڕاسـتی پێغەمبـەر (ﷺ)ئەفـەرموێت خـوای گـەورە هەمووشـەوێك دادەبـەزێت[1] بـۆ ئاسمـانی دونیـا کاتێـك سـێ یـەکی شـەو دەمینێت وە دەفەرموێت بەڕاستی هەر منم (پادشـاو موڵکدار) کـێ دوعـاو نزاو پاڕانەوەی هەیە تـا وەڵامـی بدەمـەوە ، وە کـێش داوایـەکی هەیـە تـا بیدەمێ وە هەروەها کێش داوای لێخۆش بوون دەکات تـا لێـی خـۆش بم و عەفووی بکەم).

١٥) پاڕانەوەی (مظلوم) واتە : سـتەملێکراو لـەو کەسـەی کـە سـتەمی

---

(1) هەندێ لە زانایان لە (شەرحی) ئەم (حەدیسە) ئەفەرموون (ڕەحمی) واتا بەزەیی خودا دائەبەزێ بۆ بەندەکانی .

لێکردووه ، جا هەروەها ئەفەرموێت (وَأتَقّوا دَعْوَةَ المَظْلومِ فإنّ لَـيْسَ بَيْنَها وبَيْنَ اللهِ حِجابُ) متفق عليه ، واتە : خۆت بپارێزە لە نزای ستەم لێکراو چوونكە لەنێوان ستەم لێکراوو خوای گەورەدا هیچ پەردەیەك نیەو نامێنێت .

١٦) هەروەها دوعای مندالّی صالح بۆ دایك و باوكی مردووی گیراوو قەبولّە ، عَن أبي هريرة (رضي الله عنه) انّ رَسُول اللهِ (صلى الله عليه وسلم) قالَ (إذا ماتَ الإنْسانُ إنقَطَعَ عَمَله إلاّ من ثَلاثٍ صَدَقَةٌ جاريةٌ أوْ علمٌ يَنْتَفع بهِ أوْ ولدٌ صَالحٌ يَدعوا لَهُ) رواه مسلم، واتە: لە ئەبی هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) کەوا دەفەرموێت (کاتێك ئادەمیزاد دەمرێت هەموو کردارەکانی ڕادەوەستن و ئیتر چاکەی بۆ نایەت مەگەر لە سێ ڕێگاوە نەبێت ، چاکەیەکی بەردەوام ئەویش زانستێك کە خەلّکی سودیان لێ وەرگرتبێت یا مندالّێکی سالح کە نزای بۆ بکات .

١٧) دوای نوێژە فەرزەکان دوعاو پاڕانەوە قەبولّە ، جا هەروەها ئەفەرموێت (فَقَدْ قِيلَ يا رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) أي الدُّعاء أسْمَعُ ؟ قالَ جَوْفُ اللّيل وَ دُبُر الصّلواةِ المكتوبات) رواه الترمذي ، واتە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ نزایەك بیستراوو وەرگیراوە ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (لەناو شەو لەدوای نوێژە فەرزەکانە دوعاوە پاڕانەوە (قەبولّە)، چوونكە جابریش (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) هەروەکو ئەمەش دەقەی فەرمودەکەیە : (عَنْ جابِر (رضي الله عنه) قالَ سمِعْتُ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) يَقول : (إنّ في اللّيل لساعةً لا يُوافِقُها رَجلٌ مُسلمٌ يَسأل الله تعالى خيْراً مِنْ أمر الدّنيا

والآخرة إلا اعْطاهُ الله إياه وَذَلك كُل ليلة)رواه مسلم ، واته : حەزرەت (ﷺ) دەفەرموێت هەموو شەوێ ماوەیەکی تیا هەیە هەر پیاوێکی موسڵمان بۆی رێك بکەوێ لەو حەلەدا داوای هەرچی بکات لە خودا لەخێرو بێری هەردوو جیهان خودا بێ دڵی ناکاو ئەو شتەی دەداتێ .

۱۸) دوعای (حاجی و عومرە) کەر لە سەفەری (حەج و عومرە)دا قەبوڵە (إنشاء الله)

عَن أبي هريرة (رضي الله عنه)قالَ : قَالَ رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) الحَجْاجُ وَالعُمارُ وَفدُ الله إن دَعوهُ أجابَهم وإن إستغفروه غَفَرَ لَهُم) رواه النسائي وإبن ماجة، واته : لەئەبی هورەیرەوە (رەزای خوای لێبێت) پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت (حاجی و عومرەکەرەکان) میوان و (وەفدی) خوان وە ئەگەر لێی بپارێنەو لێیان قەبولێ ئەکات وەئەگەر داوای چاوپۆشی لێبکەن چاوپۆشیان لێ دەکات).

۱۹) دوعا کردن قەبوڵە لەدوای خواردنەوەی ئاوی (زەم زەم) هەروەها دوعا کردن لە سەفاو مەروا دا قەبوڵە هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) خەبەری داوە .

۲۰) جا هەروەها لە فەرمودەیەکدا ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێت) بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت : کاتێك خوای مەزن بەندەکانی خۆ خۆش ویست بەڵاو موسیبەتی بەسەردا دەبارێنێت ئەوجا کاتێك بەندەکەش دوعا دەکات فریشتەکان دەڵێن بەڕاستی ئەوە دەنگێکەی ناسراوو (غەریب) دێت ، حەزرەت جوبرائیلیش (سەلامی خوای لێبێت) ئەفەرموێت ئەی پەروەردگار ئەوە (فلان) بەندەی

خۆتە پێداویستیەکەی بۆ جێ بەجێ بکەو خوای گەورەش ئەفەرموێت واز بهێنن ئەی فریشتەکانم لە بەندەکەم من پێم خۆشە گوێم لە لە دەنگی بەندەکەم بێت کاتێك بەندکەش دەڵێت ئەی پەروەردگارم خوای گەورەش ئەفەرموێت (لَبيكَ عَبدي لا تَدعوني بشيء إلا أستجبت لك وَلا تسألني شيئاً إلا أعْطَيْتك إما أن أعجلَ ما سألت وإما أن أدخر لَكَ أفضل مما سألت ، وَ إما أن أدفَع عَنكَ بهِ من البَلاء ما هوَ أعظم ذلك) وَ آخر دعوانا أن الحَمدُ لله رَب العالمين ، نَبَهَني وَأياكُم مِن نومة الغافلين وَحَشَرَني وَ إياكُم تحت لواءِ سيد المرسلين). اللّهُمَ أغْفر لَنا آمين.

# ئامۆژگاری سی و شەشەم
## باسی فەزڵ و گەورەیی ناوە جوانەکانی خوای گەورە دەکات

الحَمْدُ للهِ المُتفرد بِكبْريائهِ وَعَظَمَتهِ المُتَوحدُ بتَعاليه وصَمَديتهِ الذي قَصَّ أجنحة العقولِ دون حمى عِزَّتهِ وَلَم يَجعَل السبيل إلى مَعرفتهِ إلا بالعجز عَن مَعرفتهِ وَقَصُرُ ألسِنة الفُصْحاء عَن الثناءِ عَلى جَمال حَضْرتهِ إلا بِما أَثْنى بِهِ عَلى نَفسهِ وَأَحْصى مِنْ إسمهِ وصِفتهِ وَ أشهَدُ أن لا إلهَ إلاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وَ أشهَدُ أنَّ سَيدَنا مُحَمداً عَبْدهُ وَرَسولَهُ وَالصلاةُ والسَلامُ عَلى مُحَمَد خَيْرَ خَليقته وَعلى آلهِ وَ أصْحابهِ وَعَترته وَمَن تَبِعَهُم بِإحسانٍ الى يوم الدين ، أما بعد فيا عباد الله أوصيكم بتقوا الله وطاعتهِ في جميع أوقاتكم) واتە : لەدوای هەندێ ئەی بەندەکانی خوا وەسیەتتان لێ دەکەم بە تەقوای خواو جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خودا لەهەموو کات و ساتێکداو چوونکە بەڕاستی سەرکەوتن و سەرفرازی لەبەجێ گەیاندنی فەرمانەکانی ئەو دایە .

**( ئاگاداریيەکی گرنگ )**

جا هەروەها ئیمانداره بەڕێزەکان دوعاکردن لەخواو پاڕانەوە بەهۆی ناوە جوانەکانی خۆی لە قورئان و لە حەدیسدا هاتووە کە ئەو ناوە

پیرۆزانەش (٩٩) ناوی پیرۆزە[1] کە لەقورئان و فەرمودەکاندا بەیان کراون جا بێگومان ئێوەش دوعا بکەن لەخوا بپاڕێنەوە بەهۆی ناوە جوان و پیرۆزەکانی ئینجاخوای گەورەش سەبارەت بە لەخوا پاڕانەوە بەناوە جوانەکانی خۆی لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ سوورەتی لأعراف: ١٨٠واتە : خودا چەندناوێکی پیرۆزی هەیە کە جوانترین ناون هەر ناوێك لەوانە (مەعنایەکی) تایبەتی خۆی هەیە دەفەرموێت بەو ناوانە بانگی خودا بکەن و داوای لێبکەن و واز بێنن لەو کەسانەی کە خۆیان لەناوەکانی خودا لادەدەن و بتەکان بە خودا دەزانن چوونکە بۆهەر یەکێکیان ناوێکیان داناوە ئەویش بەگۆڕینی ناوێك لەناوە جوانەکانی خودا وەك گۆڕینی (الله) بە (لات) و (عزیز) بە (عوززا) ئەوانە سزای کردەوەی خراپی خۆیان لە ڕۆژی دواییدا وەردەگرنەوە .

جا هەروەها خوای گەورە لە سورەتی (الحشر) دا دەفەرموێت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْمَلِكُ ٱلْقُدُّوسُ ٱلسَّلَـٰمُ ٱلْمُؤْمِنُ ٱلْمُهَيْمِنُ

---

(١) بزانن : هەموو ناوو سیفەتەکانی خوای گەورە لەهی ئینسان جیان وەکو (کمال) و (جمال) و (جلال) دان ، واتە: تەواوی وجوانی و بڵندی یا بەمانای (مبالغة و مطلق) دێن بۆ وێنە (عیلم) واتە زۆر زاناو بەشێوەیەکی فرە ڕەها زانا چونکە بێگومان ئەوە وەکو زانیاری (محدودو مقید)ی ئینسان نییە ، جا هەروەها ناوەکانی تریشی هەر بەو مانایە دێن) بڕوانە پەرتوکی (شورەی موسڵمانان بە زیکرو دوعاکان) لەنووسینی بەڕێز (شوان ڕابەر) لەگەڵ دەستکاری ، لاپەرە ١٥٧.

﴿ ٱلْعَزِيزُ ٱلْجَبَّارُ ٱلْمُتَكَبِّرُ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ سوورەتی الحشر: ٢٣واتە : خوا ئەو زاتەیە کە جگە لەئەو هیچ خوایەکی تر نیە پاشای هەموو بوونەوەرە پاك وبێگەردو پوختەیە ئاشتی خوازو ئاشتی پەروەرە ئاسایش بەخش و بەئاگای ئیماندارانە ، دەسەلاتدارەو چاودێری درووست کراوەکانیەتی بالا دەستەو خاوەنی خێر بێ سنوورە گەوریەو خۆی بە گەورە دەزانێت پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەیە لەوەی تێ نەگەیشتوان شەریك و هەواڵی بۆ بڕیار دەدەن).

﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾ سوورەتی الحشر: ٢٤، واتە : هەر ئەو خوایەیە بەدی هێنەرو دروست کارە لە نەبوون هەرچی بوێ بەدی دەهێنێت ، نەخشەو وێنە کێشەرە ناوە پیرۆزو جوانەکانی هەمووی (لایەق) و شایستەی ئەوەن هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە ستایشی ئەو دەکەن بە ڕاستی ئەو زاتە خوایەکی بالادەست و دانایە ، جا هەروەها پێغەمبەریش (ﷺ) لەبارەی ناوە جوانەکانی خودا ئەفەرموێت : (عَن أبي هريرة (رضي الله عنه) عَن النَبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ إن لله تِسْعةً وَتسْعينَ إسْماً مائة غَيْرَ واحدٍ مَن حَفِظَهُما دَخَلَ الجَنَّة وَهُوَ وِترٌ يُحّب الوِترَ) رواه الشَيخان ، واتە : لەئەبو هورەیرەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (خودای گەورە نەوەدو نۆ ناوی هەیە (لەسەد) یەکی کەمە جا هەر کەسێ لەبەرەیان بکاو کاریان پێ بکاو باوەڕی پێ هەبێ ئەوە دەچێتە بەهەشت چوونکە خۆی تاقەو حەز لەتاق

دەكات ، جا هەروەها (ئەنەسی كوڕی مالیكیش) لەفەرمودەیەكدا بۆمان دەگێڕێتەوە ئەمەش دەقەكەیەتی: (عَن أنسٍ (رضي الله عَنهُ) قَالَ كُنا مَعَ النبي (صلى الله عليه وسلم) في حَلَقة ورَجل قائمٌ يُصلي فَلَما رَكَعَ وَسَجَدَ تشهدَ ودَعا فقالَ في دُعائه ، اللّهُمَ إنّي أسألُكَ بأنَ لَكَ الحَمْدُ لا إلهَ إلاّ أنت بَديعُ السّماوات وَالأرضِ يا ذا الجلال والإكرام يا حَيُّ يا قَيّوم فقَال النبي (صلى الله عليه وسلم) لَقَد سأل الله بأسمهِ العظيم الذّي إذا دُعيَ بهِ أجابَ وَإذا سُئلَ بِهِ أعطى) رواه الحاكم وَصَحَحه.

واتە : ئەنەس (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خودا بووین (ﷺ) لە كۆڕێكدا لەوكاتەدا پیاوێك ڕاوەستابوو نوێژی دەكرد ئەوجا كاتێك چەمایەوە و سوژدە واتە كڕنۆشی برد (تەحیاتی) خوێندو (دوعای) كرد ووتی خوایە من داوات لێدەكەم سوپاس و ستایش بۆتۆیە هیچ پەرستراوێكی بەحەق نییە جگە لە زاتی خۆت چوونكە بەدیهێنەری ئاسمانەكان و زەوی هەرتۆی ، ئەی خاوەنی بەرزی و بڵندی و بەخشش و ڕێز ئەی هەردەم زیندووی ڕاگری بوون و ژیان ، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی بەڕاستی بەناوە گەورەكەی خوادا وای كرد كە هەركەسێ پێی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوە ئەگەر داوای پێ بكرێ دەبەخشرێ و ئەیدرێتێ).

## ( شەرحی ( أسماءُ الله الحُسنى ) واتە : تەفسیری ناوە جوانەكانی خودا )

هەروەكو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆكرد ئیمامی (بوخاری و مسلم) لەئەبو هورەیرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) كەوا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی (خودای

گەورە نەوت و نۆ ناوی هەیە سەد یەك كەم هەركەسێ سەرژمێریان بكات دەچێتە بەهەشت ، ئەو ناوانە ئەمانەن:

١) الله – ئەڵڵا واتە خوا ، خوداوەند ، یەزدان ، (الله) خوای گەورە ئەو خوایەیە كە تاك و تەنیاو بێ شەریك و هاوەڵە خاوەنی ئەم ناوو سیفەتە بەرزو بەرێزو پاك و پیرۆزو گەورەو ئازیزو پڕ ماناو مەبەست و ناوەڕۆكانەیە كە ە قورئان و سوننەتدا هاتوون[١] .

٢) ٱلرَّحْمَٰنِ : واتە بەخشندەو میهرەبان و بەسۆزو بەزەییە لە دونیادا بەرامبەر بە هەموو شتێك لەبوونەوەردا [٢].

٣) ٱلرَّحِيمِ : واتە بەخشندەو میهرەبان و بەسۆزو بەزەییە لەدواڕۆژدا بەرامبەر بە ئیمانداران بە لوتف و هەر شتێك كە خوا حەز بكا رەحمی پێ بكات .

٤) المَلِك : واتە هەمیشە پاشاو دەسەلأتدارو سەرۆك و خاوەنی هەموو شتێكە لە بوونەوەرو جانەوەرو دونیاو دواڕۆژدا .

٥) القُدوس: واتە زۆر پاك و خاوێن و تەمیزو بێ گەردو بێ نەنگ و بێ كەم و كوڕی و هەڵەو ناتەواویە .

٦) السَلامُ: واتە زۆر ساغ و بێ گەردو بێ عەیب و عارو ئاشتی خوازو ئاشتی دارو ئاشتی پەروەرە .

٧) المؤمِنُ: واتە ئەمیندارو دڵنیا كەری بڕوادارو درووستكراوەكانیەتی

---

(1) بروانە : پەڕتوكی (المقصد الأسنى في شرح معاني الأسماء الحسنى) دانراوی (حجة الأسلام محمد بن محمد الغزالی) لاپەڕە ٦١.

(2) پوختەی ووتەكان بەمانای سەرچاوەی (ڕەحمەت) و سۆزو بەخشندەی بێ شومار.

لە زیان پێ گەیاندنیان لە دونیاو قیامەتدا.

٨) المُهَیمنُ: واتنە زۆر ئاگادارو چاودێرو ، دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو درووست کراوو بوونەوەردا.

٩) العَزیزُ : واتە هەمیشە زاڵ و دەسەڵاتدارو بەهێزو بەتوانایە بەسەر بوونەوەرو هەموو شتێکدا.

١٠) الجَبارُ : واتە زۆر دەسەڵاتدارو بە زەبرو زەنگ و بەدەست و بەتواناو ناچارکەر.

١١) المُتَکبرُ: واتە زۆر خۆ بەگەورە زان و زل و بەتواناو خۆ گەورە کەرە کەلەخۆی دەوەشێتەوە.

١٢) الخالِق: واتە بنیاتنەرو بەدیهێنەری درووستکراوان لە نەبوونەوە بۆ بوون .

١٣) الباریءُ: واتە هێنەرەوەو کردگار یانی ئەندازەگیری جوانکاری درووستکراوەکانی.

١٤) المُصَورُ: واتە وێنەکێش و نیگارکێش و نەخشەکێشە بەجوانترین شێوە .

١٥) الغَفارُ: واتە لێخۆشبەرو داپۆشەری گوناهو تاوانەکان لە دونیاو قیامەتدا و لە دوارۆژدا.

١٦) القَهارُ: واتە زۆر بە زەبرو بە دەسەڵات و بە تواناو بە (حوکم).

١٧) الوَهاب: واتە بەخشەرو بدەری بێ ئەندازە بەهەموو دروست کراوەکان .

١٨) الرَزاقُ: واتە رزق و رۆزی و بژێوی دەری بێ سنوورو کۆتاییە

بەهەموو دروستکراوەکانی .

١٩) الفَتاحُ: واتە پەروەردگار گرێکان ئەکاتەوەو (کلیلی) هەموو گرفتێك و هەموو شتێکی لەلایە و گەنجینەی ڕەحمەتی بۆ بەندەکانی والآیە.

٢٠) العلیم: واتە زاناو ئاگادارو بێ سنوور بە هەموو شتە ئاشکراو پەنهانەکانی ژیان و بوونەوەر.

٢١) القابِضُ: واتە گیانکێش و بگری ڕزق و ژیان.

٢٢) الباسِطُ : واتە ڕاکێشەرو فراوانکەرو لەدوو دەری ڕزق و ڕۆزی و پێویستیەکانی دروستکراوەکان.

٢٣) الْخافِضُ : واتە نزم و نەوی کەری پلەو پایەی هەر کەسێ کە بیەوی لە دونیاو دواڕۆژدا .

٢٤) الرافع: واتە بڵندکەرو بەرزکەرەوەو سەرخەرو دەست گرو بارگری هەموو شتەکان.

٢٥) المُعِزُّ: واتە بەهێزکەرو زاڵکەر هێزو دەسەڵات بەخشش بەهەر یەکێك کە بیەوێت .

٢٦) المُذِلُ: واتە زەلیل و زەبوونکەرو سەرشۆڕکەرو ڕیسواکەرو ملکەچ پێکەرو سەرپێدانەوێن .

٢٧) السمیعُ: واتە زۆر بیسەرەو گوێی لە دەنگی هەموو شتێکە لە بەدیهێنراوانی .

٢٨) البَصیرُ: واتە بینەری هەموودرووستکراوەکانی بەئاشکراو بە پەنهانەوە .

٢٩) الحَکیمُ : واتە دادوەرو دادگەرو فەرمانڕەواو ناوبژیوانی بەحەق و

ڕاست .

٣٠) العَدْلُ: واتە دادگەرو دادپەروەرو هەق و ڕاست و بێ ستەم و لاگر.

٣١) اللَطيفُ : واتە زۆر بە سۆزو لوتف و ڕووخۆش و بەخشندەو میهرەبان.

٣٢) الخَبيرُ: واتە زۆر زاناو پسپۆرو شارەزا لەهەموو شتەکان و ژیان و بوونەوەر.

٣٣) الحليم) واتە زۆر نەرم و نیان و هێد و هێواش و بە ئارام و لەسەرخۆو بێ پەلە .

٣٤) العَظيمُ : واتە زۆر گەورەو مەزن و بەتواناو بەهێزو بەدەسەلآت و شکۆدار.

٣٥) الغفور: واتە لێبوردەو لێخۆشبەرو گوناهو نهێنی داپۆش.

٣٦) الشكور: واتەت سوپاسگوزارو بەخشندەی خێرو چاکەو نازو نیعمەت.

٣٧) العَليُ: واتە زۆر بەرزو بڵندو پایەدارو بەدەسەلآت.

٣٨) الكَبيرُ: واتە گەورەییەکەی بێ سنوورە و کۆتایی نایەت.

٣٩) الحَفيظ: واتە پارێزەری درووستکراوەکانی لەتیاچوون و لەناوچوون و پاسەوان .

٤٠) المغيث: واتە فریاد ڕەس و فریاد کەرو بەهانا چووی درووست کراوەکانی .

٤١) الحَسيبُ: واتە ژمێریارو لێپرسەرەوەو ئاگاداری هەموو شتەکانی بوونەوەر.

٤٢) الجَليـــل: واتـــه بـــەرزو بـــەڕێزو شـــكۆدار و دەســـەلاّتدار بەســـەر بوونەوەردا.

٤٣) الكَـريمُ : واتــه زۆر ســەخی و بەخـشندەو بـەڕێزو دەسـت كـراوەو دەستڕۆو دەست والآ.

٤٤) الرَقيبُ: واتـه ئاگـاداروو چـاودێرو پەيـدار بەسـەر هـەموو شـتەكانی بوونەوەردا.

٤٥) المُجيـــبُ: واتـــه وەلاّمـــدەرەوەی هـــەموو پـــرس و داخـــوازی و ئارەزووەكانی دروستكراوەكانی .

٤٦) الواسعُ: واته زۆر فراوان و گوشادو به سەليقەو به توانايه .

٤٧) الحكيمُ: واتـه زۆر دانـاو زانـاو كـارزان و كـار بـەجێ و كارلـەجێ و ووردو لێزان.

٤٨) الودود: واته خۆشەويست و بەسـۆزو دۆسـتدار بەنـدە سـالّحەكانی خۆش دەوێت.

٤٩) المَجيـدُ: واتــه زۆر پايەبـەرزو بەشـەرەف و سـەربەرزو سـەربلّندو شكۆداروبەڕێز.

٥٠) الباعِـثُ: واتـه زينـدوو كـەرەوەو نێـردراوی پێغەمبـەران (سـەلامی خوايان لەسەربێت).

٥١) الشَهيدُ: واته زاناو شايەد بەسەر هەموو ڕووداوو جموجۆڵەكاندا.

٥٢) الحَقُ: واته بوونەكەی ڕاست و درووسته هەروەها زاناو پايەداره .

٥٣) الوكيلُ: واته پشت و پەنا دەرو پارێزەرو چاودێری كەر .

٥٤) القَويُ: واته بەهێزو توانای بێ سنووره .

٥٥) المَتينُ: واتە توندو تۆلّ لە دەسەلآتداو تووشی هیچ جۆرە ماندووبونێك نابێت.

٥٦)الوَلِيُ : واتە پشتیوانی بەندە باوەڕدارەکانیەتی چوونکە جۆرە ماندووبونێك نابێت.

٥٧) الحَميدُ : واتەسوپاس کراوی خاوەن ستایشی زۆر.

٥٨) المُحصي: واتە بە ئاگاو پارێزەری شتەکان و هیچی لێ وون نابێت.

٥٩) المُبديء: واتە بەدیهێنەری هەموو شتێك لەسەرەتاوە .

٦٠) المُعيدُ : واتە ژیان ئالْورگۆڕ پێ ئەهێنێ و دەیباتەوە بۆ دۆخی جاران واتە زیندووکەرەوە.

٦١) المُحْيي : واتە ژیان بەخش بە زیندەوەران لە سەرەتاو لەدوای مردنیان.

٦٢) المُمیت: واتە مرێنەری گیانداران و زیندەوەران وە لێسێنەری ژیان لە بووندا .

٦٣) الحَيُ : واتە هەمیشە زیندوو و نامرێ ژیانی بەردەوامە بەبێ کۆتا.

٦٤) القَیومُ: واتە ڕاگیرو پایەدارو پارێزگاری بوونەوەرو بەندەکانی دەکات.

٦٥) الواجِدُ: واتە دارا فەراهەم هێنانی ژیان و بوون لەوەوەیە.

٦٦) الماجِدُ: واتە ئەو پەڕی بڵندی لە ڕێزو جاهو بەرزی و پایەداریدا .

٦٧) الواحد: واتە تاکە هاوبەش و هاوشانی نیە .

٦٨) الصَمَدُ : واتە پێویستی بەکەس نییە هەمووان پێویستیان بە ئەو هەیە .

٦٩) القادرُ: واته به تواناو به دەسەلآت .

٧٠) المُقتَدر: واته ئەو پەڕی بەتواناو بەدەسەلآت و دانا لە کارەکانیدا.

٧١) المُقَدم: واته پێشخەری ڕووداو کارەکان و پێشهاتەکان.

٧٢) المؤخِرُ: واته دوواخەری ڕووداوەکان و پێشهاتەکان.

٧٣) الأوَلُ: واته یەکەمین و بێ سەرەتا لە بوون و دەسەلآتدا.

٧٤) الإخِرُ: واته دواهەمین و بێ کۆتایی هەتا هەتایێ .

٧٥) الظاهِرُ: واته دیارو ئاشکرا بەهۆی دەسەلآت و تواناو لە ڕێگای دروستکراوەکانیەوە .

٧٦) الباطِنُ: واته پەنهانە لە چاوان وە دەرکی حەقیقەتی ناکرێ لە دونیادا.

٧٧) الوالي: واته پاشاو بەکارهێنەری شتەکان و پشت و پەنای باوەڕداران.

٧٨) المُتعالي: واته بەرزو بڵندو بێ کەم و کوڕی خاوێنە واته خاوەن ڕێز.

٧٩) البِرُ: واته چاکە بەخشی بێ شومار وە خاوەن چاکەی بەردەوام .

٨٠) التَوابُ: واته قەبیوڵکەری ئەو بۆ گەڕانەوەو پەشیمان بوونەوەی بەندەکان.

٨١) المُنتَقِم: واته تۆڵە سێنەر لە ستەم کاران و خراپە کاران.

٨٢) العَفوُ: واته چاوپۆشیکەر لە گوناهو لابەری تاوانی بەندەکانی.

٨٣) الرَؤوف: میهرەبان و نەرم و نیان بەسۆز لەگەڵ بەندەکانیدا .

٨٤) مالِك المُلك: واته خاوەنی موڵکی هەموو جیهان چۆنی بوێ گۆڕانی

تیا دەکات.

٨٥) ذو الجَلالِ وَالإكرام: واتە خاوەن بەرزی و ڕێزو شکۆ.

٨٦) المُقسِطُ: واتەئەوپەڕی دادپەروەری لە بەخشندەیی و مافدا.

٨٧) الجامع : واتە کۆکەرەوەی شت و نزیك خەرەوەیان لەیەکتر.

٨٨) الغَنيُ: واتە دەوڵەمەندی بێ سنوور پێویستی بەهیچکەس نییە .

٨٩) المُغني: واتە بێ نیازکەرو دەوڵەمەندکەری خەڵکە.

٩٠) المانیع: واتە نەهێڵ قەدەغەکەر مەنعکەر.

٩١) الضار: واتە زیانبەخش و زیانگەیەنەر و لەناوبەر.

٩٢) النافِعُ: واتە سوودبەخش وخێر بەخش قازانج دەرهاوەری چاکە بۆ بەندەکانی.

٩٣) النور: واتە ڕۆناکی و ڕۆشەنکەرەوەی دونیاو دواڕۆژ.

٩٤) الهادي: واتە ڕێنوێن ڕێنوما ڕێنیشاندەر.

٩٥) البَديع : واتە داهێنەر درووستکەری هەموو شتێ لەنەبوونەوە بەبێ وێنە.

٩٦) الباقي : واتە نەمر پایەدار نەگۆڕاو بەردەوام ولەناونەچوو وە هەتا هەتایە هەر دەمێنێتەوە .

٩٧) الوارثُ: واتە میرات گرەو میرات بەر خاوەنی هەموو شتەکانە.

٩٨) الرَشید: واتە دەستگیر ڕابەر ڕێنمایی و ڕابەری بەندەکانی و بوونەوەران.

٩٩) الصَبور: واتە بەصەبر پشوو درێژ زۆر بە ئارام گرو پەلە نەکەر لە

کارەکانیدا[1] .

(**تێبینیەك**): مامۆستا مەلا (نوری فارس) لە تاجەکەیدا[2] ئەفەرموێت (دڵنیام هەرکەسێ دیمەنی و دەروونی خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ و (حەلاڵ) خۆر بێ موسڵمانێکی بەڕاست بێت و هەروەوها نیازی پاك بێ و پشت بە کەرەمی خودا ببەستێ ئەم جۆرە نزایانەی گیرا دەبێ مەگەر چۆنەها.

## (باسێك لە ناوە هەرە گەورەکەی خوا (ئیسمی ئەعظەم)

عَن عبدالله بن بريدة عَن أبيه (رضي الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) سَمَعَ رجلاً يَقول (اللّهم إني أسألُكَ أني أشهَدُ أنَكَ أنتَ اللهُ لا إله إلا أنتَ الأحَدُ الصمدُ الذي لَمْ يَلِد وَلَم يولَدْ وَلَمْ يَكُن لَهُ كُفواً أحد فَقال لَقَد سألتَ الله بالإسم الذّي إذا سُئِلَ أعطى وَإذا دُعيَ بِهِ أجابَ) رواه أصحاب السُنن، واتە : لە عبدالله ی کوڕی بورەیدەوە (خوایان لێ ڕازی بێت)ئەڵێ باوکم فەرمووی پیاوێ گووتی (اللّهُم إني أسألُكَ أني أشهَدُ أنَكَ أنتَ اللهُ لا إله إلا أنتَ الأحَدُ الصمدُ الذّي لَمْ يَلِد وَلَم يولَدْ وَلَمْ يَكُن لَهُ كُفواً أحد) واتە : خودا بۆیە داوا لەتۆ دەکەم چوونکە شایەتی دەدەم کە هیچ خودای تر نییە تۆ نەبی ، هەر خۆت خودای ڕاست و دروستیت و بەس تۆ تاك و

---

(1) ئەم حەدیسە پیرۆزە (ترمذي و ئیبن و حبّان و حاكم) ریوایەتیان کردووە ، بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

(2) بڕوانە پەرتوکی تاجی کوردی (لەوەرگێڕانی مامۆستا نوری فارس حەمەخان) بەرگی ٥ ، لاپەڕە ١٥٦، چاپی بەیروت.

تەنیای پشت و پەنای هەروەها نەکەس لەتۆ بووەو نەتۆ لەکەس بووی کەسیش هاوتای تۆ ناکا ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) گوێی لە قسەکەی بوو فەرمووی : دڵنیابە کە بەو ناوە لە خودا پاڕایتەوە کە هەر کەسێ بەو ناوەی ئاوا داوای لێبکات نائومێدی ناکات و دەچێ بە دەنگیەوە .

**( سەرنجێکی گرنگ )**

هەروەکو لە پێشەوە ئەو ئایەتەمان تەفسیر کرد ﴿ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ﴾ سوورەتی الأعراف: ١٨٠، بەلاّم بە واتایەکی تر بێگومان خوای گەورە (یەزدانی پاك) گەلێ ناوی جوانی هەیە[1] کەواتە بەو ناوانە بانگی بکەن و بڵێن (یا الله – یا رحمان– یا رحیم –یا عظیم – یا حلیم) ، هەروەها بەهۆی ناوهێنانی بەو ناوانەوە بەندەیی بۆ بکەن وەك ئەوە بڵێن سُبحان الله ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴾ ...

---

(١) جا هەروەها بێگومان ناوە پیرۆزەکانی زاتی خودای ئافرێنندەی ئەرزو ئاسمان ئەگەرچی بە هەزارو یەك (١٠٠١) ناو مەشهورن لەناو موسڵماناندا بەلاّم لە قورئان وحەدیسدا بە نەوەدو نۆ (٩٩) دیاری کراون چوونکە لە ڕاستیدا لە ژمارەنایەن وەك صیفەتەکانی خودا ، چوونکە ئەگەر ناوەو ئەگەر صیفەتە بناخەی هەموویان بڕیاری گەورەیی و بێ خەوشی زاتی خودایە دیارە ئەم گەورەیی و بێ خەوشیەش لە ژمارەنایەت ئەوەندە زۆرەبەلاّم پێویستە بزانین هەرناوێ کە قورئان و حەدیس و شەرع ڕێگای نەدابێ بۆ خودای گەورە بەکارناهێنرێت) ، بڕوانە پەرتوکی (عقیدەی مرضیة) شەرع و لێکدانەوەی (مامۆستا عبدالکریم مدرس) لاپەڕە ٢٤١.

جا هەروەها بێگومان ناوە جوانەکانی خودا (أسماء الله الحسنی) لە چوار سورەتدا باس کراون :

١) لە سورەتی (الأعراف) داو ... هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد .

٢) لە کۆتایی سورەتی(الإسراء) دا کە ئەفەرموێ﴿ قُلِ ٱدْعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُواْ ٱلرَّحْمَٰنَ أَيًّا مَّا تَدْعُواْ فَلَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾سوورەتی الإسراء: ١١٠ ٣) لە سەرەتای سورەتی (طـه) دا کە ئەفەرموێت ﴿ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾ سوورەتی طه: ٨ .

٤) هەروەها لەکۆتایی سورەتی (الحشر) دا کە ئەفەرموێت ﴿ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْخَٰلِقُ ٱلْبَارِئُ ٱلْمُصَوِّرُ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾سوورەتی الحشر: ٢٤

جا هەروەها وەکو ڕیوایەت کراوە هەندێ لە موسڵمانەکان لەنوێژدا هاواریان لە خودا ئەکرد بەناوی (الله یا الرّحیم) جاری واش هەبوو بە (الرحّمان) بانگیان لێ دەکرد جا (کافرەکان) واتە بێ باوەڕەکان ووتیان (محمد) و هاوەڵانی زۆر سەیرن پێیان وایە ئەوان (عیبادەتی) یەك خوا دەکەن ئەدی بۆی هاواری دوو خوا دەکەن ؟ ئیتر پەروەردگار ئەم ئایەتەی پێشوی هەناردە خوارێ و ئینجا ئەوەی ڕوون کردەوە کە ئەو ناوە جوانانە هی یەك خودان نەك هی چەند خودایەك ..)

**( پاشکۆ )**

هەروەك لەپێشەوە باسمان کرد گوێتمان ئەوەی لە قورئان و حەدیسدا هاتووە ناوە جوانەکانی خودا (٩٩) ناوەو بەڵام زانای بەناوبانگ

(ئیبنولعەرەبی) سەدو چل و شەش ناوی لە ناوە پیرۆزەکانی خودا بۆ پاڕانەوەو هاوار لێکردن هێناون بەڵام لە شوێنێکی تردا سی ناوی پیرۆزی تری لێ زیاد کردوون ، واتە بوون بە (سەدو حەفتاو شەش ناو) وەکو وێنەی ئەمانە : (الطَیبُ، المُعَلمُ ، الجمیلُ) [1] هەزار رەحمەت لە گۆڕی خوالێخۆش بوو مامۆستا (عبدالرحیم مەولەوی بێت) کە ئەفەرموێت :

**ئەسمای خالقی الارض والفلك** — **ئەگەرچی مەشهورن بەهەزارو یەك**

**بەشەرع یەکی کەم سەد مەشهورن** — **لاکن وەك صیفات غیرە مەحصورن**

**بۆچ؟ ئەگەر ئەسمایە ئەگەر صیفاتە** — **مەنشەئی هەموو هەر کەمالاتە**

**خۆ کەمالاتی خالقی ئەکبەر** — **غەیرە مەحصورە لەغایەت ئەودەر**

**هەر ئیسمی کە شەرح ئیزنی نەداوێ** — **ئیطلاقی وەسەر خودا دا ناوێ**

**ئەم قەولە موختار یەکجار ظەریفة** — **بەس بینای ئەسماء لەسەر تەوفیقە** [2]

یا رەبی خودایە لەبەر خاتری ناوە پیرۆزەکانت (هیدایەتتمان) بدەیت و عەفوومان بکەیت و ڕەحممان پێ بکەی لە دەردو بەڵاو (فیتنەی) ئاخیر زەمان بمانپارێزی و هەروەها لە دونیاو قیامەت نەجاتمان بدەیت هەموومان (داخیلی) بەهەشت بکەیت .(أقول قَولي هذا وَأَسْتغفرُ الله لـي وَلَكُم وَلِسائر المسلمين ، فَأستغفروه إنَهُ كَانَ غفاراً.)

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (أحكام القرآن) لأبن العربي ، ج٢ ، لاپەڕە ٨٠٥.

(2) بڕوانە پەرتوکی (عەقیدەی مرضیة) دانراوی سەیید (عبدالرحیمی مەولەوی) لێکۆڵینەوەی ، مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس ، لاپەڕە ٢٤٠.

# ئامۆژگاری سی و حەوتەم
## باسی زیکری بەیانیان و ئێواران دەکات

الحَمدُ لله الذي جَعَل ذكرهُ سَبباً في تنوير القلوبِ وَمَغفرةً لكَل المصائب والذنوب وَمن شَرحَ الله تعالى قَلبَهُ لذكره فَهوَ من أهلِ ودادِه وَحبه نَحمَده سبحانَهُ وَتَعالى عَلى ما أولانا مِن سابغ فضلهِ ، وَنَشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ في ذاتهِ وَلا في أفعاله وَلا في صِفاته، وَنَشهَدُ أنّ سيدنا مُحَمداً عَبدهُ وَرَسوله وَهو سيّد أصفيائه وأحبابه وَأنصارهِ وَالصّلاة والسّلام عَليهِ وَعلى آلهِ وَأصْحابهِ والتّابعين لِهَديهِ وَطريقهِ إلى إقفالِ باب التوبة من يطع الله وَرَسولَهُ فَقَد رَشَدَ وَأهتدى وَمَن يعصي الله وَرَسولَهُ فَقَد غوى وَأعتدى (أما بَعد فيا أيّها الإخوة المُؤمِنُون) واته لە دوایی هەندێ ئەی برایانی ئیماندار (فأتقوا الله في جَميعِ أوقاتكم لكي تنالوا رِضا الله) واتە : تەقوای خوای گەورە بکەن لەهەموو کات و ساتێکداو بەڵکو خوای گەورەتان لێ ڕازی دەبێ (فيا أيها المؤمن الكريم داوم على ذكر رَبكَ لَيلاً وَ نَهاراً يكفر اللهُ ذُنوبَك وَتكون به يوم لقائهِ مسروراً) واتە : ئەی ئیمانداره بەڕێزەکان بەردەوام بە لە زیکرو یادی پەروەردگارت شەو و ڕۆژ ڕەجا وایە گوناهوو تاوانەکانت عەفوو بکات وە هەروەها ئەو ڕۆژی بگەی بە خزمەتی خوای خۆت بە کەیف خۆشی و فەراحیەوە .

**( تێبینی )**

ئەم یادو زیکرانە زۆر بەسوودن بۆ موسڵمانان بیانکەی بە وێردێکی تایبەتی دەوامیان لەسەر بکەیت و ئەم زیکرانە بە بەیانیان (فەجرەوە)

دەست پـێ ئـەکرێن تـا خـۆر هـەڵاتن ، وە ئێـوارانیش لـەنێوان عەصر و خۆرئاوادا دووبارە ئەکرێنەوە ، چوونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی : (مَن قالَ حينَ يُصبِحُ وَحينَ يُمسي (سُبحانَ الله وَبِحَمده) مائة مرةً لَم يأت أحدٌ يوم القيامة بأفضل مما جاءَ إلاّ أحدٌ قالَ مثل ما قال أوْ زاد عليه) رواه مسلم عن أبي هريرة (رضي الله عنه) واتە : هەر کەسێ بەیانیان و ئێواران (سەد) جار ئەم (وێردە) بڵێ کە پاك وبێگەردی و سوپاسی خـوا ئەگەینەێ ئەوا لە ڕۆژی قیامەتـدا کەسـێ نییـە کـردەوەی لـەو چـاکتر بـێ مەگەر کەسێ وەك ئەوی کردبێ وە زیاتری کردبێ) ، هەروەها لە عبدالله ی کـوەڕی مەسـعودەوە ئەگێڕنـەوە کـەوا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی : (ئەگەر ئێوارەی لێبوایەوە ئەیفەرموو (أمسينا وَ أمسَ المُلكُ لله والحَمدُ لله لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ لَهُ الملـك وَهـوَ علـى كُـلّ شـيءٍ قـدير) واتـە: وا ئێوارەمان لێ بۆوە (یا ئێوارەمان لێ هات) وە موڵکی هەموو شـتێ هـەر بـۆ خوایە وە سوپاس بۆ خـوا هـیچ بەسـتراوێك نیـە جگـە لـەخۆی کـە تـاك و تەنیاو بێ هاوەڵەو خاوەنی هەموو شتێکە وە خۆی توانـای بەسـەر هـەموو شتێکدا هەیە).

(رَبِ أسألُكَ خَيرَ ما في هذه الليلة وَخَيرَ ما بَعدَها وَأعوذُ بِكَ مِن شَرِ مـا في هذه الليلة وَشَرِ ما بَعدَها) واتە : خوایە داوای ئەو خێرو چاکەیەت لێ دەکەم کە لەو شەوەدایە ، وە ئەو خێرو چاکەیەی کە لە دوای ئـەم شـەوەیە ، وە پەنات پێ ئەگرم لەو شەڕو خراپیـەی کـە لـەم شـەوەدایەو وە ئـەم شـەڕو خراپیەی کە لەدوای ئەم شەوەیە).

(رَبِ أعوذُ بِكَ مِن الكَسَلِ وَسوء الكبر رَبِ أعـوذُ بِـكَ مِـن عَـذاب في النّـارِ

وَعَذاب القَبر) واتە : خوایە پەنات پێ ئەگرم لە تەمەڵی و فیزو دەمار خوایە پەنات پێ ئەگرم لە سزای ناوز ئاگرو سزای ناو (قەبر) واتە ناو (گۆڕ) ، وە هەروەها ئەگەر ڕۆژی لێ بوایتەوە ئەیفەرموو (أصْبَحْنا وَأصْبَحَ المُلكُ لله) رواه مسلم . دیسان حەزرتی ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێت) بۆمان ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵەکانی فێرئەکردو ئەیفەرموو : (إذا أصْبَحَ أحَدَكُم فَليَقُل اللّهُمَ بِكَ أصبَحنا وَبِكَ أمْسَينا وَبِكَ نَحْيا وَبِكَ نَمُوتُ وإليْكَ النشُور) واتە : ئەفەرموێت (هەرکامەتان ڕۆژی لێ بوویەوە با ئەم وێردە بخوێنێ و دەری ببڕێ (خوایە وا بە یارمەتی و کۆمەکی خۆت بەیانی و ئێوارەمان لێ هات وە ئەژین و ئەمرین وە دوای مردنیش زیندووبونەوەمان بۆلای خۆت ئەبێت (وَإذا أمسى فَليَقُل اللّهم بِكَ أمسَينا وَبِكَ أصبَحنا وَبِكَ نحيا وَبِكَ نَموت وَإليكَ المَصير) رواه ابو داود والترمذي وَقالَ حديثٌ حسن صحيح، واتە : کاتێ ئێوارەی لێدەهات با ئەم وێردە بخوێنێ و دەری ببڕێ خوایە وا بە یارمەتی و کۆمەکی خۆت ئێوارەو بەیانیمان لێ هات ، وە ئەژین و ئەمرین و سەرەنجاممان هەر بۆ بەردەستی خۆت ئەبێت و گەڕانەوەمان بۆلای خۆتە.

## ( سەرنجێکی گرنگ )

لە جابرەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (هەرکەسێ گوێی لەبانگ بوو وە لەو کاتە ووتی (اللّهُمَ رَبَ هذه الدَعوة التّامة وَالصَلاةِ القائمة آتِ مُحَمداً الوَسيلةَ وَالفَضيلة وَأبعثهُ مقاماً مَحْمُوداً الذّي وَعَدته) وفي رواية (إنَكَ لا تُخلِفُ الميعاد) رواه البخاری.واتە: خوایە

پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تەواوە ، وەئەم نوێژە دابەستراوە وەسیلەو (فەضیلە) ببەخشە بەمُحَمّد (ﷺ) وە لەسەر ئەو شوێنە پیرۆزەی کە پەیمانت پێداوە زیندووی بکەرەوە ، هەروەها لە (ریوایەتێك) ئەمەشی لێ زیاد کراوە ، واتە : (تۆ موخالەفەی وەعد ناکەیت) وە بەڵێنەکەی خۆت ئەگەینیە جێ جا پێغەمبەر (ﷺ) لەفەرمودەیەکدا ئەفەرموێت (هەر کەسێ ئەم دوعایە بخوێنێ ئەوا لە ڕۆژی قەیامەتدا (شەفاعەتی) منی بۆ ڕەوا دەبێت) جا هەروەها وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (لا يُرَدُ الدُعاءُ بينَ الأذان والإقامة) (رواه أبوداود والنسائي والترمذي) واتە: پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت گێڕانەوەی نییە ، (ئیمامی ترمذي) ئەمەشی لێ زیاد کردووە (ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە چی بڵێین ؟ فەرمووی (سَلوا الله العَفوَ والعافية في الدُنيّا وَالآخِرةَ) رواه الترمذي وأبوداود. واتە: داوا لە خوابکەن لێخۆش بوون و سەلامەتی دونیاو قیامەتتان پێ ببەخشێ و پێ بدا.

## (فصل في الاستغفار والذكر والدعاء)[1]

يُستَحَبُ الإستغفار والذِكر وَالدُعاء بَعدَ السَلام وَيُستَحَبُ ذَلِكَ للإمام والمأموم والمُنفَرِد والرَجل والمرأة وَالمُسافر وَغيره لأنه وقت إجابة لما روي أبو أمامة (رضي الله عَنهُ) قالَ : قَالَ رَسُولُ الله (صلى الله عليه وسلم) أيُ

---

(1) باسێك لە پاڕانەوە و لە زیکرو لە دوعا کردن ، لە دوای سەلامدانەوە لە نوێژە فەرزەکان چاك وایە ئەنجامدانی سوننەتە.

الدُعاءِ أسمَعُ ؟ قالَ (جَوف اللّيلِ الآخرِ وَدُبُر الصلوات المكتوبات) [1] . وَلأن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) كانَ يَفعَلُ ذَلكَ لما رُوِي إبن عَباس (رضي الله عَنهُما) قالَ كُنتُ أعرفُ إنقضاء صَلاة رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) بالتكبيرِ وَفي رواية كُنا نَعرفُ [2] ، جا هەروەها لە پەرتوکی (المُعْتَمد في فقه الشافعي) [3] دا باسێکی تەواوی هێناوەتەوە بە دەلیل و بەڵگەو (حەدیس) لەسەر دوعاو پاڕانەوە و (زیکرو تەسبیحات) و تەهلیلەو (ئەورادەکان) لەدوای نوێژە فەرزو سوننەتەکان ، ئێمەش بۆ سوودو قازانج وەرگرتن ئەیانخەینە بەرچاوی خوێنەوارە ئازیزەکان جا ئەمەش (دەقی) فەرمودەکانەو بەلاّم لە پێشەکیدا ئەڵێ (وَيُسَن الإسرارُ بالذكرِ والدُعاءِ إلا أن يَكونَ إماماً يُريدُ تعليم المؤمنين فَيَجهَرُ بِهما وَلا مانِعَ مِن رَفع الصَوت بذلك لما روي إبن عباس (رضي الله عنهما) أن رَفع الصّوت بالذّكر حينَ يَنْصَرف النّاس مِن المكتوبةِ كانَ على عَهْد رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) وكنتُ أعلمُ إذا إتصرفوا بِذلِك إذا سَمِعتُهُ [4] .

١) وَعَن ثوبان (رضي الله عنه) قالَ كان النبي (صلى الله عليه وسلم) إذا إنصرف مِن صَلاته إستغفر الله ثَلاثاً وَقالَ (اللّهُم أنتَ السّلامُ ومِنكَ السلامُ

---

(1) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) لە پێشەوە (تەرجەمە) کراوە پێویست بە دووبارەکردنەوەی ناکات.

(2) بڕوانە: پەرتوکی (المجموع شرح المُهذب دانراوی (محي الدين أبي زكريا بن شرف النووي ، ج٤ ، لاپەرە ٤٧٣.

(3) بڕوانە پەرتوکی (المعتمد في فقه الشافعي) دانراوی (الدكتور محمد الزحيلي) ج١ ، لاپەرە ١١٤.

(4) بڕوانە هەمان سەرچاوە .

تَباركتَ يا ذا الجَلال والإكرام(١) قيل للأوزاعي وَهوَ أحد رواته كَيفَ الإستغفار ؟ قالَ تَقولُ أستغفرالله أستغفرالله ...

٢) وَكانَ إبن الزبير (رضي الله عَنهُما) يُهَلْل فِي أثر كُل صلاةٍ يقول(لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ، لَهُ المُلك وَلَهُ الحَمدُ وَهوَ عَلى كُل شيء قدير ، وَلا حَولَ وَلا قوة إلا بالله وَلا نَعبدُ إلا إياه ، وَلَهُ النعْمة وَلَهُ الفَضلُ وَلَهُ الثناءُ الحَسن لا إله إلا الله مخلصين لَهُ الدين وَلو كَره الكافرون ... ثُمَ يَقول (كان رَسُولِ الله (صلى الله عليه وسلم) يُهلْلُ بهذا دُبُر كُلَّ صَلاة ) رواه مسلم والنسائي وأحمد.

٣) وَعَن المُغيرة بن شعبة (رضي الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إذا إنصرف من الصلاة قالَ (لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لاشَريكَ لَهُ ، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمد وَهوَ على كُلّ شيء قَدير ... اللّهُم لا مانِعَ لِما أعطيت وَلا مُعطيَ لِما مَنَعتَ وَلا يَنفَع ذا الجِّد منْكَ الجَّد) رواه الشيخان.

٤) وَعَن أبي هريرة (رضي الله عنه) عَن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قالَ (مَن سَبَح الله فِي دُبُر كل صلاة ثلاثاً وثلاثينَ ، وَحَمِدَهُ ثلاثاً وَ ثلاثينَ ، وَكبَرَ الله ثلاثاً وَثَلاثينَ ، وَقالَ تَمام المِئة (لا إله إلا الله) وَحَدَهُ لا شَريكَ لَهُ لَهُ الملك وَلَهُ الحمد وَهوَ على كُل شيء قدير غُفرت خطاياه وإن كانت مِثلَ زُبُدَ البَحرِ) رواه مسلم .

٥) وَعَن كَعب بن عُجرة (رضي الله عنه) أن النبي (صلى الله عليه وسلم) قالَ (مُعقَبات لا يُخيبُ قائلَهن دُبُرَ كُل صلاة مكتبوة ثلاثَ وَثلاثونَ تسبيحة وثلاثون تحميدة وثلاث وثلاثون تكبيرة) رواه مسلم والنسائي.

---

(١) ئەم حەدیسە (مسلم) هێناویەتی ، دیسان بڕوانە (المجموع النووی) ج٣ ، لاپەڕە ٤٦٦.

**( ئاگادارییەکی گرنگ )**

ئەم چەند فەرموودەی کە لەپێشەوە تێپەڕی و کە تەرجەمەمان کردووە ئەوەی ڕاستی بێ حەدیسەکان زۆر سەهلەو هەموو کەسێك تێیان ئەگاو ، بەلاّم ئەوەی سوود بەخش بن و بۆ هەموو کەسێك وا تەرجەمەیان ئەکەین (حەدیسی یەکەم) لە ثەوبانەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە ووتویەتی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەنوێژ سەلامی ئەدایەوە واتە : کۆتایی بە نوێژەکەی ئەهێنا سێ جار ئەیفەرموو (أستغفر الله) واتە : پەشیمانم لەهەموو گوناهێك وە دەیفەرموو : (أللَّهُم أنتَ السَلام وَمنكَ السلام تباركت يا ذو الجَلالِ وَالإكرام) واتە خوایە گیان تۆ بەڕاستی سەلاّمی واتە (السلام) یەکێکە لەناوە پیرۆزەکانت وەهەموو سەلامەتی و بێ وەییەکیش لەتۆوەیە خێرو چاکەت زۆرە و فراوان بێت ئەی خاوەنی گەورەیی و ڕێزو بەخشندەیی هەرتۆی).

(حەدیسی دووەم) لە عبدالله ی کوڕی زوبیرەوە (خوایان لێ ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە ووتویەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەدوای نوێژەکان ئەیفەرموو (لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ...هتد) واتە ... بێگومان خوای گەورە تاك وتەنیاو بێ (شەریك) و بێ هاوەڵە خاوەنیەتی و سوپاس کردن هەر شایەنی خۆیەتی وە هەروەها خۆی دەسەلاّتی بەسەر هەموو شتێك دا هەیە هیچ هەوڵ و کۆششێك و هیچ هێزێك کەڵکی نیە جگە لەوەی خوای گەورە نەبێ ، بڕواداران جگە لە خوای گەورە هیچ ناپەرستن و بەدڵ سۆزی مل کەچی بۆ فەرمانەکانی ئەکەن ئەگەرچی بێ باوەڕان و دوو ڕووان پێیان ناخۆش بێت جا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) حاڵی وابوو لەناو هەموو

نوێژەکانی زیکرو تەهلیلەی دەکرد.

(حەدیسی سێ یەم) لە موغیرەی کوڕی شوعبەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای هەموو نوێژێکی فەرز ئەی فەرموو (لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ لَهُ المُلك وَلَهُ الحَمد ...هتد) واتە: هیچ خودایەك نییە لە غەیری زاتی ئەو تاك و تەنیایە بەبێ هاوەڵەو وە شایانی بۆ سوپاسکردنی وە دەسەلاّت دارایی خوای گەورە وەهەروەها دەری ئەبڕێ وەهەر بەخششێك خوا پێشکەشی بکات کەسێ نیە بتوانێ قەدەغەی بکاو وە هەرچی خۆی نەیداو قەدەغەی بکاو کەسێ ناتوانێ بیبەخشێ ، وە هەروەها پارەو سامان و دەسەلاّت و دەسەلاّتی دەسەلاّت داران هیچ کەڵك ناخواو ناگاتە فریای خاوەنەکانیان ئەگەر خوا خۆی ویستی نەبێ ، یان هیچ باوك و باپیرێك قازانج و (مەنفەعەتی) ئەولادو نەوەی خۆی نەدا و ئەگەر خۆی کردەوەی باشی نەبێ و خۆی هەوڵ و تێکۆشانی نەبێ).

(حەدیسی چوارەم) لە ئەبو هورەیرەوە ئەگێڕنەوە (ڕەزای خوای لێبێت) پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی هەر کەسێ دوای هەموو نوێژێ سی و سێ جار بڵێ (سُبحانَ الله) وە سی و سێ جار بڵێ (الحَمدُ لله) وە سی و سێ جار بڵێ (الله أكبر) ئەمە (٩٩) واتە نەوەت و نۆ ، ئینجا دوای ئەوە لە تەواوی سەدا ئەم زیکرە بڵێ کە تەنیایی و بێ هاوەڵی و دەسەلاّت داری خوای گەورە بەسەر هەمو شتێکدا دەرئەخا ئەوا چاوپۆشی لە گوناهە

وورده‌كانی ئه‌كرێت ئه‌گه‌رچی ئه‌وه‌نده‌ی كه‌فی ده‌ریا زۆربن[1].

(حه‌دیسی پێنجه‌م) له‌ كه‌عبی كوڕی عوجره‌وه‌ (ڕه‌زای خوالای لێبێت) ئه‌گێڕنه‌وه‌ ئه‌ویش له‌ پێغه‌مبه‌ری خواوه‌ (ﷺ) كه‌وا ئه‌فه‌رموێت : چه‌ند ووشه‌ویه‌ك هه‌ن دوای نوێژه‌ فه‌رزه‌كان هه‌ركه‌سێ بیانخوێنێ وه‌یان بیان كات خێرو پاداشتی، ناكه‌وێ و نادۆڕێت له‌لایی خوای گه‌وره‌ ئینجا، سی و سێ جار بڵێ (سبحان الله) سی و سێ جار بڵێ (الحمد لله) وه‌ سی و سێ جار (الله أكبر)، وه‌ته‌واوه‌كه‌ی ئه‌بێته‌ سه‌د جار بڵێ (لا اله الاّ الله وحَدهُ لاشريك لهُ المُلكُ وله الحمد بيده الخير يحيي ويميت وهو على كل شيء قدير).

## (تێبینیه‌كی گرنگ)

له‌ موعاذی كوڕی جه‌به‌ڵه‌وه‌ (خوا لێی ڕازی بێت) ئه‌گێڕنه‌وه‌ ئه‌ڵێ (أنَ رسُول الله (صلى الله عليه وسلم) أخَذَ بيَدي وَقالَ يا معاذ والله أنيّ لأُحبُكَ) واته‌: به‌ڕاستی ڕۆژێكیان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده‌ستی گرتم و له‌پاشان فه‌رمووی ئه‌ی معاذ قه‌سه‌م به‌ خوا من تۆم خۆش ئه‌وێت ، جا له‌ (ڕیوایه‌تێك) موعاذیش پێی ووت دایك و باوكم به‌قوربانت بێ ئه‌ی

(1) قال في كتاب المعتمد والخطايا الذنوب الصغيرة، (وزبدة البحر) ما يَعلو على وجهه عندَ هَيَجانه والمراد مهما كانت كثيرة، واته: له‌ په‌رتوكی (المعتمد) دا ئه‌ڵێ مه‌به‌ست له‌ (الخطايا) گوناهه‌ وورده‌كانه‌ (وزبده البحر) واته‌ كه‌فی سه‌ر ده‌ریا كه‌ به‌سه‌ر ئه‌كه‌وێ مه‌به‌ست له‌وه‌دایه‌ ئه‌گه‌ر گوناهه‌ بچووكه‌كان چه‌ند زۆریش بێت خوا هه‌ر (عه‌فووی) ئه‌كات.

پێغەمبەری خوا (ﷺ) منیش تۆم خۆش ئەوێت ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرموو (أوصيك يا معاذ لاتَدَعنَ في دُبر كل صلاةٍ أن تَقولَ (اللّهُم أعني على ذِكْرِك وَشُكرِكَ وَ حُسن عِبادَتِكَ) رواه أحمد ، واتە ئامۆژگاری موعاذ ئەکات کە لەدوای هەموو نوێژێك واز نەهێنیّ و ئەم وێردە بخوێنیّ کە پارانەوەیە لە خوای گەورە تا یارمەتی بدات لەسەر یاد و سوپاس و چاك پەرستی).

هەروەها لە (عبدالرحمان) ی کوڕی غونمەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (مَنْ قالَ قَبلَ أن يَنْصرف ويثني رِجلهُ من صلاة المغرب والصُبح (لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لاشريكَ لهُ ، لَهُ المُلك وَلَهُ الحَمْد بِيَدهِ الخَيرُ يُحْيِي ويُميت وَهوَ على كُل شيء قدير) عَشرَ مرات كُتِبَ لَهُ بكلّ واحدة عَشرُ حَسَنات وَمُحيت عَنهُ عَشرُسيئات وَرَفَعَ لَهُ عَشرُ دَرَجات) واتە : هەر کەسیّ ئەم (وێردە) بخوێنیّ وە شایەدی بدات بەتەنیایی و بیّ هاوەڵی و خاوەنیەتی خواو شایەنی سوپاسکردنی وە لەوەی کە هەموو چاکەیەك و مراندن و ژیان و هەر بەدەستی خوایە و چوونکە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکا هەیە (ئینجا دوای نوێژی مەغریب و بەیانیان بەر لەوەی هەڵستێتەوەپیّ بجەمێتەوە ، واتە هەربەو شێوەبیّ کە لەدوای سەلامدانەوەی نوێژ ئینجا دەجار بڵیّ (لا إله إلاّ الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ .هتد..) ئەوا بەهەر جارێکیان دە چاکەی بۆ دەنوسریّ وە دە خراپەی لەسەر لائەچیّ و ڕەش ئەبێتەوە ، وە هەروەها دە پلەی بەرز ئەبێتەوە (وَكانَتْ حرزاً مِن كُل مَكروهٍ وَحَرزاً من الشيطانِ الرّجيم ولَم يَحِل لِذَنب يَدركه إلا الشّرك فَكان من أفْضَل النّاس عَمَلاً إلاّ رجلاً يُفَضِلهُ بقول

أفضل مما قالَ) رواه أحمد و الترمذي.

واته : هەروەها پارێزگاری ئەبێ لە هەموو خراپەیەك ، بەتایبەتی لە شەیتانی دەرکراو و ڕەجم کراو ، وە هیچ گوناهێك ناتوانێ لەناوی بەرێ و (کافری) کات واتە بێ باوەڕی بکات جگە لە (شرك) دانان بۆ خوا بەمە چاکترین کەسە لە کردەوەدا جگە لە پیاوێك کە پێی بداتەوەو لەو کەسەو لەوێ لە ووتنەکەی ئەو چاکتر بلێت..) جا هەروەها لە (موسلیمی کوڕی حارث ەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەویش لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە ووتویەتی پێغەمبەر (ﷺ) پێی فەرمووە: (إذا صَليتَ الصُبحَ فقُل قَبلَ أن تُكَلمَ أحداً مِن الناسِ (ألّلهُمَ أجرني مِنَ النّار) سَبعَ مرات فإنَكَ إنْ مِتَّ مِن يَومِكَ كَتَبَ اللهُ عَزَ وَجَل لَكَ جواراً من النّار وإذا صَليتَ المَغرِبَ فقُل قَبلَ أنْ تَكّلم أحَداً مِنّ النّاسِ (اللّهُمَ إني أسئَلُكَ الجنّة اللّهُم أجرني مِنَ النّار) سَبْعَ مَراتٍ فإنَكَ إنْ مِتَ مِنْ لَيْلَتِكَ كَتَبَ الله عَزَ وَجَلّ لَكَ من النّار) رواه أحمد وَ أبو داود، واتە: کە لە نوێژی بەیانی بویتەوە پێش ئەوەی قسە لەگەڵ هیچ کەسێك بکەی (یان خەڵك بدوێنی) ئەوا حەوت جار داوا بکە لە خوا تا پەنات بدا لە ئاگری دۆزەخ جا هەروەها ئەگەر ئەو ڕۆژە مردیت ئەوا خوای گەورە پەنات دەدات لە ئاگری دۆزەخ ، وە هەروەها کە لەنوێژی مەغریب بویتەوە بەر لەوەی هیچ مرۆڤێك (یا کەسێك بدوێنی) ئەوە حەوت جار داوای بەخشینی بەهەشت بکەو هەروەها پەنادان لە ئاگری دۆزەخ بکەو لەخوای گەورە کە چەپاڵەت بدات و جا ئەگەر ئەو شەوە مردیت ئەوا خوای گەورە چەپاڵەو پەنات ئەدات لە ئاگری دۆزەخ.

**( ئاگاداری )**

هەروەها چەند سونەت و ئادابێکی (شەرعی) هەیە زۆر خێرە ئەگەر جێ بەجێ یان بکات (هەروەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆکرد) جا هەروەها سوونەتە بۆ ئەو کەسەی کە لەنوێژدا بێ (چ نوێژی فەرز یا سوننەت) سوورەتی تەواو بخوێنێ چوونکە سوورەتی تەواو با کەمیش بێ خێری لەچەند ئایەتێ لە سوورەتی زۆرترە ، هەروەها سوننەتە بۆ قورئان خوێن چ لەنوێژ دابێت چ لەدەرەوەی نوێژ دابێت ئەگەر گەیشت بە ئایەتی (ڕەحمەت) داوای رەحمەت بکاو وەئەگەر گەیشت بەئایەت (عەزاب) داوای عەفوو لێبوردن بکات سوننەتە کاتێ گەیشت بە ئایەتی عەزاب (إستعاذة) بکاو بە خوای گەورە لە (عەزاب) و سزا بیپارێزێت ، جا هەروەها کاتێ گەیشت بە ئایەتی (تسبیح) وە هەروەها (سُبحان الله) بکاو ، هەروەها کاتی گەیشت بە ئایەتی (ضَرْبُ المَثَل) واتەوێنەکان ، هەروەها سوننەتە باش لەو مەسەڵەیە تێبفکرێ و وورد بێتەوە و پەند وەربگرێت .

هەروەها کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴾ ئینجا بلێت (بلى وأنا على ذلكَ مِنَ الشّاهِدين) وە هەروەها کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحْـِۧىَ ٱلْمَوْتَىٰ ﴾ بخوێنێت بلێت (بَلى أشهَد) وەهەروەها ئەگەر گەیشتە ﴿ سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى ﴾ بلێت (سُبحانَ رَبي الأعلى) وە ئەگەر گەیشت بە ئایەتی ﴿ فَبِأَيِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴾ ی خوێندەوە بلێت (آمنتُ بالله)، وە هەروەها کاتێ گەیشت بە ئایەتی ﴿ فَمَن يَأْتِيكُم بِمَآءٍ مَّعِينٍۭ ﴾ بلێت (اللهُ رَبُ العَالَمِينَ) .

**( تێبینی )**

جا هەروەها خوێنەوارە خاوەن باوەڕەکان ئیمامی نەوەوی (ڕەحمەتی) خوای لێبێت لە پەڕتووکی (حملةو آداب القرآن) دا وە کیتـابی (الأذکار)[1] دا ئەفەرموێت (سوننەتە بۆ هەر کەسێك کە قورئان ئەخوێنێ لە نوێژ دابێت یان جگە لە نوێژ کاتێك بەسەر ئایەیتێکی (ڕەحمەت) تێئەپەڕێ داوا بکـات لە فەزڵی خوا ، وەکاتێ بەسـەر ئایـەتێکی سـزادا تـێ ئەپـەڕێ پـەنابگرێت بەخوا لە ئاگر. یا لە سـزایا یـا لەشـەڕ یـا لەخراپـە بڵێـت (خوایـە داوات لێ دەکەم لەش ساغم بکەیت یا بەهەر شێوەیەك بپارێیتەوە وە ئەگەر بەسـەر ئایەتێکدا تـێ پـەڕی باسـی پـاك و بێگـەردی پـەروەردگاری ئـەکرد بڵێـت (سبحان الله) یا (تبارك الله ربّ العالمين) یـا (جَلّـت عَظَمَـةُ رَبِنـا) یـا وێنـەی ئەمانەو جا هەروەها هەروەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆکرد ، کە گەیـشتیە سـەر ئـەم ئایەتانـەی سـورەتی قورئـان سـوننەتە (سـبحان الله) و دوعـاو پەناگرتن بۆ قورئان خوێن هەم لە نوێژدا هـەم لـە غـەیری نوێـژدا هـەم بـۆ (ئیمام) هەم بۆ (مەئموم) گوتنی سوننەتە .

**( پاشکۆ )**

جا هەروەها هـەروەکو لـە پێشەوە ووتمـان سـوننەتە بـۆ ئینـسان کـە بەتەنها نوێژ بکا یا بۆ (مەئموم) لەپاش جیابوونەوەو لە ئیمام بۆ نەفسی ئیمامیش پاش تەواوکردنی نوێژەکە خەریك بن بە خوێندنی ئەو زیکرانەوە

---

(1) بروانە پەرتوکی الأذکار المنتخبة من کلام سیّد الأبرار (صلی الله علیه وسلم) دانراوی (الحافظ محي الدين أبي زكريا بن شرف النووي) لاپەڕە ١٥٥.

کە حەزرەت (ﷺ) خوێندوونی و کردوونی بە وێرد ئەوجا هەروەها مامۆستای خوالێخۆشبوو (عبدالکریمی مدرس) لە شەریعەتی ئیسلامدا[1] ئەفەرموێت : سوننەتە لەدوای سەلام دانەوەی نوێژە فەرزەکان ئەم زیکرانە بکەن هەروەها سێ جار بڵێن (أستغفر الله العظيم) و بڵێن (أللهم أنتَ السَلام وَمِنكَ السَلام تباركت يا ذا الجلالِ وَالإكرام) جا (آية الكرسي) بخوێنن ئینجا سی و سێ جار بڵێت (سُبحانَ الله) وە سی و سێ جار (الحَمدُ لله) وە سی و سێی جار (الله أكبر) وە پاش ئەمانە دە جار (لا إله إلا الله) بخوێنن[2] هەروەها لە خودا بپاڕێنەوە بۆ چاکەی دونیاو قیامەت و (دەفعی) خراپەی دونیا لە ئەوەڵ و لە ئاخیری ئەم پاڕانەوەدا (صەلاوات) بدەن لە ڕۆح پاکی حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) وە هەروەها سوننەتە نوێژ کەر پاش نوێژی بەیانی و نوێژی مەغریب دە جار بڵێت (لا إله إلا الله وَحدَهُ لاشريكَ لهُ ، لَهُ المُلك وَلَهُ الحَمد يُحيي وَيميت بيده الخير وَهوَ على كُل شيء قدير) هەروەها سوننەتیشە لە نوێژی بەیانی و مەغریبیشدا حەوت جار بڵێیت (أللّهُمَ أسْكنّي الجنّة ... وە حەوت جاریش بڵێیت (أللهُمَ أجْرَنا مِنَ النّار) ، یان اللهم خَلصْنا مِنَ النّار) جا هەندێ لە زانایانی (شەرع) زان ئەڵێن سوننەتە ئەم زیکرانە بەلەسرخۆیی و بەنامەکی بخوێندرێن مەگەر بۆ ئیمامێ بیەوێ ، نوێژکەرەکانی پشتەوەی فێربکە ئەوە تا فێر ئەبن ئەبێ

---

(1) بڕوانە پەرتوکی (شەریعەتی ئیسلام بەپێی پەیڕەوی ئیمامی شافعی) لە نووسینی مامۆستا مەلا عبدالکریمی مدرس، بەرەگی ١ ، لاپەڕە ١٠٩.

(2) هەندێ لە زانایانی ئەهلی سونەت و جەماعەت ئەڵێن وا چاکە (١٠٠) سەد زیکری (لا إله إلا الله) لە دوایی نوێژە فەرزەکان ئەنجام بدەن هەروەکو لە (کتێبە گەورەکان بەیان کراوە و).

بە ئاشكرا بخوێنیٚ ، جا كاتێكیش كە فێربوون بە پەنامەكی بخوێنن ،
بەلاٚم ئیمامی (أذرعي) وای پیٚ باشە ئەگەر نوێژ كەرەكان كۆمەلٚ بوون بۆ
خوێندنی (زیكر) دەنگ بەرز كەنەوە بەلاٚم ئەم فەرموودەیە ((خاریجە) لە
مەزهەبی ئیمامی شافیعی (خوا لیٚی رازی بێت) جا لەسەر (تەقدیری)
ڕەفتار پیٚ كردنیش ئەبیٚ نەگاتە ئەندازەیەك سەر لەو كەسانە تێك بدا كە
لەوكاتەدا خەریكی نوێژن) (أعاذَنا الله مِنَ الغَفْلَة في الذكر والصّلاة ورَزقنا
الإخلاص وَالْحُضُور فِيهُما) نبهني الله وأياكُم من نَوْمة الغافِلين وحَشَرَني
وَإيّاكُم تَحْتَ لِواءِ سَيّد المُرْسَلين اللّهُمَ اغْفِرلَنا آمين) .

# ئامۆژگاری سی و هەشتەم

## باسی فەزڵ و گەورەیی ( صەلەوات ) دان بۆسەر گیانی پاکی حەزرەتی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم [1]

الحَمدُ لله الذّي جَعَلَ الصّلاة على نبيّه مُحَمّد لا يعد فضلها وَلا يَعصى إذ جَعَلَها تَكشف الهُموم والغُموم وتَكثر الأرزاق وتَقضي كُلَ مَطلَب صَعب وأستَعصى نَحمدَهُ سُبحانَهُ وَتَعالى ونَشكرُهُ شُكرَ مَن أطاعَهُ وَللشيطان عَصى وَنَشهَدُ أنَ لا إله إلا الله عالم الغيْب وَالشَهادة صلى الله عَلى نَبيه مُحَمَدٍ وَأمر بذَلك ملائكته وَعِبادهُ فقال ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ ...الخ ﴾ وَنَشهَدُ أن سَيّدنا مُحمّداً عَبدَهُ وَ رَسولَه سيّدُ الخَلقِ عَلى الإطلاقِ وَالصّلاة وَالسَّلامُ عَلَيهِ وَعَلى آله وَأصحَابِه الكِرام البررة وسائر التّابعين لسنّته وطريقهُ إلى قيام السّاعة) أما بَعد أيّها المؤمنون يَقولُ الله سبحانَهُ وَتعالى في كتابه المكنون) واتە لەدوای هەندێ ئەی ئیمانداره بەرێزەکان خوای تەبارەك و تەعالا لە قورئانی پیرۆزدا ئەفەرموێت ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ سوورەتی الأحزاب: ٥٦ ، واتە: ئەی ئیمانداران ئێوەش صەلاواتی لەسەر بدەن و بەچاکی و بەزۆری (درود) و (سەلامی) بۆ بنێرن (قالَ المُفسرون في هذه الآية الجليلة يخبرنا الحَقُ سُبحانَهُ وَتَعالى أنَهُ صَلى على نَبِيّه مُحمّد (صلى الله

---

(1) صلى الله عليه وسلم واتە (درودی خوای لەسەر بێت) ، چوونکە صەلاوات داوای رەحمەت بارین بۆ سەر گیانی پاکی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم).

عليـه وسـلم) قـديماً ولا زالَ يُـصَلي عليـه هُـوَ ومَلائكَتـه) واتـه ئەفـەرمون ئەوانەی (تەفسیری) ئەو ئایەتە پیرۆزەیان کردووە خوای گەورەو مەزن بە گـەورەیی خـۆی (درودو صـەلاواتی) بـۆ پێغەمبـەر (ﷺ) هـەناردووە لـە زووەوە جا هەروەها وازی لێ نەهێناوە خۆی و فریشتەکانی بە بـەردەوامی (وأنَهُ أمَرَ عِبادَهُ المُـؤمنين بِالـصلاة عَليـه) واتـە : بێگومـان خـوای گـەورە فەرمانی بە بەندەکانی ئیمانداران کـردووە کـە (درووودو صـەلاوات) لەسـەر پێغەمبەر (ﷺ) بدەن (وَالصلاةُ مِنَ الله تعالى رَحمةً أي أن الله تعالى يَتَـرَحَم بِرَحمَتـه الواسـعة علـى نَبيّـهِ مُحَمَّـدٍ في العاجِلـةَ والآجِلـة ، واتـە : صـەلاوات لەلایەن خوداو (رەحمەتە) چوونکە بەڕاستی خـوای تـەبارەك و تـەعالا زۆر (رەحم) و بەزەیی فراوانە بۆ سەر پێغەمبەر و خۆشەویستەکەی چ بەزوو چ بە درەنگ).

(وَالصلاة من الله تعالى رحمة والصلاة مِنَ المَلائكة إستغفاراً وَمِنَ الآدَميين دُعاء ، أي أمرنا الله تعالى أن ندعو بالرّحمة وَعلو المكانة لِرَسول الله (صلى الله عليه وسلم) [1] واتە : صـەلاوات لـەلای خـوداوە بەبـەرزی سـەیرکردن و ڕێزلێنـان و بارانـدنی رەحمەتـە بەسـەریدا ، صـەلاواتدانی فریـشتەکانیش دوعاکردن و پاڕانەوەیە بۆ بەرزبوونەوەی پلەو پایەی لەبەهەشتدا هەروەها صـەلاوەت دانـی موسـڵمانەکانیش دوعـا کـردن و پاڕانەوەیـە بـۆ زۆرتـر پاداشت دانەوەی و بەگەورە سەیرکردن و ڕێزلێنانیەتی لەبـەر پلـەو پایـەو جێگایەتی (درودی خوای لەسەر بێت) .

---

(1) بڕوانە پەرتوكی (الإشراقات الروحانيّة في الخُطَب المنبريّة والعظات الدينيّة) دانراوی مامۆستا (عبدالسلام العمراني الخالدی) لاپەڕە ٢٩٠.

## (ئاگاداریەکی گرنگ)

جا هەروەها خوێنەرانی ئازیزم (حەدیس) و فەرمووده یەکجار زۆرن بۆ تێگەیاندنمان لە گەورەیی و زۆری ئەجرو پاداشتی (صەلاوات) دان لەسەر گیانی پێغەمبەر (ﷺ) چوونکە بەڕاستی هەرکەسێ زیاتر (صلوات) ی لەسەربدا ئەوا نزیکترین کەس ئەبێ لە خزمەتیەوە شایەن ترین کەس ئەبێ بە (شەفاعەتی) لە ڕۆژی قیامەتدا ، چوونکە بێگومان هەر ئیمانداریێ سەلام بنێرێ بۆی خوای گەورە گیانی ئەکاتەوە بەراو تا وەڵامی سەلامەکەی ئەداتەوە ، وەهەر موسڵمانێ صەڵاواتێکی لەسەربدا لێی ئاگادار ئەبێ بەتایبەتی لە شەوو ڕۆژی هەینیدا چوونکە لە ئەوسی کوڕی ئەوسەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێڕنەوە ئەڵێت پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەفەرموێت (إن مِن أفضل أيامكم يوم الجُمعة فأكثروا عَلَيَ من الصلاة فيه فإن صلاتَكُم مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ) واتە : چاکترین ڕۆژەکان ڕۆژی هەینیە کەوابوو بەزۆری صەڵاواتی تیا بدەن لەسەرم چوونکە صەڵاواتەکان دەگەنە لام و پێم ڕائەگەیەنرێن (فَقالوا يا رَسول الله (صلى الله عليه وسلم) وَكَيفَ تُعرض صلاتُنا عَليك وَقَد أرَمَتَ ؟ قالَ يَقول بَلَيْتُ قال إنَ الله حَرَمَ عَلىَ الأرضَ أن تأكُلُ أجْساد الأنْبِياء) (رواه أبوداود/ والنسائي/ وابن ماجة والحاكم). واتە : ووتیان خوایان لێ ڕازی بێت) چۆن صەڵاواتەکانمان دەگەنە لات لەکاتێکدا تۆ وەفات دەکەیت و دەڕزیت لەناو خاکدا ، ئینجا پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامدا فەرمووی (دە ڕزم ئەگەر موبتەلاش بم لەناو گۆڕدا) بەڵام فەرمووی ئەوەی ڕاستی بێت خوای گەورە (حەرامی) کردووە لەسەر زەوی کە لاشەی پێغەمبەران بخوات وەیان بڕزێنێت (چوونکە ئەوەش تایبەتە بۆ پێغەمبەران و شەهیدان).

## (باسێك لەبارەی ئەجرو پاداشتی صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ))

١) عَن عبدالله بن عمر (رضي الله عَنهما) أنه سَمَع رَسُول الله (صلى الله عليه وسلم) يقول (مَن صلّى عَليَّ صَلاةً صلى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشراً) رواه مسلم ، واتە : لە عبدالله ی كوڕی عمری كوڕی عاصەوە (ڕەزای خوایان لێبێت) ئەڵێت گوێم لە پێغەمبەری خودابوو (ﷺ) ئەیفەرموو : هەر كەسێك صەڵاواتێكم لەسەر لێبدات خوای گەورە دە صەڵاواتی لەسەر لێدەدات.

٢) جا هەروەها لە (ئەبوطلحەی) ئەنساریەوە (ڕەزای خوای لێبێت) ئەگێڕنەوە فەرموویەتی : بەیانیەكیان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دڵ و دەروونی گەشابوونەوەو مـوژدەی خۆشی لەدەم و چاویا ئەبینرا ئینجا ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم بەیانیە ڕووی پیرۆزت گەشاونەتەوە موژدەی خۆشی لە دەمە وچاوتا ئەبینرێ ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی :) أجَل أتاني ءاتٍ من ربي عَزَ وَجَل فَقال (مَن صَلّى عَلَيْك من أُمَتِكَ صَلاةً كَتَبَ الله لَهَا بِها عَشرَ حَسَنَاتٍ وَرَدَّ عليه مِثلها) رواه أحمد، واتە فەرمووی : بەڵێ لەلایەن خوای گەورەوە نێردراوێك هاتەلام ووتی : هەركەسێ لە(ئوممەتەكەت) صەڵاواتێكت لەسەر لێبدات خوای گەورە دە چاكەی بۆ ئەنووسێ وە دە خراپەی لەسەر لائەچێ وە هەروەها پلەی بۆ بەرز ئەكاتەوە .

٣) عَن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) إنّ رَسُولَ الله (صلى الله عليه وسلم) قالَ (أوْلى النّاسُ بـي يـومَ القيامـة أكثَـرهُم علـيَ صـلاةً) رواه الترمذي.واتە : لە عەبدوللای كوڕی مەسعودەوە (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: نزیكترین خەڵكی لەمن لە ڕۆژی

دواییدا ئەوانەن زۆرتر (درووده صەلاَواتم لەسەر لیّ ئەدەن).

٤) عَن عمران الحُميري قالَ سَمعتُ عمار إبن ياسر (رضي الله عنهم) يقول : سَمِعتُ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) صلاةً إلا ابلغنيها وإنّي سألتُ رَبي أن لا يُصَلي عَلى عَبدٍ صلاةً إلا صلى الله عليه عَشراً أمثالُها) رواه ابن حبان/ والطبراني/ والبزار في مسنده) واتە : لە عیمرانی حمیری یەوە کە لە عُماری کوری یاسر (رەزای خوایان لێبێت) بیستووە ووتەیەتی : لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بیست دەی فەرموو (خوای گەورە فریشتەیەکی زۆری هەنە کە گوێیان لەهەموو بەندەکانی دەبێت وە هەر کەسێ صەلاَواتێکم لەسەر لێبدات ئەوا مسۆگەر فریشتەکان پێم رادەگەیەنن و ، وە داوام کرد لە پەروەردگارم کە هەر بەندەیەك صەلاَواتێکم لەسەر لێبدات خوا بۆخۆی دە صەلاَواتی لەسەر لێدەداتەوە).

٥) عَن أبي هريرة (رضي الله عنه) أنّ رسول الله (صلى الله عليهوسلم) قال: (لا تَجْعلَوُا قبري عِيداً وَصَلوا عَليَ فإن صلاتكم تُبلغني حيثُ كُنتُم) رواه أبو داود و أحمد) واتە : لە ئەبو هورەیرەوە (رەزای خوای لێبێت) ئەگێرنەوە ئەلّیّ پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (گۆرەکەم مەکەن بە جێگای سەفاو سەیران بەڵکو صەلاَواتم لەسەر لێبدەن چوونکە بەراستی صەلاَواتەکانتان لە هەر کوێیەك بن دەگات پێم (یان خوای گەورە بە فریشتەکان پێم رادەگەیەنیّ).

٦) جا هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) لە فەرمودیەیەکی تردا ئەفەرموێت : (أقرَبَكُم مني في الجَنة أكثَرُكم عَلَيَ صَلاة فَأكثروا الصلاةَ عَلي في الليّلة الغرّاء في اليوم الأزهر) رواه البيهقي . واتە : پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت لە

بەهەشتا ئەو کەسەتان گەلێك نزیکە لە منەوە کە زۆرتـر صـەڵاوات لەسـەر من دەدات کەواتە لە شەوە پڕشنگدارو پیرۆزەکان وەکـو شـەوی هـەینی و شەوە پیرۆزەکان زۆر (صەڵاواتم) لەسەر لێبدەن).

**( ئاگاداری )**

هەروەها صەڵاوات دان لەسەر هەموو پێغەمبـەران لەحەدیـسدا هـاتووە هەروەکو ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خوای لێبێـت) لـە پێغەمبـەری خـوا (ﷺ) ئەگێڕێتـەوە ئـەڵێ کـەوا پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمویـەتی (صَلوا علـى أنبياءِ اللهِ وَرُسُولهِ فإنّ اللهَ بَعَثَكُمْ كَمَا بَعَثَني) [1] واتە سەڵاوت بـدەن لەسـەر پێغەمبەرانی خـوا و نێراوەکـان چـونکە خـوای گـەورە ئەوانیـشی نـاردووە هەروەك چۆن منیشی ڕەوانە کردوە و هەناردوە و...)

## ( باسی صلاوات دان لە پێغەمبەر (ﷺ) لە پاش بانگەکان) [2]

جا بێگومان ئەوەی راستی بێت (صلاوات) دان لە دوای بانگەکانـدا لـە زەمانی فەرمانڕوایی مەرحوم (صلاح الدين الايوبي)ەوە ئەنجامـدراو ئینجـا لە پاش سوڵتان (صلاح الدين) کـراوە بـە (عـادەت) کـە (مـؤذن) لـە پـاش بانگـەکانی (غـەیری نوێـژی مـەغریب) کـە کـاتی کـەم و کورتـە/ سـێ جـار

---

(1) بۆ ئەم باسەو ئەو فەرموودەیە بڕوانە پەڕتووکی (جامع الصَحيح) وە، هەروەها ژمارەی فەرموودەکە /٣٧٦٥/ بەو ژمارەیەی)

(2) بڕوانە پەڕتوکی (نووری ئیسلام) دانراوی خوالێخۆشبوو (مامۆستا مەلا عبدالكريم مدرس) لەگەڵ کورتکردنەوەیدا) لاپەڕە/١٣٦)

(صلاّوات) لەسەر حەزرەت (صلّی اللهُ علیهِ وسَلَمْ) ئەدەن[1].

وە باسی کەس وتوویانە ئەمە باش نییە و (بیدعەتە) و –زیاد کراوە لە دیندا–بەلاّم ئەو کەسەی کە ئەم قسەیە ئەکا و–ئەمە هەلّەدا ڕۆیشتووە لەبەر چەند بەلّگە و دەلیل:

یەکەم: صلاّوات دان لەسەر حەزرەت (صلّی اللهُ علیهِ وسلمْ) ئەمری پێ کراوە بە ئەمرێکی (مُطلّق) واتە ئەمرەکە نە بەسراوە بە بازێ کات و بازێ شوێنەوە وە یاسایی دینی ئیسلام و (ئوصوولّی) فیقهی ئیسلام وایە هەر ئەمرێ کە (مُطلّق)بێ لە هەر کات و شوێنێکدا جێبەجێ بکرێ سوننەتە و بە (بیدعەت) ناژمێررێ مەگەر بە تایبەتی لەلایەن حەزرەتەوە (نەهی) کرابێ لە شتە (مأموریە) لە کات و شوێنێکی (خاصدا).

دووەم: حەزرەت (ﷺ) فەرموویەتی (ما رآهُ المُسْلِمونَ حَسَناً فَهُوَ عِنْدَ اللهِ حَسنٌ) رواه أحمد في كتاب السنّة/ واتە ئەو کارە و –ئەو /وتارە کە خوێندەوارانی موسلّمان بەباش و بە جوانی بزانن ئەوە لەلای خودا– وا جوانە/ وە ئەم (صلاّوات) دانە (تقریباً) هەشت صەد سالّە– لە عالەمی ئیسلامدا لە (ئەغلّەب) جێگە دا هەیە و (مەنع) نەکراوە تا لەم (ئاخر) زەمانەدا لە کاتی دوور کەوتنەوەیە لە باسی پێغەمبەر (صَلّی اللهُ علَیهِ وسَلَمْ) ئەم (مەنعە) هاتووەتە ناوەوە / جا ئەگەر ئەو (صلاّوات)دانە بە شێوەی (ئیجماع) پێی ڕازی بوون ئەوە بوو بە (ئیجماعی) ئوممەت و (ئیجماعی) ئوممەت بۆ هەموو کاتێ ئەکرێ بە (دەلیلی شەرعی) لەسەر

---

(١) جا هەروەها بازێ (مؤذن) (فاتحە)ش ئەدەن لە دوای سێ (صلاّواتەکە) ئەمەش شتێکی باشەو (موستەحەبەو) ڕەوایە.

جەوازی (مجمع علیه) وە ئەگەر بە (أكثرية)ەوە بوو ئەوە باشترە و/ وەكو حەزرەت (ﷺ) ئەفەرمووێ (وإذا رأيتُمْ الإخْتِلافَ فَعَلَيْكُمْ بالسَّواد الأعْظَمْ) واتە كاتێ (ئیختلافتان) چاو پێ كەوت بكەونە شوێنی كۆمەڵی گەورە.

سێهەم: كەس ناڵێ ئەو (صەڵاوات) دانە (وجبەو) تا بڵێ ئەی بۆچی (ئەصحابەكان) نەیان كردووە؟ وە ناڵێن: سوننەتی (موئەككەدەیە) هەتا بڵێت ئەی بۆ ئەوان بەجێیان نەهێناوە؟ خۆ (شەرت) نیە هەموو سوننەتێكی (غەیرە-موئەككەدە) ئەو (ئەصحابانە-تەطبقیان) كردبێ چونكە ئەوان شەو و ڕۆژ ماندووبوون بە (دینەوە) و (مەشغوڵی-جیهاد) و (دیفاع) بوون لە ئیسلام.....عەلاوەی ئەم باسانە ئێمە لە پێشەوە (قەرارمان)دا كە (ئیجتیهاد) بە دەڵیلی (شەرع) ثابیت بووە كە ڕاستە و (حەققەو) لە دینی ئیسلامە/ دەی لەم ڕۆژەدا -یا لە صەد ساڵ یا شەش صەد ساڵ لەمەو پێش (عالمە) گەورەكان فەرموویتیان/چونكە بێگومان خەڵك گەلێ (غافل) بوون لە (مەحەببەتی) حەزرەت (ﷺ) لە ماڵەوە و /دەرەوە و /بازاڕ و دەشت و دەر / لە عالەمی ئیسلامدا (دائیر) بوو/ با لە پاش بانگەكانەوە سێ (صەڵاوات) بدرێن لە پێغەمبەر (ﷺ) گەلێ - ئیحسانە و بەجێیە و خێرە[1].

---

(١) بڕوانە: پەرتووكی (نووری -ئیسلام) دانراوی خواڵێخشبوو (مامۆستا مەلا عبدالكريم مدرس)، لاپەڕە ١٢٧.

**(تێبینیەکی گرنگ)**

هەروەها خوێنەرانی ئازیزم سوننەتە صەڵاوات لێدان لەدوای بانگ وئیقامەت کردن چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی (إذا سَمِعتم المؤذنَ فَقولوا مثلَ ما يَقول ثُمَ صَلوا عَليَ فإنَهُ مَن صَلى عَليَ صلاةً صلى الله عليه بها عشراً ثُمَ سَلوا الله لي الوسيلة فإنَها مَنزلة الجنة لا تَنبَغي إلا لِعَبدٍ من عبادِ الله وَأرجوا أن أكون أنا هوَ فَمَن سأل لي الوسيلة حلَت لَهُ الشفاعة) رواه مسلم وغيرها ، واتە : کاتێك گوێتان لە بانگدەر بوو ئێوەش وەکو بانگدەر بڵێن و ئینجا وەڵامی بانگ بدەنەوەو ئەوجا لەپاشان صەڵاوات لەسەر من لێ بدەن چوونکە هەر کەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر لێ بداتەوە خوای گەورە دە خێرو رەحمەتی بەسەر دائەبارێنێ ئینجا دوعای (وەسیلە) م بۆ بکەن چوونکە (وسیلە) پایەو پلەیەکە لە بەهەشت تەنها بۆ یەك کەس لە بەندەکانی خودا دانراوە تکاموایە من ئەو بەندەیەبم ، جا هەروەها هەر کەسێك دوعای (وسیلە) م بۆ بکا ئەوا بێگومان (شەفاعەتی) منی دەگاتێ ئەمەش دوعای (وەسیلەیە) کە لەدوای صەڵاواتی پاش بانگ دەگوترێ وە ئەمەش دەقەکەیەتی (اللهُمَ رَبَ هَذهِ الَدعوة التامة وَالصلاة القائِمة آت مُحَمداً الوَسيلة وَالفَضيلة وَأبعَثهُ المَقام المَحمودَ الذَي وَعدتَهُ) [1] رواه الإمام البخاري.

---

(1) جا بەبەڵگەی ئەمەوە (ئیمامی نەوەوی و شێخ ابن حجر الهيتمي) دەفەرموون سوننەتە بانگدەر و ئیقامەتکەر و ئەوەی گوێی لەوانیشە گشتیان لەدوای بانگ و قامەت (سەڵاوات) لێ بدەن ئەوجا دوعای (وسیلە) بخوێنن بڕوانە (تحفە المحتاج) بەرگی (١) لاپەڕە ٤٨٢.

## (باسێکی تر لە چۆنیەتی صەڵاوات و سەلام لەسەر پێغەمبەر (ﷺ))

ئەوجا هەروەها سەڵاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) لەدوای (تشهد) و تەحیات خوێندن بەم جۆرەیە (أللّهُمَ صَلي عَلى مُحمّد وَعَلى آلِ مُحمّد كَما صَلَيتَ عَلى إبْراهيمَ وَعلى آل إبراهيم إنَكَ حَميدٌ مجيدٌ اللهُم بارك علـى مُحمّد وَعلى آلِ مُحمّد كَما باركتَ على إبراهيم وَعَلى آل إبـراهيم إنَـكَ حَميـدٌ مَجيـدٌ) رواه البخاري ، واتە : خوایە (درودو ڕەحمەت و بەرەکەتی) خۆت بەسەر پێغەمبەرو ئالو بەیت) و خانەوادەکەیدا بڕژێنە هەروەك بەسەر حەزرەتی (ابـراهیم) و خانەوادەکەیـدا ڕشـتووە ، چـوونکە تـۆ زۆر سـەخی و سوپاسگوزارو سەربەرزو سەربڵندو شکۆداری ، خوایە پیت و بەرەکەت بەسەر (محمد) و ئـاڵو بەیتەکەی یدا بڕژێنـە هەروەك بەسەر حەزرەتی (ئیبراهیم) و ماڵ و خێزانیدا ڕیشتووە چوونکە بەڕاستی تۆ خوایەکی زۆر سەخی و سوپاسگوزارو شکۆداری) یان بـەم شێوەیە بڵێـت (اللـهُمَ صَلي عَلَى وَعلى أزواجه وَ ذُرِيَته كَما صَلَيتَ على آل إبـراهيم وَبـارك علـى مُحَمـدِ وَعلى أزواجهِ وَذُريَتـهِ كَمـا باركـتَ عَلـى آل إبـراهيم إنَـكَ حَميـدٌ مجيـدٌ) رواه البخاري ومسلم ، بەڵام بەم شێوەیەش لە ئەبو هورەیرەوە (خوا لێـی ڕازی بێت) ئەگێڕنەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەوا فەرموویەتی : (مَـن سَـرَهُ أن يكالَ لَهُ بالمكيال الأوفى إذا صلى عَلينا أهل البَيت فَليَقُل) واتە : هەرکەسێ پێی خۆشە ئەجرو پاداشتی زۆری بۆ بنوسرێ و پێوانـەی گـەورەی بـۆ بپێورێ ئەگەر سەڵاواتی دا لەسەرمان بەم شێوەیە بڵێت: (اللهُمَ صَلي عَلـى محمدِ النَبي وَأزواجه أمهات المُؤمنين وَذريته وَأهل بَيتِهِ كما صَليتَ عَلـى آل

إبـراهيم إنَـكَ حَميـدٌ مَجيـدٌ) رواه أبـو داود و النـسائي، واتـه : هـەردوو سـەڵاواتەكە پوختــەی ماناكـەی ئەمەیـە ...(خودایـە درروودو ڕەحمــەت و بەرەكەتی خۆت بەسەر پێغەمبەرو خێزانـەكانی كـە دایكـانی ئیمانـدارانن و وەچەو بەرەو ئەهل و بەیتی ڕەحمەت باران كات ، هەروەكو ئالی حەزرەتی ئیبراهیم (سەڵات و سەلامی خوای لێبێت) ڕەحمەت باران كراوە .

خوایـە پیـت و بەرەكـەت بەسـەر موحەمـەدو خانەوادەكەیـدا برێـژە ، هەروەك بەسەر حەزرەتی ئیبراهیم و ماڵ و خێزانیتـدا ڕشـتووە ، چـوونكە خوای گەورە شایەنی سوپاس و خاوەنی بڵندییەكی زۆر مەزن و گەورەیە).

**( چەند سوودو فائیدەیەك لە بارەی صەڵاوەتدان لەسەر پێغەمبەر(ﷺ) )**

ئیمانداره بەڕێزەكان (صـەڵاوات) زۆرلێبـدەن لەسـەر گیـانی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە دونیــاو قیامەتــدا بــە مــرازی خــۆت دەگــەیت وە هــەروەها (شــەفاعەتی) پێغەمبــــەر (ﷺ) مــــسۆگەر ئەكــــەیت ، وە هــــەروەها گوناهەكانیشت ئەسـڕێنەوەوخودا (عـەفوت) دەكـات وەك حـەزرەت (ﷺ) ئەفەرموێت (أكثروا الصلاةَ عَليَ فإنَ صَلاتَكُم عَليَ مَغفِرَةٌ لِذنُوبكُم) رواه إبـن عساكر ، واته : زۆر سەڵاواتم لەسەر لێبدەن چوونكە بەڕاسـتی (صـەڵاوات) ووتن لەسەر من دەبێتە (باعسی مەحوبوونەوەی) گوناهی ئێوەو (عـەفوی) گوناهەكانتان ، جا هەروەها بێگومان (ڕیوایـەتكراوە) لـە پێغەمبـەر (ﷺ) هەروەكو لە پەرتووكی (كنزُ العمّال)[1] دا ئەفەرموێت: (أن النَبي (صـلى الله

---

(1) بروانە پەرتوكی (كنزُ العمال في سنن الأقوال والأفعال) دانراوی (تقی الدین الهندی) بەرگی ٧، لاپەڕە ١٧٣٥ ژمارەی حەدیس ٢٢٤٣.

عليه وسلم) قالَ (ثَلاثَةٌ تَحتَ ظلِ الرَحمَان عزَ وَجَل يَومَ لا ظِلَ إلا ظلُّهُ ، قيلَ مَن هُم يا رسول الله ؟ قالَ مَن فَرَجَ عَن مَكروب مِنْ أُمَتي وَمَن أحيا سُنَتي وَمَنْ أكثَرَ الصَلاةَ عَليَ) رواه الطبراني وغيره. واته : سىَ كەس لەژێر سێبەرى خودادان لە رۆژێكدا كە سێبەرى نيە بۆ كەس بەس بۆ ئەو كەسە نەبىَ كە خوا (رەحمى) پىَ بكا ئەوجا عەرزيان كرد ئەو سىَ كەسە كێن ؟ ئەى نێردراوى خوا ، فەرمووى يەكێكيان ئەوەيە كە ناخۆشى و نارەحەتى لەسەر ئومەتى مىن لابەرىَ ، وە يەكێكيان ئەوەيە ئاداب و سوننەت و دەستورى من رەواج پىَ بدا وە يەكێكى كەيان ئەو كەسەيە كە سەلاَواتى زۆرم لەسەر لێبداو بلێت).

جا هەروەها لە پەرتوكى (مطالع المُسّرات)[1] دا ئەلێ لەولاتێكى موسلّمانانداا لە گوندێك لە گوندەكان ئاويان ووشك ئەبىَ لەبەر بىَ بارانى چوونكە سەرچاوەى ئاويان تەنها كانياوێكبوو رۆژێك ئەو كانياوە ئاوى چك ئەبىَ و هيچ ئاوى تيا نەماوەو ئينجا خەلّكەكە خەريك بوو هەموو بە هيلاك بچن و بفەوتێن ، هەموويان دەستيان كرد بە گريان و هاوار هاوار لەوكاتەدا ئافرەتێكى (عەفيفەى) ئيمانداروو بەحەياو بەشەرەف جلێكى (شەرعى) لەبەردابوو دەستى كرد بە (دوعاو نزاو پارانەوە) لەسەر كانياوەكە ئينجا بە دوعاى ئەو ئافرەتە لەناكاو ئاوەكە هەلّقولاَو كانياوەكە پرِبوو لە ئاو خەلّكەكە تێرو پريان لىَ خواردەوە هەموويان كەيف خۆش بوون ئينجا زانايەكيش كە لەو گوندە دابوو ناوى (ئيمامى جزوولى) بوو بەمەى زانى

---

(1) بروانە پەرتوكى (مطالع المسّرات بشرح دلائل الخيرات) دانراوى (محمد المهدى بن أحمد بن على يوسف الفأسى) لاپەرە ١٦.

چووه لای ئافرەتەکەو داوای لێکرد ئایە بە چ شتێك گەیشتۆتە ئەم پلەو پایە بەرزە ، ئافرەتەکەش ووتی بەسەڵاوات لێدان لەسەر گیانی پێغەمبەر (ﷺ) بە بەردەوامی و خۆشەویستی پێغەمبەریش بەتەواوی ، جا هەروەها زانای بەناوبانگ (ئیمامی جزولی) لەخوا پاڕایەوە کە خوا (تەوفیقی) بدات بۆ ئەوەی پەرتوکێك بنووسێ لەسەر گەورەیی صەلاوات و (محەبەتی فەخری عالەم) و مەدحی پێغەمبەر (ﷺ) ئینجا ئەوەبوو خوای گەورە (تەوفیقی) داو کتێبی (دلائل الخیرات)ی داناو نووسی ئینجا بەهەزاران خوێندەوارو مامۆستاو ڕۆشەنبیران ڕۆژانە دەوری ئەکەنەوەو کردوویانە بە سەرمەشقی خۆیان ئەم وێردو سەلاواتانە ڕۆژانەش ئەکەنەوەو (کتێبەکەش) ناوەکەی بەخۆیەوەیە (دلائل الخیرات)ە.

## ( چەند ئاگادارییەکی گرنگ )

خونێنەرانی ئازیزم ئەوەی ڕاستی بێت خاوەنی شەرحی (دلائل الخیرات) ئەڵێ فائیدەو قازانجی سەلاوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) یەکجار زۆرە بەلام من بیست (فەوائیدم) ژمار کردووە منیش (٦-٧) ئەنووسم :

١) فائیدەو قازانجی سەلاوات لەسەر گیانی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەیە جێ بەجێ کردنی فەرمانی خوای گەورەیە کە فەرمانی پێ کردووین بە (صەلەوات) لێ دان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) هەروەکو لە ئایەتەکەی پێشوو (ئەمری) پێ کردووین .

٢) هەرکەسێ یەك (صەلاواتی) لەسەر لێ بدە خوای گەورە دە

(صەلآواتی) لەسەر لێدەدات.

٣) صەلآوات لێدان دەبێتە هۆی شەفاعەتی پێغەمبەر (ﷺ) بەتایبەتی داوای وەسیلەش بکەی بۆ پێغەمبەر (ﷺ).

٤) صەلآوات لێدان لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەبێتە هۆی لابردنی غەم و پەچارەو هەموو ناخۆشیەك هەروەکو لە(حەدیسدا) هاتووە .

٥) چ شەرەف و رێزێکی گەورەیە بۆ حەزرەتی (فەخری عالەم) کە خوای گەورە بە (عەظمەت) و گەورەیی خۆی (صەلآوات) لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) دەدات هەرچەندە سەلآوات دانی خواو عەبدەکان جیاوازن چوونکە سەلآواتی ئێمە دوعاو داواکردنە بەلأم سەلآوات لای خوای گەورە بۆ دیداری حەزرەتی پێغەمبەر (ﷺ) سەناو رێزو حورمەتە.

٦) هەرکەسێ سەلآواتی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) بدات لەلای خوای گەورە دە پلە بەرز ئەبێتەوە وە لەلای خوای گەورە دە چاکەی بۆ دەنوسرێت هەروەها دە گوناهیشی بۆ دەسڕێتەوە .

٧) خاوەنەکەی رێگای بەهەشتی بۆ دەدۆزێتەوە ، وە ئەوەی تەرکی بکات رێگای بەهەشتی لێ وون دەبێت چوونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی : (مَن ذُكرتُ عِندَهُ فَلَم يُصَلي عَلي فقد خُطيء طَريق الجَنة) رواه الطبراني ، واتە : ئەوە باسی من بکرێت لەلای و سەلآواتم لەسەر لێ نەدات ئەوا بێگومان رێگای بەهەشتی هەڵە کردووە).

( پاشكۆ )

وفي كتاب (شَرف المُصطفى)[1] يقول أن عائشة (رضـي الله عنهـا) كانَـت تُخيطُ شيئاً في وَقتِ السَحر فَضَلَت الإبرة وَطُفي السراج فَدَخَلَ عَليها النَبي(صلى الله عليه وسلم) فأضاء البيت بضوئه (صلى الله عليه وسلم) وَوَجَدَت الإبرة فَقالَت ما أضوأ وَجهَك يا رَسولَ الله ؟ قالَ (وَيلٌ لِمَن لا يَراني قالَت وَمَن لا يَراكَ ؟ قالَ : (البَخيل قالَت وَمَن البخيلُ قالَ الذي لا يُصَلي عَليَ إذا سَمِعَ بإسمي) واتـه : بەڕاستی لـه پـەرتوکی شـەرەف (المستەفا) ئەفـەرموێت (جارێـك خـاتوو عائیـشه ڕەزای خـوای لێبێـت) لـەماڵی خـۆی بەرگی ئەدووری ئینجا له کۆتایی شـەودا دەرزیەکـەی لـێ کـەوت هـەروەها چراش کوژابۆوه ئەوجا لەوکاته پێغەمبـەر (ﷺ) تەشریفی هاتـه ژووریّ و هـەموو خانووەکـەی بـەجاریّ ڕووناك کردەوه ئینجا خـاتوو عائیـشه دەرزیەکەی دۆزیەوه فەرمووی ، ئەی خۆشەویست بەڕاستی ئەم خـانووەت ڕووناك کـردەوه بـەجوانی سەروسیمات کـه خـوا پێـی بەخـشیوی (ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی ماڵ وێرانی بۆ ئەو کەسەی که من نابینیّ ئەوجا عەرزی کرد کیّ یه ئەی پێغەمبەر(ﷺ) که تۆ نابینیّ ، ئەویش لـه وەلاّمدا فەرمووی ئەو کەسەی که بەخیلّه جا عـەرزی کـرد کـیّ یـه ئـەو بەخیلّـه ؟ فەرمووی ئەو کەسەی که ناوی منی گویّ لێیەو صەلاّواتم لەسـەر نـالّیّ و لیّ نادات.

هـەروەها (حـاکم) لـه موسـتەدرەکا هێناویـەتی لـه (کـەعبی کـوڕی

---

(1) بڕوانه پەرتوکی (شرف المصطفى) دانراوی (الامام الحافظ ابي سعيد عبدالملك بن عثمان بن محمد بن إبراهيم النيسابوري) بەرگی دووەم ، لاپەڕه ١٠٣.

حەجەرەوە) (رەزای خوای لێبێت) دەڵێ پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆژێك فـەرمووی ئامادەبن ئێمەش ئامادەبووین ئینجا تەشـریفی بەسـەر قاڵدرمـەی یەكـەمی مینبـەر كـەوت و فـەرمووی (ئـامین) ئینجـا تەشـریفە چـووە دووەمـیش فەرمووی ئامین ئەوجا لە سێیەمیاندا هەر فـەرمووی (ئـامین) كاتێـك تـەواو بوو هاتە خوارێ ووتمان ئەمڕۆ شتێكمان لێت بیست كە ڕۆژانی دیكە لێمان نەبیستبووی ، فەرمووی جوبرەئیل خۆی پیشاندام و فـەرمووی (مـن دوعـا ئەكەم تۆش بڵێ ئامین) : (دوور بێ لە بەزەیی خواو لێخۆشبوونی كەسێك بگات بە مانگی رەمەزان و نەتوانێت خوا لەخۆی ڕازی نەكات و لێی خـۆش ببێـت گـوتم (ئـامین) ، هـەروەها كـە چـوومە دووەم قادرمـە حـەزرەتی جوبرائیل فەرمووی (دووربێ لەبـەزەیی خـواو لێخـۆش بـوونی كەسێك كـە ناوی تۆی لابرێ وە سەڵاواتت لەسەر لێ نەدات منیش ووتم (ئامین) ، ئینجا كە چوومە قادرمەی سێ یەم حەزرەتی جوبرائیل فەرمووی : (دوور بـێ لـە بەزەیی خـواو لێخـۆش بـوونی كەسێك بگـات بـەپیری بـاوك و دایكـی یـان یەكێكیان بەڵام خزمەتكردنیان نەكاتە هەڵی چـوونە بەهەشـت منـیش ووتم ئامین).

(یـاڕەبی خـوایی داخلـی بەهەشـتمان بكـەی لەبـەر خـاتری (مُحَمَّـد المُـصْطَفی) ی نـازدار وە لـە گوناهـەكانمان ببـوری وە بەبـەر شـەفاعەتی پێغەمبەرمان بخەی ئامین).

(وَصَـلّی اللهُ عَلَـی سَیّدنا مُحَمّـد الـنّبيِّ الأُمـيِّ الطـاّهر الزكـيِّ وَعَلـی آلـهِ وصَحْبِهِ وسَلَم نبهي الله وإياكُمْ مِنْ نومة الغافلِين وحَشَرني وإياكُم تَحْـتَ لـواءِ سيّد المُرسَلِين-اللّهُم إغفر لَنـا آمـين) سـبحان ربـك رب العـزة عمـا يـصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين

# خووتبەی دووهەمی هەموو ڕۆژانی هەینی بە زمانی عەرەبی

## (١)

الَحمدُ للهِ الحَميد المَجيد ، المُحصي المُبديء المُعيد قامع كُل جَبارٍ عَنيد ، الجَليل الذي يَفعَلُ في خَلقهِ ما يَشاءُ وَيَحكمُ ما يُريد، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ له إيماناً بوَعده ووعيده ، وَنَشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً عَبدُهُ وَرَسولَه الأمينُ المأمون والجواهرُ المَكنونُ وَصاحِبُ السرَ المَصون ، وَغَفرَ اللهُ ما تَقَدَمَ مِن ذَنبه وما تَأخر ، وَصَلوا وَسَلموا على مُحمدٍ كما صَلى وأمَرَنا بالصَلاة عَليهِ رَب العالمين، اللهُمَ صَلِ وَسَلِم على سَيدنا وَمولانا مُحَمدٍ وَعَلى آلهِ وَصَحبه وَخُلَفائه.

خصوصاً عَلى سادَةِ ديننا ذو القَدر العَلي وَالفَخر الجَلي حَضرةِ (أبي بَكر وَعُمَرَ وَعُثمانَ وَعَلي ) وَعَلى الحَسَنِ وَالحسين وحَمزَة وَالعباس وَعَلى الستّة الباقية من العَشَرةِ المُبَشَرة (رضوان اللهِ تَعالى عَلَيهم أجمَعين)

أوصيكم أيّها الناس، وَنَفسي أولاً بتَقو الله وَطاعَتهِ فَإن الله معَ الذينَ أتقوا وَالذينَ هُم مُحْسِنون ، أيّها المُؤمنون عَلَيكُم بإطاعة أوامر الله وَالإجتناب عَن ما نَهى عَنهُ الله ، وَعَليكُم بالصَلاة والسَلام عَلى حَبيبه الأمين ، قالَ عَز مَنْ قائل ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦

(اللهُمَ إغفر للمؤمنينَ وَالمُؤمنات ، وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات ، الأحياءِ مِنهُم وَالأموات ، إللهُمَ أنصر مَن نَصرَ الدينْ ، وَأخذل مَن خَذَلَ الإسلامَ وَالمُسلمين

، أللهُمَ وَفِق االعلماء وَالأُمَراء والرجال المُخلصين للوَطَنِ وَالدين ، أللهُمَ أحفظنا من البلايا وَالفِتَن بِجاه سَيد المُرسَلين آمين يا رَبَ العاَلَمين ، عِبادَ الله إن الله يأمر بالعَدلِ وَالإحسان وإيتاء ذي القُربى وَيَنهى عَنِ الفَحشاء وَالمُنكَر وَالبَغي يَعظُكم لَعَلَكُم تَذكرون).

( ٢ )

الحَمدُ لله الذي أمَرَنا بالإحسانْ ، ونَشهَدُ أنَ لا إله إلا الله المَلكُ المَنانْ ، ونَشهَدُ أنَ قائدَنا مُحَمَداً عَبدهُ ورَسولَهُ سيد ولد عدنْان ، وبَعد أوصيكُم بتَقوَ الله وَالإحسان ، وَصلوا وَسلموا عَلى مُحَمَدٍ كَما صَلى عَليه مَعَ مَلائكَته في القُرآن ، حَيثُ قالَ جَلَ وَعَلا تعظيماً لِقَدر نَبينا وتَكريماً ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦ ، أللهُمَ صَلِ وَسَلم عَلى سيدنا مُحَمَدٍ وعَلى آلِ سَيدنا مُحَمد ، يا أيُها الرّاجون شفاعتَهُ في القيامة صَلوُا عَليهِ وَسَلموا تَسليماً) (اللهُمَ إغفر للمؤمنينَ وَالمُؤمنات ، وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات ، الأحياءِ منهُم وَالأموات ، إللهُمَ أنصر مَن نَصَرَ الدينْ ، وَأخْذل مَنْ خَذَلَ الدين ، وَأيدنا عَلَى الحَقِ برَحمَتِكَ يا أرحَمَ الراحمينَ، أللهُمَ أحشُرنا مَعَ الأنبياء وَالمُرسَلين، وأحفظنا مِن البلايا والمَصائب والفِتَنْ بجاهِ سيّد المُرسَلينَ، اللهُمَ زدنا إيماناً وَيقينا ، وَأنصرنا نَصراً مُبيناً ، أللهُمَ أحسن أحوالَنا ، وَبَلغ مما يَرضيكَ آمالَنا ، وَخَتم بالصّالحاتِ أعمالَنا وبالسَعادات آجالَنا ، أللهُمَ أجمَع قلُوبَنا عَلَى الهُدى ، وَوَفقنا لَما تُحِبُ وتَرضى ، وَأجِب يا رَبَنا هذا الدُعاء إنَكَ عَلىَ ما تَشاءُ قَدير وَبالإجابَةِ جدير، عِبادَ الله إن الله يأمرُ بالعَدلِ والإحسان وإيتاء ذي القُربى وَينهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَر وَالبَغي يَعظُكُم لَعَلَكُم تَذكرون — وَلَذكرِ الله أكبرُ ، وَاللهُ يَعلَمُ ما تَصنَعُون).

( ٣ )

الْحَمدُ لله وَبه نَستَعين عَلى أمور الدُنيا وَالدّين، وَنَسأله العَمَلَ بالكِتاب المُبين ، وَسُنة سيد المُرسَلين وَنَعوذُ بالله من شرور أنفُسِنا وَسَيئات أعمالنا ، وَمن هَمَزات الشَياطين وَنَزَعات المُلحدين، وأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ، مَنْ عارضَهُ في أمرٍ سَلَبَ عَنْهُ النّعْمة ، وأحَلَ السُخْطَ وَالنقمَةَ ، وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً عَبدُهُ وَرَسولُه البشيرُ النَذير وَالسراجُ المُنير ، عبادَ الله ، إتَقوا اللهَ تعالى في جَميعِ أوقاتِكم في السّرِ وَالعَلَن ، ثُمَ أعلَموا أن الله تعالى أمركُم بأمر بدأ فيه بنفْسهِ وَثَنى بِملائكة قُدْسه ، وَثَلّث بكُم أيها المُسلمُون مِن جنّه وَ إنْسه ، حَيثُ قالَ جَلَ وَعَلاَ تَكريماً لِقَدرِ نبينا وَتَعظيماً ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾ الأحزاب: ٥٦ .

أللهُمَ أنصر الإسلامَ وَالمُسلمين ، وَأخذِل الكَفَرةَ وَالمُشركين ، أللهُمَ أدفع البَلاءَ وَالفتَن عَنا يا رَبَ العَالَمين وَجعَلنا مِنْ وَرَثَة جَنَة النَعيم ، بِجاه مَنْ كانَ نَبياً وآدَمَ بين الماءِ وَالطين، عبادَالله إن الله يأمرُ بالعَدلِ وَالإحسان وَإيتاء ذي القُربى وَيَنهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَرِ وَالبَغي يَعظُكُم لَعَلَكُم تذكّرون) أقم الصلاة.

( ٤ )

الحَمدُ لله الذّي فَرَضَ الإحسانَ إلى الوالدينِ ، ونَشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً عَبدُهُ وَرَسوُله... وبَعدُ أوصيكُم أيّها المُسلموُن بِتَقوى اللهِ وَالإحسان إلى الوالِدَيْن وَجَميع الفُقَراءِ وَالمَساكِين ، وَأمَرَنا بالصلاةِ عَليهِ حَيثُ قال جَلَ وَعَلا تَعظيماً لِقدرِ نَبينا وَتَكريماً ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾.

أللهُمَ صَلِ على قائدِ الإسلام سَيدِنا مُحمد وَعَلى آلهِ وَأصحابه ... يا أيها الذينَ آمنوا صَلوا عَليه وَسلموُا تَسليماً حَتىَ تَنالوا جَنةً وَنَعيماً..). اللهُمَ إغفر للمؤمنينَ وَالمُؤمنات ، وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات ، الأحياءِ منهُم وَالأموات خصوصاً مِن أهلِ البّرِ بِالوالدين والسنُّة والجُمعَة وَالجَماعات ، أللهُمَ اغفر لِلمُسلمينَ وَلِوالدينا يا أرحمَ الراحمينَ يا قاضي الحاجات اللهم أحفَظْنا مِنَ المصائِب وَالفِتَن بجاه سيّد السّادات، عِبادَ الله إن الله يأمر بالعدل وَالأإحسانِ وَإيتاء ذي القُربى وَينهى عَنِ الفَحشاء وَالمُنكَر وَالبَغي يَعظُكُم لَعَلَكُم تَذكرونَ)

( وَلَذِكرُ اللهِ أكبر وَاللهُ يَعلَمُ ما تَصنَعُون ... قُوموا إلى صلاةِ الجُمعَةِ رحِمَكُم الله)

( ٥ )

الحَمدُ لله ربِّ العَالمينَ ، وَالعاقِبَةُ للمُتقن ، والنَدامَةُ لظالمين، وَأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً عَبدُهُ وَرَسولُه.وَهوَ إمامُ المُتَقين، وقائد الغُرِ المُحجّلين ، وَالصلاةُ وَالسَلام عليه وعلى آله وَأصحابه ، أوصيكم بِتَقوى الله وَمراعات الواجبات ، وَصَلوا وَسَلموا عَلى مُحَمَدٍ فَخرِ الكائنات إمتِثالاً لأمرِ رَبِ البَريات، حَيثُ قالَ جَلَ شأنهُ تَعظيماً لِقَدرِ نَبينا وَتكريماً ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾. أللهُمَ صَلِ وَسَلم عَلى قائدِ الإسلام أبي القاسمِ مُحَمَدٍ وَعَلى آله وَأصحابه أجمَعين ، يا أيّها الراجُونَ شَفاعَتَهُ في القيامة صَلوا عَليهِ وَسَلموا تَسْليماً، اللّهُمَ إغفر للمؤمنينَ وَالمُؤمنات ، وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات، أللهُمَ أنصرالإسلامَ والمُسلمين وَأخذل الكَفَرةَ وَالمُشركين، وَأعلي كَلِمةَ الحَقِّ وَالدّين، أللهُمَ وَفِّق العُلَماءَ العَاملين والرِّجالَ المخلصين للوطَنِ وَالدين) أللهُمَ إحفظنا مِن شَرِ الظّالينَ، وأحفظنا من المصائبِ وَالفِتَن يا رَبَ العالَمين ، عِبادَ الله إن الله يأمرُ بالعَدلِ وَالأإحسان وإيتاءِ ذي القُربى وَينهى عَنِ الفَحشاءِ وَالمُنكَر وَالبَغي يَعظكم لَعَلَكُم تَذكرون).

( ٦ )

الحَمدُ لله الذي جَعَلَ العِلمَ والعُلَماء مِثلَ نجوم السّماء، وَجَعَلَ العِلمَ ضياءً، والقرآنَ نوراً ، ورَفَعَ الذينَ أوتوا العِلمَ دَرَجات بيناتٍ كَما هو مذكورٌ في القرآن ، وَجَعلَ العلماء وَرَثةَ الأنبياء ، كَما أخبَرَ سَيد السادات ، وَأشهَدُ أن لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ وَأشهَدُ أن سَيدَنا مُحَمداً عَبدُهُ وَرَسولُه.المرشدَ الحَكيم وَالمُعَلّمَ العَظيم (عِبادَ الله) وَيلُ للذّين ﴿ يَعْلَمُونَ ظَـٰهِرًا مِّنَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ ٱلْـَٔاخِرَةِ هُمْ غَـٰفِلُونَ ﴿٧﴾ ﴾.

فَمَتى تُعَمِّرونَ المدارِسَ وَمَتى يُعَلِّمُ فيها الدّينُ الصَحيحُ وَقَد أوشَكَت العلُومُ الإسلامية أنْ تُرفَعَ مِن هذهِ البلادِ وَتَذهَبَ وَالله لا يَقبِضُ العلمَ إنتزاعاً يَنتَزِعهُ ، ولَكنْ يَقْبضُ العلمَ بِمَوت العُلَماء ، والإعراض عَنهُم ، فَرُبَما إتَخَذَ الناسُ رُؤساءَ جُهالاً وَأفتَوُهُمْ بِغَيرِ علمٍ ، فَضَلوا وَأضَلوا[1] وأتقوا اللهَ وَصَلَوا وَسَلمُوا عَلى مَنْ أمرتُمْ بالصَلاةِ وَالسَلامِ عَليهِ عُموماً بِقَولِهِ تعالى :

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴾

اللهُمَ إغفر للمؤمنينَ وَالمُؤمنات ، وَالمُسلمينَ وَالمُسلمات ، الأحياء مِنهُم وَالأموات ، وَأخذل الكَفَرةَ الطاغينَ الباغين ، أعداءَ الإسلامِ وَأعداءَ الدّين ، أللهُمَ أرفع دَرَجَةَ العُلَماء العاملين، والأمراء والرّجال المُخلصين للوَطَنِ

(1) بڕوانه پەرتوكى باخێكى پڕ بەرهەم لە ووتارەكانى سەردەم لـە نووسـينى مامۆسـتا (ياسين مەلا عبدالله ) لاپەڕە /٢٢٠، لەگەڵ دەستكارى

وَالدين، أللهُمَ يا كَريمَ يا ستار وَيا عَزيزُ يا غفار حَرِّم وجُوه أهْلِ السُنة والجُمعَة والجَماعات عَلى النّار، عِبادَ الله إن الله يأمرُ بالعَدلِ وَالإحسان وَإيتاء ذي القُربى وَينهى عَنِ الفَحشاء وَالمُنكرِ وَالبَغي يَعِظُكُم لَعَلَكُم تذكرون) وَلَذكر الله أكبر)).

## (٧)

الحَمدُ لله الذّي بِيَدهِ مَلَكوتُ كلَ شيء وَإليهِ تُرجعُون ، وَإذا قَضى أمراً فَإنما يَقولُ كُنْ فَيكون ، وَلَهُ الحَمدُ في السَموات وَالأرضِ وحَشياً وَحينَ تُظهرون ) وَأشهَدُ أنْ لا إله إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَهُ ، وَأشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمداً عَبدهُ وَرَسولهُ الذي أختارهُ لديهِ وأصطفاهُ وَجَعَلَهُ شَفيعاً وَذُخراً لأمتهِ يَومَ الحَشرِ واللّقاء اللّهُمَ فَصَلي وَسَلمْ عَلَيهِ وَعَلىَ أله وَأصحابه وَأتباعه وَمَنْ وَلاهُ، عِبادَ الله ... مالَكُم عَن اللهِ مُعرضون وَعَنْ المَوتِ غافلُون وَبأوامرِ الدينِ مُتَساهِلون وَمُتَكاسِلُون فَلا الصلاةَ تُقيمُون وَلا الزكاةَ تُؤدّون ، وَلا بِمَعروفٍ تأمرُونَ، وَلا عَنْ مُنكرٍ تَتَناهَون ، أفبهذهِ الدُنيا تَفْرَحُون وَتَمرَحونَ ، وَاللهِ تَمُوتون كَما تنامُونَ، وَتَستَيقظُونَ كَما تَستَيقظُون، فأتقْوا اللهَ حَقَ تَقواهُ، وَلاتَموتُنَ إلا وَأنتُم مُسلمُونَ، وَلا تَكونُوا مِنَ الذّينَ فَرَقوا دينَهُم ، فَكانوا شيعاً كُلُ حِزبٍ بِما لَديهُم فَرِحُون[١]، وَصَلوا وَسَلموا عَلَى سَيدِ السّادات وَأمَرَنا بالصّلات عَليهِ رَبُ العالَمين حَيثُ قالَ تَعَظماً لِخاتَمَ النَّبيينَ

---

(١) بروانه پەرتووكى ( الفتُوحات الرَبانية بالخُطَب وَالمواعِظ القُرآنيـة) دانـراوى بـەرێز ( محمد سليم البيحانى ) لاپەرە /٣٤٣.

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴾، اللهُمَ أعزّ الإسلامَ وأنصُر المُسلمينَ، وأذلَ الشركَ والمُشركين، وأهلِك الكَفَرةَ المُنافقينَ والمُلحدين والمُرتَدين والمُعتَدين — اللهُمَ أرْحَمِ العُلَماء العاملين والأمراء العادلينَ الذينَ قضوا فينا بالحَقِ وبهِ كانوا يَعدلون ، عِبادَ الله إن الله يأمرُ بالعَدلِ والإحسان وإيتاء ذي القُربى وينهى عَنِ الفَحشاء والمُنكرِ والبَغي يَعِظُكُم لَعَلَكُم تذكرون) ولَذِكُر الله أكْبرُ والله يَعلَمُ ما تَصْنَعُون)).

( ٨ )

الحَمدُ للهِ العَلي الكَبير ، المُتَعالي عَن الشبيهِ وَالنَظير، ليسَ كَمثلهِ شيء وَهوَ السَميعُ البَصير ، وَأشهَدُ أنْ لا إلـه إلا الله وَحدَهُ لا شَريكَ لَـهُ المَلكُ القَدير ، وَأشهَدُ أنَ سَيدَنا مُحَمداً عَبدهُ وَرَسولهُ البَشيرُ النَذير وَالصَلاةُ وَالسَلامُ عَليهِ وَعَلى إخوانهِ مِنَ الأنبياءِ وَالمُرسَلين، وَالصَحابَةِ وَالتابعين ، وَبارَكَ عَليهِم إلى يوم الدّين عِبادَ الله.. إتَقوا الله فإنَكُم عَليهِ تُعرَضُون ، وَأخْلصُوا لَهُ الأعمالَ فَإنَكُم عَليها مُحاسَبُون ، وَعامِلُوا أنفُسَكُم وَرَبَكُمْ وَإخوانكم بأحْسَنِ المُعامَلات ، ليكُونَ جَزاؤُكم في الآخرةِ مأجورة وَمَسْرُورة ، وَأعلَمُوا كُلَ شَيءٍ دُونَ اللهِ باطِلٌ ، وَكُلَ نَعيمٍ دُونَ نَعيم الجَنَةِ زائِلٌ ، وَأذكرُوا نِعمَةَ الله عَلَيكُمْ ، وأقيُموا الصلاةَ وَآتوا الزكاةَ وَأعتَصِمُوا بالله هُوَ مَولاكُمْ فَنِعمَ المَولى وَنِعمَ النَصير، وَكونُوا عِبادَ اللهِ إخواناً وَتَمَسَكُوا بِتَعاليم دينكم، تَكُونوا مِنَ الفائزينَ أللهُمَ صَلي وَسَلم وَبارِك عَلى حَبيبِكَ المُصطَفى وَرَسُلِكَ المُرتَضى، خاتَمُ الأنبياءِ وَالمُرسَلين ، وَعَلى آلهِ وَأصحابهِ أجمَعين )

اللّهُمَ إغفر للمُسلمينَ وَالمُسلِمات وَ المؤمنينَ وَالمُؤمنات ، ، الأحياء وَالأموات ، إنَكَ سَميعٌ قَريبٌ مُجيبٌ لدَعوات ، أللهُمَ أن تَعز الإسلامَ وَتنْصُر المُسلمينَ ، وَتُب على العُصاة وَالمُذنبينَ ، مِنْ أُمَةِ مُحَمَدٍ أجمَعين عِبادَ الله إن الله يأمرُ بالعَدلِ وَالإحسان وَإيتاء ذي القُربى وَينهى عَنِ الفَحشاء وَالمُنكرِ وَالبَغي يَعظُكُم لَعَلَكُم تَذكّرُونَ).

## ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ وەرگرتوون ئەمانەی خوارەوەن:

١- قورئانی پیرۆز.

٢- تەفسیری ئیمامی رازی (التفسیر الکبیر).

٣- تەفسیری ئیمامی قورطبی (تفسیر جامع الاحکام).

٤- تەفسیری ئیمامی ئالوسی (التفسیر سبع المثاني) المسمی روح المعانی).

٥- تەفسیری (روح البیان) دانراوی اسماعیل حقي.

٦- تەفسیری (خازن ومدارك).

٧- تەفسیری (في ظلال القرآن) دانراوی سید قطب.

٨- تەفسیری (ابن کثیر).

٩- تەفسیری (واضح) دانراوی محمد محمود الحجازی.

١٠- تەفسیری (مختصر الطبری) دانراوی محمد جریری الطبری.

١١- تەفسیری (صفوة التفاسیر) دانراوی محمد علی الصابوني.

١٢- تەفسیری (نامی) ملا عبدالکریمی المدرس.

١٣- تەفسیری (خاڵ) الشیخ محمد خاڵ.

١٤- تەفسیری (ژیانی ئینسانی) ملا حسین اربیلی.

١٥- دەنگی دەرون مامۆستا ملا شیخ محمد البالیسانی.

١٦- کتێبی (الجامع الصحیح) للبخاری ومسلم.

١٧- (الجامع الصحیح) للامام الترمذي.

١٨- تاج الاصول للشیخ علی منصور الناصف.

١٩- الترغیب والترهیب للحافظ المنذري.

٢٠- منهاج الصالحین تألیف عزالدین بلیق.

٢١- محاضرة الابرار الشيخ ابن العربي.

٢٢- فيض القدير شرح الجامع الصغير تأليف عبدالرؤوف المناوى.

٢٣- مصباح الظلام وبهجة الانام تأليف الشيخ محمد عبدالله الجردانى.

٢٤- النصائح الدينية والوصايا الايمانية دانراوى (بركه الانام عبدالله باعلوى الحداد).

٢٥- كشف الخفا (دانراوى) الشيخ اسماعيل العجلوني.

٢٦- الوعظ والارشاد تأليف زين العابدين التونسى.

٢٧- احياء علوم الدين دانراوى محمد الغزالي.واته ئيمامى غزالّى رەحمەتى خواى لێبێت

٢٨- الفتوحات الربانية محمد سالم البيهاني.

٢٩- الارشاد والخطابة دانراوى (محمد محمد بن يوسف).

٣٠- تنبيه المغترين دانراوى الشيخ عبدالوهاب الشعراني.

٣١- ربيع الابرار تأليف (العلامة الزخمشري).

٣٢- (الجواهر المرصعة- الخطب المنوعة) عبدالرحمن بن احمد بن عبدالرحمن يحى الكمالى.

٣٣- العقيدة المرضية دانراوى (عبدالرحيم مولوى).

٣٤- (شرح النفسيه فى العقيدة الاسلامية) تأليف الدكتور عبدالملك عبدالرحمن السعدى.

٣٥- (العقائد الاسلامية) دانراوى السيد سابق.

٣٦- عەقيدەى كوردى دانراوى (شيخ عبدالسميع).

٣٧- التعريفات تأليف (السيد الشريف على بن محمد الجرجانى).

٣٨- عقيدتك ايها المسلم دانراوى عبدالعليم عبدالرحمن السعدى.

٣٩- بەهار و گولزار دانراوى مامۆستا ملا عبدالكريمى مدرس.

٤٠- ڕابەری بەندەکان دانراوی مامۆستا عبدالله گناوی.

٤١- اقترن النیرین دانراوی مامۆستا رشید بەگی بابان لێکۆڵینەوەی محمد علی قەرەداغی.

٤٢- یاساکانی ئیسلام دانراوی محمد عبدالکریم.

٤٣- پێنج پایەکانی ئیسلام مامۆستا عبدالعزیز پارەزانی.

٤٤- کوڕی ئامۆژگاری مامۆستا محمد شلماشی.

٤٥- (الاتحافات السنیة بالاحادیث القدسیة) عبدالرؤوف المناوي.

٤٦- (نور العباد الی الطریق الوعظ والارشاد) محمد عبدالغني سلیمان.

٤٧- الخطبة المنبریة تألیف محمد مصطفی ابو علاء.

٤٨- تاوانە گەورەکان دانراوی عبدالرحمن ملا طه عبدالعزیز.

٤٩- (هدایة الرحمان لالفاظ وآیات القرآن) محمد صالح البندق.

٥٠- (دلیل الحیران فی الکشف عن آیات القرآن) ترتیب الحاج صالح ناظم.

# ناوەڕۆك

## کۆتایی بەشی یەکەم